




# ڕازی دەروون

عەلی تەنتاوی

وەرگێڕانی: ئەیاد فەهمی

ALI TANTAWI

# Kteb Xana کتـێـبخانـــه

12,369 abone



**Açıklama**

کتێبخانەیەک تایبەت بە زیاتر فێربونو کاراکردنی عەقڵ و دور کەوتنەوە لە نەزانین و رەشبینی.📚

هۆشیاری ڕۆشنبیری تاک لە کۆمەڵگە.
پەرەپێدانی ڕۆشنبیری تاک.
گەشەپێدانی هزری تاک.

@haval_pashaie10

 ✔️ ئـەکاونـــتـــەکانـــم

https://linktr.ee/havalpashaie

t.me/kteb_khana

Davet Bağlantısı





ژمارەی بڵاوکراوە:

ناوی کتێب: ڕازی دەروون

نووسینی: عەلی تەنتاوی

وەرگێڕانی: ئەیاد فەهمی

دیزاینی بەرگ: ئیبراهیم ساڵح

دیزاینی ناوەوە: ئەیاد نادر

ساڵی چاپ: ٢٠٢٢

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لەبەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی ٣.٦٦ ی ساڵی ٢٠٢١ ی پێدراوە.

# پێشەکی

داوا لە خوێنەری ئەم کتێبە دەکەم هیچ بابەتێک لە بابەتەکانی ئەم کتێبە نەخوێنێتەوە هەتا تەماشای مێژووی نووسینەکەی دەکات؛ هەموو ئەوەی لەم کتێبەدا هەیە هیی ئەو (عەلی تەنتاویی) نییە کە ئەم پێشەکییە دەنووسێت، بەڵکوو هەموو بابەتێکی هیی ئەو((عەلی تەنتاوی))یەیە کە لەو مێژووەدا بوونی هەبووە.

کەواتە یەک نووسەر نییە، بەڵکوو کۆمەڵێک نووسەرە لە یەک کەسدا، هەموو مرۆڤێکیش بەم شێوەیەیە.

هەموو ئەو ((نووسەرانە...)) بۆچوون و هەست و سۆزی خۆی هەیە، هەست دەکەم -گەر بابەتەکانی ئەم کتێبە بخرێتە بەردەستم پێش چاپکردنی- نکوڵی دەکەم لە زۆربەی بۆچوون و سۆزەکانی ناوی و، ڕەتیاندەکەمەوە[1].

هیچ جێگای سەرسوڕمان نییە مرۆڤ لە یەک ساڵدا ئەم بۆچوونەی بگۆڕێت بە بۆچونێکی تر، ئەم هەست و سۆزەی بگۆڕێت بە هەست و سۆزێکی تر، چۆن بۆچوون و هەست و سۆزم ناگۆڕێت لە کاتێکدا سی و دووساڵە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بەبێ دابڕان بابەت دەنووسم؟

---

[1] بەڵام هەموو شتێکم وەک خۆی هێڵایەوە، هیچم لێی نەگۆڕی و هیچم چاک نەکرد.



لەگەڵ ئەوەشدا شتێکم هەیە کە هەرگیز نەمگۆڕیووە و ان شاءالله هەرگیزیش نایگۆڕم؛ ئەویش ئەوەیە بە بەردەوامی دژایەتی داگیرکاری و کەس و هاوکار و کۆیلەکانییم کردووە، عەرەبی و سروشتی و شکۆدارییەکانی و ڕەوانبێژییەکەیم باسکردووە، هەمیشە بە شکۆم کردووە، بەردەوام دەگەڵ ئیسلام و یاسا و ڕەوشت و ئاکارەکانییدا بوومە.

دە هەزار لاپەڕە لە قسەکانم چاپکراوە، ئەگەر پێیدابچمەوە -سوپاس بۆ خودا- یەک دێڕی تێدا نییە نزیکی بێت لە ستەمکاران، یەک دێڕی تێدا نییە بەکەم دانانی عەرەب بێت، یەک دێڕی تێدا نییە دەرچوون بێت لە ئیسلام. شتێکی تریش؛ هەرگیز لە حیزب و کۆمەڵ و دەستەکاندا نەبوومە، پێنووسەکەشم بۆ دەستە و کۆمەڵە و حیزبەکان نەبووە.

ئەو ڕۆژانەی فەڕەنسا حوکمی دەکردین لە ڕۆژنامەکاندا بابەتم دەنووسی، شتانێکم دەوت کە زۆربەی نیشتیمانییەکان بوێری وتنیان نەبوو. ئەمەش بانگەشە کردنێکی بێ بەڵگە نییە، بەڵکوو هەقیقەتە و بەڵگەکانی لە لاپەڕەکانی ئەو ڕۆژانەدایە، لە (( فتى العرب)) و((النصر)) و((المقتبس)) و(( القبس)) و(( ألف با)) و ((الأيام)) و ((اليوم)) و(( النصر)) و((الناقد)) و((الجزيرة)).

ئەو دەمە داوام دەکرد هەموو وڵاتە عەرەبییەکان یەکگرتووبن، لە ڕۆژێکدا لە دیمەشق دەوڵەتێک هەبوو، لە حەڵەب دەوڵەتێک هەبوو،

لە سوەیدا دەوڵەتێک هەبوو، لە لازقییە دەوڵەتێک هەبوو، هەموو دەوڵەتێک سنوور و حوکوومەت و سەرۆکی خۆی هەبوو!

* * *

لە دوای هەموو ئەمانەوە، ویستم ئەم پێشەکییە بکەمە ناساندنێک بۆ خۆم، لەسەر نەریتی نووسەرە کۆن و تازەکان لە ناساندنی خۆیاندا، بە تایبەت لە کاتێکدا بابەتی ئەم کتێبە ((من))ە، پاشان حەزمکرد ئەم بابەتە بکەمە کتێبێک و بەم نزیکانە دەست بکەم بە نووسینی بە ناوی ((یاداشتەکانی چارەکە سەدەیەک))، بۆ ئەوەی بواریی قسەکردن تیایدا فراوانتر بێت، بە چێژتر و بە سوودتر دەبێت. داوا لە خودا دەکەم سەرکەوتووم بکات بۆیی و بە توانام بکات بەسەریدا، بێبەشم نەکات لە پاداشتی و پاداشتی ئەو شتانەی کە دەینووسم و، بیکاتە زانستێکی بە سوود.

ئەوە تەنها یاداشتە دەمێنێتەوە، لە کاتێکدا سەرسامی و پارە دەڕۆن، ئەوەی لە خۆڵەوە هاتووە دەگەڕێتەوە بۆ خۆڵ.

یەک دوعا لە دوای مردنم، لەلایەن خوێنەرێکەوە کە لە دڵەوە بیکات، باشترە بۆم لە سەد وتار لە ستایشمدا و لە سەد ئاهەنگ لە یادکردنەوەمدا، لەبەر ئەوەی تەنها ئەو دوعایە بۆ منە، وتار و ئاهەنگەکان بۆ نووسەر و ئامادەکارەکانیەتی و، هیچ شتێکی بۆ مردووەکە تێدا نییە.



داوای لێخۆشبوون لە خودا دەکەم و هەر بۆلای ئەو دەگەڕێمەوە.

**عەلی تەنتاوی**

**دیمەشق: ٢١ی جەمادی ئاخەر، ١٣٧٩کۆچی**

**٢٢ی کانونی یەکەم، ١٩٥٩زایینی**

2022



# من

له ساڵی ۱۹۳۷دا بڵاوکراوەتەوە

(۱)

..... خێزانم پێی وتم: بە ڕووتی و بەبێ ددان هاتویتەتە ئەم دونیایەوە، نەتدەزانی هیچ بڵێیت و هیچت نەدەزانی. پێکەنیم و بەڕاستم نەزانی، بۆیان دووبارەکردمەوە، وەک ئەوەی شتێکی بەدیهی و ڕوون بێت و هیچ گومانێک هەڵنەگرێت، پێی سەیربوو کە من ڕەتیدەکەمەوە و بەڕاستی نازانم. بەڵام لەسەر بۆچوونی خۆم مامەوە، بە ڕەهایی نەمتوانی ئەوەی ئەوان دەیڵێن بەڕاستی بزانم، لەبەر ئەوەی لەوان باشتر خۆم دەناسم، چونکە هەموو ڕابردووی خۆمم لە یادە: بیرم دێت ڕۆژێک لە ناکاودا چاوم کردەوە و تەماشام کرد....خۆمم بینی، بینیم ددانم هەیە و پۆشاکم لە بەردایە و، توانای ڕۆشتن و قسەکردنم هەیە، کەسێکی سەربەخۆم لە دایک و باوکم و سەرجەم خێزانەکەم، حەزم لە شتانێکە کەسیان حەزیان پێی نییە ڕقم لە شتانێکە کەسیان ڕقیان لێی نییە.

دەچێتە عەقڵەوە پێش ئەوە بوونم هەبوبێت و، خۆمم نەناسیبێت؟

مەحاڵە!

لەو ڕۆژەوە لە بیرمدا چەسپا من لە دایکبووم و تەمەنم چوار ساڵان بووە!

**(٢)**

بەردەوام ئەو منداڵەم دەبینی؛ وێنەکەیم لە ئاوێنەدا دەبینی و گوێبیستی ناوەکەی دەبووم، بە دڵخۆشی و تامەزرۆییەوە گوێم لە قسەکانی دایکم دەگرت لە بارەی ئەوەوە، حەزێکی نامۆم بەرەو لای هەبوو، ئێستا دانبەوەدا دەنێم تەنانەت لە دایکم زیاتر خۆشمدەویست، ئەو دایکەی کەس هاوشانی نەبوو لەلام وهیچ گەنجینەیەکی زەویم قبوڵ نەدەکرد لەبری مژینی مەمکەکانی و خەوتن لە ئامێزیدا.

ئەو منداڵە ڕووبەخەندەیە، چاو ڕەش و قژ.. ئای داخی گرانم! ناتوانم ڕەنگی قژیم بیربکەوێتەوە. وێنەکەی لە بیرمدا سڕاوەتەوە، چارەکە سەدەیەکە لە دونیادا دیارنەماوە، چووە بۆ شوێنێک کە نازانم کوێیە. ئەرێ من ئەو منداڵەبووم؟ ئەو دەستە نەرمە بچکۆلانەی، ئەم دەستە زبرەی لێدەرچووە کە ئەم وتارەی پێدەنووسم؟ کەواتە چووە بۆ کوێ؟ من لە کوێوە هاتووم؟...من ئەو منداڵەنیم و جگە لە ئەویش نیم....ئەمە چۆن دەچێتە ئاوەزەوە؟

ئەمە بەردەوام دوودڵم دەکات و چارەی نازانم، بەڵکوو تەنها بیرکردنەوە لێی بەرەو شێت بوونم دەبات.

(٣)

ڕۆژێک لە ڕۆژان تەماشام کرد، لە جێی ئەو منداڵەی کە یاریی دەکرد، گاڵتەی بە هەموو شتێک دەکرد، دەگەیشت بە هەرشتێک دەیشکاند و، خەڵوزی دەگرتە دەستی وەک چۆن پرتەقاڵێکی دەگرتە دەستیەوە، یاری بە ڕیشی قازی دەکرد وەک چۆن یاری بە تووکی پشیلە دەکرد...لە جێگاکەی خوێندکارێک هەبوو بە زۆر دەیخوێند، بە ناچاریی دەینووسی و، خەمی قوتابخانەی لە کۆڵ نابوو، هەموو ڕۆژێک دەچوو بۆی وەک ئەوەی بەرەو مردنی ببەن، واتایەک نازانێت بۆ بوونی و، نازانێت بۆچی سۆزی دایکی و دڵخۆشی براکانی جێدەهێڵێت، بۆچی لە هاویندا سێبەری ماڵ و لە زستاندا گەرمییەکەی جێدەهێڵێت، بۆ ئەوەی بچێت بۆ ماڵێک کە منداڵە بێتاوانەکانی تێدا کۆدەکرێتەوە بۆ ئەوەی ئاوەزیان پڕبکرێت لە بابەتانێک کە. واتاکەی نازانن و شرۆڤەکردنێک کە کرۆکەکەی نازانن، مامۆستایەکی عەبووسیش بە دار بدات لە دەست و پشتیان، بتۆقن بە دەرکەوتنی، نە مامۆستاکان بۆیان پێدەکەنن و خۆشیان دەوێن، نە خێزانەکانیان گوێ لە سکاڵاکانییان

دەگرن و بە ویژدان دەبن لە گەڵیاندا.... لەو قوتابخانەدا وەک ئەو کەسە وابوو کە بە ستەم کراوەتەوە زیندانییەوە!

ئای لەم خوێندکارە بەدبەختە هێشتا چاوی بەڕووی دونیا نەکردبووە ناڕەحەتی و ئازاری بینی. لە داخ و خەفەتدا مرد و بەخێرایی بەرەو ڕێگای لەناوچوون ڕۆیی......داماوە!

(کەس نەبوو من نەبێت، من سەدجار مردم و لە دایکبوومەوە، هەتا ئێستا بووم بە....((مـن)).)

**(٤)**

ڕۆژێکی تربوو، فیلمەکە دیمەنێکی تازەی نیشاندا: خوێندکارە قۆزەکە دیارنەما، خاوەن شەرواڵی کورت و کراسی سوور و جانتا شینە بچووکەکە، بە جەستە و دەروون و حەز و ئاواتەکانییەوە ڕۆیشت، گەنجێکی ڕیش تاشراو دەرکەوت، خاوەنی بۆینباخێکی درێژ و جانتایەکی ڕەشی گەورەبوو....لە دواناوەندی وەک خوێندکارێک بە دیارکەوت وەک ئەوەی تێنتی کرابێتە دەمارەکانیەوە و سیلاحی شەستیر کرابێتە سەر دەمی، هەر لە قوتابخانەدا ڕووداوێک ڕوویبدایە یان لە شاردا کۆبوونەوەیەک بکرایە تێنتیەکە دەتەقییەوە و شەستیرەکە دەردەچوو، لە نێوان

خوێندکارەکاندا هەڵدەستا و وتاری کاریگەری دەدا، دەرگایان دەشکاند و دەچوونە دەرەوە.....

بەو هەڵچوون و شۆڕشەی تۆڵەی خوێندکارە هێمن و بە شەرمە ستەملێکراوەکانی دەکردەوە، لێ تاقیکردنەوە کەڵبەکانی بۆ تیژکردەوە و هات تۆڵەی لێبکاتەوە!

ئەمە بەکالۆریایە[٢]، خۆتی بۆ ئامادەبکە؛ داهاتووت پەیوەستە بە ئەمەوە.
پێشتر بیری لە داهاتوو نەکردبووە و حسابی بۆ نەکردبوو، کە گوێ بیستی بوو وەستا و دوودڵبوو، دواتر زاڵبوو بەسەر ئارەزووەکانی دەروونیدا. پێویستە گەرەنتی بە دەستهێنانی داهاتوو بکات، بۆ ئەوەی بگات بە ئاواتەکانی، ئەو ئاواتە گەورانەی کە دەروونی پڕکردووە و گومانی نییە لە گەشتن پێیان، ئەوە دەستی کردووە بە بڵاوکردنەوەی بابەتەکانی لە ڕۆژنامەی شارەکەییدا، پێویستە ببێتە نووسەرێکی گەورەی پڕ بەرهەم، بە پێنوسەکەی خزمەتی نیشتیمان بکات و، بەرگری لە هەق و باشییەکان بکات، و دژی نەیارەکانی بجەنگێت و، پشکی هەبێت لە ئازادکردنی نیشتیمانەکەیدا، لە چاکسازی گەلەکەیدا جێ دەستێکی هەبێت کە شایەنی باس

[٢] بڕوانامەی دواناوەندییە. وەرگێڕ

کردن بێت، دەی کەواتە با هەوڵ بدات بڕوانامە بەدەست بهێنێت، لەبەر ئەوەی بڕوانامە دەیگەیەنێت بە هەموو ئاواتەکانی و دوورترین مەبەستەکانی.

هەموو دونیا چاوەڕێی سەرکەوتنی ئەون لە ((بەکالۆریا))دا، ئەگەر سەرکەوتووبوو لە بە دەستهێنانیدا زەوی گەنجینەکانی خۆی بۆ دەکاتەوە و خەڵکی دەیخەنە سەر ملیان و بەرەو تەختی شکۆمەندی دەیبەن و، لەبەردەمییدا وەک خزمەتکاری پاشاکان دەبن.

هەموو ئەوانە خەونی لاوێتی بوو....ڕەحمەتی خودا لە سەردەمی لاوێتی!

(٥)

ئەم گەنجە هەموو خۆشییەکانی دونیای لە خۆی یاساخ کرد؛ نە گەشتی دەکرد نە دەحەوایەوە، نە خەوێکی قوڵی هەبوو، نە خواردنێکی بە چێژ، هیچ سەرقاڵیەکی نەبوو سەرقاڵی قوتابخانە نەبێت، لە وڕینەی ئەدیبەکانەوە دەچوو بۆ تەڵیسمی بیرکاری زانەکان، لە حسابی گیرفانەوە دەچوو بۆ چاوبەستی سروشتیەکان و یاوەرانی کیمیا، لە خوێندنی سوێری و ترشی و ڕووناکی و کارەباوە بۆ خورافیاتی گەردووناسەکان و جوگرافیای

ئاسمان....هەموو ئەم شتە پووچانە دەکاتە مێشکییەوە بۆ ئەوەی بیخاتە سەر کاغەزی تاقیکردنەوە، پاشان فڕێی دەداتە شوێنی خۆیی و بەسەر بەتاڵی لە قوتابخانە دێتە دەرەوە وەک چۆن سەرەتا هاتە ناوی!

دەترسا ئەو مامۆستایانەی کە تاڵەدرەخت و گوژاڵکی کردووە بە قوڕگیاندا بە ڕەخنەگرتن و موناقەشەکانی، لە تاقیکردنەوەدا بیخەن، تەواو هەوڵیدا، هیچ پەراوێزێک و وتەیەک نەما لە کتێبەکەدا ئیللا ئەزبەریکرد، پاشان چووە تاقیکردنەوە بە مێشکێکی پڕ لە دێڕ و نوسین، لە هێڵ و ژمارە، لە ئەفسانە و وەهمیات، دەرچوو بە گەورەترین دەرچوون!

ئەی لە تاقیکردنەوە هەر ئەوانە دەرناچن کە ئەزبەریانکردووە و تێنەگەشتوون؟

ئەی ئەم تاقیکردنەوانە تەنها بەڵگە نین بۆ هێزی یادگە و، بەهێزی ئەزبەرکردن و، فێربوونی پرۆگرامی خوێندن؟؟

* * *

دەرچوو، لە خۆشیان فڕی، خۆی ئامادەکرد بۆ جەنگ دەگەڵ ژیاندا، پێیان وت: لەسەرخۆبە! وتی: بۆچی؟ وتیان: پێویستە بڕوانامەی باڵا بەدەست بهێنیت؛ داهاتوو بەدەست نایەت بە بڕوانامەی باڵا نەبێت.

وتی: ماڵتان وێران بێت! ئەرێ داهاتوو لەسەر((کاغەز)) بونیاد دەنرێت؟



دەرچوو لەلایان و نەفرەتی لە داهاتووە دەکرد کە بێبەشی کرد لە یاریی منداڵی و چێژی لاویتی و ژیانی لێ تاڵ کرد و، لێی نەگەڕا لە ئێستایدا یەک ڕۆژ پشوو بدات. بەردەوام بەرەو پێشەوە پاڵی دەنا، وەک ئەسپێکی ڕەسەن غاریدەدا، لە غارغارێن ماندوو دەبێت و ناگات بە مەنزڵیش!

(٦)

گەنجەکە چوو یاسا بخوێنێت بۆ ئەوەی بڕوانامە بەدەستبهێنێت و داهاتووی هەبێت، سەرقاڵ بێت بە ئەدەبەوە بۆ ئەوەی وەڵامی حەزەکەی بداتەوە و چێژی لێوەربگرێت، کار لە ڕۆژنامەدا بکات بۆ ئەوەی بژێوی دابین بکات و خێزان بەخێوبکات....لەسەر ئەمە بەردەوام بوو هەتا ((لیسانس))ی بەدەستهێنا.

بە نزیکی لە ئەو، دووری لە خەڵک و پشت کردن لە ژیانی بەدەستهێنا، بە ئارەزووە ئەدەبیەکەی و سرووشتە تەنهاکەی و پشت کردنە دونیایی، دژایەتی کردنی ستەمکاران و گەورەکان و پارەی بەدەستهێنا!

(٧)

گەنجەکە بە مێشکێکی پڕ لە زانست و بنەما بەرزەکانەوە، بە دەستێکی قورس و پڕ لە بڕوانامەی سەرەتایی و دواناوەندی و

زانکۆوە، بە گیرفانێکی خاڵی و چۆڵەوە دابەزییە نێو گۆڕەپانی ژیان.

تەنها یەک گەڕ بەرگەی گرت و بە شکست خواردووی پشتی هەڵکرد!
لەبەر ئەوەی چەکەکەی لە ((جۆری کۆن))بوو، بۆ جەنگی ئەمڕۆی ژیان نەیدەخوارد!

قوتابخانە فێڵی لێیکرد و درۆی بۆ کرد؛ ژیانی لەسەر هەقیقەتی خۆیی بۆ وێنانەکردبوو.

قوتابخانە پێی وت:((زاست باشترە لە پارە؛ زانست دەتپارێزێت بەڵام تۆ پارە دەپارێزیت)). بەڵام بینی لە ژیاندا پارە باشترە لە زانست، زانست بەدەستنایەت بە پارە نەبێت، ئەگەر گەنجێک زیرەکترین و وریاترین کەس بێت، لێ مایەپووچ بێت و کرێی خوێندن و پارەی کتێب و پۆشاکی پێنەبێت، لە زانکۆ وەرناگیرێت و زانستی دەستناکەوێت. زاست بە پارە نەبێت دەست ناکەوێت، ئەگەر زاناترین کەسی سەر ئەم زەمینە مایەپووچ بێت، بیر لەوەدەکاتەوە نانی لە کوێ دەست بکەوێت و چۆن کرێی خانووەکەی بدات، ئاوەزێکی نامێنێت بیربکاتەوە و زیرەکیەکی نامێنێت بەرهەمی هەبێت. بینی

خاوەن پارەکان هەموو خۆشی و چێژ و پلەوپایەکیان بۆ حەڵاڵە، زانا هەژارەکانیش لە هەموو شتێک بێبەشن.

بەڵێ؛ قوتابخانەی درۆی لەگەڵدا کرد!

قوتابخانە پێی وت:(ڕەوشت بنچینەی سەرکەوتنە)، مامۆستاکەش نمونەی خوێندکارێکی بۆ هێنایەوە کە بێ ڕەوشت و بەدڕەفتارە و، نموونەیەکی بەرزی بۆ هێنایەوە خوێندکارێک کە نموونەی پاکی و ڕاوەستاوێتی و بێگەردییە. لێ بینی ئەوانەی یەکەم گەیشتن بە بەرزترین پلە وپۆست و ئەوانەی تریش لە خواری خوارەوە مانەوە...

زانی قوتابخانەی درۆی دەگەڵدا دەکات!

قوتابخانە پێی وت: (( هەق لەسەرووی هێزەوەیە. هێز بۆ هەقە و هەق بۆ هێز نییە)). بڕوای بەمە هێنا و بەڕاستی زانی و خۆی پڕچەک کرد بە چەکی هەق، لەناکاودا دزێک دەمانچەکەی خستە سەرسەری و داوای پارە و پۆشاکەکەی لێکرد، ئەمیش سیمینارێکی بۆدا سەبارەت بە هەق و هەموو ئەوانەی باسکرد کە لە مامۆستاکانییەوە فێری بووە و چی تریش هات بە بیردا پێی وت، دزەکەش بە پێکەنینێکی سامناکەوە وەڵامی دایەوە و، پارە و پۆشاکەکەی لێبرد و ئەمیش بەڕووتی گەڕایەوە؛ تەنها

بیرکردنەوەیەکی هیچی بۆ مایەوە، نە قەڵەوی دەکات نە تێری دەکات، نە لە سەرماش ڕزگاری دەکات!

سکاڵای بردە لای دادوەر، لەلای ئەو هەقێکی نەبینی زاڵ بێت بەسەر هێزدا، وەلێ هێزێکی لابوو هەقی دروست دەکرد؛ هێزی سەربازەکانی بینی. هەق لە کوێ دەمێنێت ئەگەر دزەکان زاڵبوون بەسەر سەربازەکاندا یان لەناویان بردن؟

ئەمە سوننەتی ژیانە. ژیان هیچ تاوانێکی نییە، ڕووتە و خۆی دانەپۆشیووە و کەسی نەخەڵەتاندووە بەخۆیەوە، بەڵکوو تاوانی نووسەران و مامۆستاکانە، ئەوانەی چاویان خستۆتە سەرکاغەزاکانیان و خۆیان زیندانی کردووە لە کتێبخانەکانیاندا، ویستویانە لە ژیان بکۆڵنەوە، وەلێ هیچی لێی تێنەگەیشتون.

(٨)

گەنجەکە دانیشت((خاوەنی لیسانس لە یاسادا)) بۆچوونەکانی لە دووتوێی کتێبێکدا نووسییەوە، کە تەواوبوو لێی، بردی بۆلای بڵاوکار و هەمووی پۆز و سەرسامیی بوو بە خۆی، بڵاوکاری نەزان پەڕە پەڕە هەڵیدەدایەوە، کە ناوی هاوڕێکەمانی بینی لچی لارکردەوە و برۆی گرژکرد، و پێی وت: خەڵکی ئێستا ئەم شتانەی

تۆ ناخوێننەوە، هەرکات لە((داهاتوودا)) بووی بە نووسەرێکی بە ناوبانگ نووسینەکانت بڵاودەکەینەوە.

بە دڵشکاوی و بێ ئومێدیەوە هاتە دەرەوە و، نەفرەتی لە داهاتوو دەکرد.



ئەم داهاتووە چییە؟ ئایا بستێک لێوەی نزیک بوومەتەوە لە کاتێکدا بیست و حەوت ساڵە بەدوایدا ڕادەکەم؟ کەی پێی دەگەم؟ لەکوێیە؟لە ساڵی دادێدایە؟لە دوای پێنج ساڵی ترە؟ ئایا هەر بە داهاتوو دەمێنێتەوە کە پێی بگەم یان دەبێتە ئێستاو دەبێت دوای داهاتوویەکی تر بکەوم؟....ئایا داهاتووم گۆڕ دەبێت؟ سووڕم خوارد بە ئاسۆکاندا و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوام کرد ماندووبووم و عارەقم کرد....نە گەڕامەوە ئیللا بە شەرمەزاری و ماندوویی و مایەپووچیەوە نەبێت. لە کوێ ئارامی و هێمنی بدۆزمەوە لە خەمی ژیان و بژێوی، هەتا تەنیاببمەوە بۆ ئەو شتەی بۆی ئافرێنراوم، لە وانە وتنەوە و خوێندنەوە و نووسین؟



گەنجەکە ڕۆیشت ((خاوەنی لیسانس لە یاسادا)) بە دوای ئاندا دەگەڕا، لە لای بڵاوکاری کتێب و بەڕێوەبەری ڕۆژنامە و نووسینگەی پارێزەر نەیدۆزییەوە، تەنها لە قوتابخانەی گوندەکاندا دۆزییەوە، بوو بە مامۆستای منداڵەکان و فێری ئەلیف با ی دەکردن، پاشان کەمێک پلەی بەرزکرایەوە و ژیاننامەی ئەدیبەکان و شیعری شاعیرانی دەوتەوە....بە شەو و بە ڕۆژ ماندوو دەبوو، بەرگەی ئازاری دووریی و ماندووی کاری دەگرت، دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بەرهەمێکی ئەدەبی نەبوو، سودێکی نە دەگەیاند و، یەک دیرهەمیشی بۆ نەدەمایەوە.

سەرقاڵە و کاردەکات لە پێناو داهاتوودا!

(٩)

ئەو منداڵە لەکوێ کە حەزی بە قوتابخانە نەبوو، ڕقی لە مامۆستای توندبوو، ئەم مامۆستا تووڕەیەی ئێستاش لە کوێ، کە منداڵەکان ماندوودەکات و بەدار لە سەر و لاکانیان دەدات؟ کێ دەتوانێت بەڕاستی بزانێت، ئەوە ئەمەیە؟ چ شتێکیان لە یەک دەچێت؟ لە جەستە و شێوە و سرووشت و ئارەزووەکانیاندا جیاوازن، هەرگیز یەک کەس نین!



ئەو منداڵە بە پەرۆشە لە کوێ، کە پێشڕەوی خوێندکارەکانی دەکرد بۆ خۆپیشاندان، لە مزگەوت و زانکۆ و بازاڕەکاندا وتاری دەدا، ئەم مامۆستا خاو و تەمەڵە لە کوێ کە وانەی ئەدەب بەم خوێندکارانە دەڵێتەوە، وەک پیرەمێردێکی هەشتا ساڵە لە ناویاندا بەدەردەکەوێت؟ ئەرێ یەک کەسن؟

ئەو خوێندکارە ئەگەر ئەم مامۆستایەی ببینیایە ڕقی لێدەبوو، دوودڵ نەدەبوو لەوەی بە زەبروزەنگ بێت دەگەڵیدا!

ئەو گەنجە پڕ هیوا و ئاواتە گەورانە لە کوێ، ئەم بێئومێدە لە کوێ کە هیوای بە هیچ شتێک نییە، چونکە تاقیکردەوە و نەگەیشت بە هیچ؟

(١٠)

لە دوای هەموو ئەمانەوە، بۆچی بیر لەمە دەکەمەوە؟

نازانم من کێم و چۆن پەیدابووم، نازانم چ پەیوەندییەکم بە ئەو منداڵەوە هەیە کە تەنانەت وێنەی دەموچاویشم لە یادکردووە، ئەو خوێندکارەی بە بیرکردنەوە نەبێت نایناسمەوە، ئەو خوێندکارەی خۆشمدەوێت و بیریدەکەم، ئەم مامۆستایەش کە شیوەنی بۆدەکەم و بەزەییم پێیدادێتەوە؟

من هەموو ئەوانەم؟ ئەی دواتر چی؟
ئای خودایە! هەستدەکەم بەڕاستی شێت بووم!

# من و ئەستێرەکان

لە ساڵی ١٩٣٧دا بڵاوکراوەتەوە

هیچ وشەیەک نییە قورستر و قێزەونتر بێت لە گوێی بیسەردا لە وشەی((من))زیاتر، هیچ قسەیەک نییە خەڵکی ڕقیان لێی بێت هێندەی قسەکردن لە بارەی خۆتەوە. ئەمشەو من باسی خۆم دەکەم و دەڵێم((من))، کردوومە بە ناونیشانی وتارەکەشم، لەبەرئەوەی بە تەنها خۆمم و کەس نییە قسەی لەبارەوە بکەم تەنها ((من)) نەبێت.

کاتێک باسی دەروونم دەکەم باسی هەموو دەروونێک دەکەم، کاتێک پەسنی هەست و خواستی خۆم دەکەم، پەسنی هەست و خواستی هەموو خەڵکیم کردوە؛ وەک ئەوکەسەی شیکاری جەستە دەکات، سنگی هەموو کەسێک لەت ناکات هەتا بزانێت شوێنی دڵ لە کوێدایە و وەسفی چۆنە، بەڵکوو سنگێک بۆ دووسنگ لەت دەکات، پاشان یاسا و بنەمای لەسەر دادەنێت و هیچ مرۆڤێک لەم بنەمایانە ڕیزپەڕنابێت....سوننەتی خودایە لە بەدیهێنراوەکانیدا و یاسا تەواوەکەیەتی، سیستەمە سەرسوڕهێنەرەکەی کە مرۆڤەکانی جیاواز کردووە و لێکیش دەچن، لێک دەچن و جیاوازیشن، لە

هەقیقەتدا لەسەر یەک شێواز بەدیهێناون و جۆراوجۆری کردوون لە جوانیدا، هەموو چاوەکانی وەک یەک بەدیهێناوە، هەموو چاوەکان لە پێکهاتە و جۆر و درووستبووندا وەک یەکن، لێ لە جوانی و شێوە و ناوەڕۆکدا هیچ چاوێک لە چاوێکی تر ناچێت.

ئەمە کاربەجێی ئەو پەروەردگارایە کە شارەزایە بە هەموو شتێک، ئەمە ئافرێنراوی پەروەردگاری بە توانایە.



ئێستا لەسەر یەکێک لە خانوەکانی زوبێرم[٣] لەم شەوە هێمن و پڕ ئەستێرەدا، لەبەر دەمیشمدا بیبانێکە کە درێژ دەبێتەوە بۆ عومان و یەمەن و نەجد و حیجاز، لە پشتیشمەوە دەگات بە زەوی فارس، کە نزیکە لێمەوە، لە شوێنی خۆم دانیشتووم و گڕی نەوتەکەی عیبادان دەبینم...لەم بیابانە سەربڵند و پیرۆزەدا ڕاماوم، کە لەسەر لمەکەی

[٣] زوبێر: شارۆچکەیەکی بچووکە، دەکەوێتە ڕۆژئاوای بەسرەوە، حەوت میل لێوەی دوورە، گۆڕی پاڵەوانی ئیسلام زوبێری کوڕی عەوامی لێیە یەکێک لەو دە کەسەی مژدەی بەهەشتیان پێدراوە، لە نزیکیەوە چەندین شوێنەواری نەخشێنراوی لێیە، وەک باوە شوێنەواری مزگەوتی بەسرەیە. دانیشتوانەکەی دوانزە هەزار کەسە، هەمویان موسڵمانی سوننین مەیلیان بەلای سەلەفیەتدایە و زانستیان خۆشدەوێت، کۆمەڵێ مزگەوتی تێدایە کە نوێژی هەینی تێدا دەکرێت، قوتابخانەی ئەمیرییەی تێدایە، قوتابخانەی ئەهلیەی ئیسلامی تێدایە شێخ شەنقیتی بونیادی ناوە. بۆچوونی پەسەند ئەوەیە بەسرەی کۆنە، خودا خۆی زاناترە.



ناوەزەترین دێڕەکانی شکۆمەندی و جوانترین پەڕەکانی مێژوو نووسراونەتەوە، لەسەر لمەکەی گەورەیی شارستانی گەشەی کردووە، کە مرۆڤایەتی پاڵی پێوەداوە و چۆتە ژێرسایەیەوە لە ڕۆژێکدا هیچ سێبەرێک نەبوو سێبەری ئەو نەبێت. بیردەکەمەوە و بیرکردنەوەکەم درێژە دەکێشێت و، ڕامدەکێشێت بەرەو بیرکردنەوە لە ئاسۆ فراوانەکان و ئەم دونیا مەزنە، لە دەروونمدا چەندین چرا شەوق دەداتەوە، لەسەرمدا سەدەها بیرۆکەی گەورەی نوێ هەیە، دەروونم سەدەها وێنەی ناوازەی تێدایە، لێ هەرئەوەنەی بمەوێت یەکێکیان بگرم و کۆتی بکەم بە وشە و زنجیری بکەم بە وتە، لە دەستم دەچێت و دەڕوات بە ڕێگای خۆیدا، دەچێت بۆ قوڵایی مێشکی ناوەکیم، نە من چێژم لێی وەرگرت وەک چێژ وەرگرتنی خەڵکی لە بیرکردنەوەکانییان، نە تۆمارم کرد و دەستەریڤانەیەکی ئەدەبیم لێدرووستکرد. ئەگەر من بمتوانیایە دە یەکی ئەو شتانە بنووسم کە تەسووری دەکەم ئەوا شتێکی زۆر گەورە دەبووم، لێ من ناتوانم.....لە نووسینەکانمدا تەنها هەرچی و پەرچی بیرکردنەوەکانم دەنووسم!

بیرکردنەوەکان لە دەروونمدا دەڕوێت و گەشەدەکات و بەر دەگرێت، پاشان لاواز دەبێت و وشک دەبێت، پوش و پەڵاشەکەی هەڵدەگرم و دەیکەمە وتارەکانمەوە! کارێز لە دەروونمدا دەتەقێت و قوڵپ دەدات و دەڕوات، پاشان وشک دەبێت و دەبڕێت، قوڕەکەی هەڵدەگرم و

دەیکەمە وتارەکانمەوە! بەیانی لە دەروونمدا هەڵدێت و بەهێز دەبێت و زیاد دەکات، دەبێتە چێشتەنگاو و نیوەڕۆ، پاشان دەبێت بە شەو، بەشێک لە تاریکی شەو دێنم بۆ ئەوەی وتارێکی لەسەر بنووسم بە ناونیشانی: ((ڕووناکی بەیانی))

هەر لەبەر ئەمەشە حەزناکەم سەیری ئەو شتانە بکەم کە نوسیوومن و شەرم دەکەم بگەڕێمەوە سەری، هەموو ئەو نووسینە تازانەم خۆشدەوێت کە بڵاونەکراونەتەوە، وای دەبینم ئەوکەسەی ستایشم دەکات بەهۆی نووسینەکانمەوە سوکایەتیم پێدەکات لەبەرئەوەی ئەو نازانێت ئەوە دیرهەمێکە لە گەنجینەی دەروونم کە پڕە لە ئاڵتون، پێم دەڵێت: ئەم دیرهەمە زۆرە بۆ تۆ چونکە هەژاریت. بەڵام ئەوەی ڕەخنە لە نووسینەکانم دەگرێت و بە کەمی دەزانێت، پێم دەڵێت: تۆ دەوڵەمەندیت و یەک دیرهەم کەمە بۆتۆ، ئەم نووسینە کەم و سووکە، چونکە تۆ گەورەیت.

بەم نزیکانە ئەم شتەم زانی وام لێهات حەز لە ڕەخنەگرتن بکەم، لێ پێشتر نەمدەزانی و حەزم لە ستایش کردن بوو.

* * *

مامەوە و ئەم بیرۆکانەم لە مێشکمدا تاوتوێ دەکرد هەتا ماندووبووم و بێزاربووم، هەموویم فڕێدایە بیابانەوە و دانیشتم تەنها بیرم لە بیابان دەکردەوە.

تەماشایم کرد ڕاخراوە لەسەر دوورگەیەکی فراوان، خەوتوە، وەک ڕێز و بە گەورەیی دانان پڕی کردۆتەوە. پاشان بیرم لەوە کردەوە ئەگەر بیابان چاوەکانی بکاتەوە، دەمبینێت و هەست بەبوونم دەکات؟ ئەی من هەست بەو وردە خۆڵە دەکەم کە با هێناویەتی، و دەدات بە دەموچاومدا و پاشان بە ڕێی خۆیدا دەڕوات؟ من لە بیاباندا تەنها تۆزێکم و، ژیانم تەنها ساتێکە لە ژیانی، ئەگەر باوێشک بدات یان لوتی بخورێنێت سەدەیەک تێدەپەڕێت هێشتا لە باوێشک و لوت خورانەکەی نەبۆتەوە......ئای بیابان چەندێ مەزنە و چەندێ بە تەمەنە!

- بەڵکوو بیابان چەندێ بچووکە و چەندێ تەمەنی کورتە! ئەی بیابان چییە؟ بەڵکوو هەموو زەویی چییە؟ و ئەم ملیار سەدەیە چییە ژیاوە؟ هەمووی ڕۆژێکە لە ژیانی من، دڵۆپێکە لە ڕووبارم. ڕۆژێک خەوتم، کە هەستام خاڵێکی بچووکم بەدی کرد، وتم: ئەمە چییە؟وتیان: بەدیهێنراوێکی بچووکە پێی دەڵێن((خۆر))...سەرم سوڕما لە بچووکێکەیدا، پاشان گرنگیم پێنەدا، زەوییەکەت چییە ئەی... ئەی...ئەی ...نەبوو!((عەدەم))

ئەمە ئەستێرەیەکی نزیکم پێی وتم، کە بە پێکەنینەوە تەماشای دەکردم، ئەو شتانەم بیرکەوتەوە کە گەردووناسەکان لە بارەی ئەستێرە و گەورەییانەوە باسیان کردبوو، بێدەنگ بووم و هیچم نەوت. ئەستێرەیەکی ترم بینی لەو دوورەوە تەماشای دەکرد و دابووی لە قاقای پێکەنین و هاواری دەکرد بەسەر ئەستێرەی یەکەمدا: بێدەنگ بە، بێدەنگ بە مێرووڵە بچکۆلەکە، تۆ کێییت؟ هەزارەهای وەک تۆ شیوێک لە شیوەکانم پڕ ناکەن، هەزارەهای وەک تۆ دەکەمە نێوان دووپەنجە لە پەنجەکانمەوە!

لە پشتییەوە ئەستێرەیەکی تر هەبوو هیچی نەدەوت، چونکە هەر نەیزانی بوو ئەمانە بوونیان هەیە....بەهۆی دووری و بچووکیانەوە نەیانی دەبینی. لە پشت ئەمیشەوە شەش سەد ملیۆن ئەستێرەی تر بوونیان هەبوو هەر دانەیەک لە دانەکەی پێش خۆی گەورەتربوو، وەک مێشولە وابوو لە چاویی فیلدا.

بە پەشۆکاویی و سەرسوڕماویەوە تەماشای ئەم ئەستێرانەم دەکرد، بیرکردنەوەکانم وەستاند و هەستم بە ونبوونی خۆم دەکرد، هەتا هەستم بە عەدەم کرد.

پاشان ئەم ئەستێرانە لەبەرچاوم بچووک بوونەوە، کە شتێکی گەورەترم بینی لە ئەو، بچووکبوویەوە کە ئاسمانم بینی ((سەقفێکی بەرزبوو)) هەتا هەموو بووبە((چراخان و ئاسمانی دونیای ڕازانبووەوە))، ئاسمان هەموویانی لە خۆگرتبوو، لە پشت ئەمەوە



بەهەشتێکم بینی پانتاییەکەی بە ئەندازەی ئاسمان و زەمین بوو، عەرش و کورسی و بوونەوەرە گەورەکانم بینی، هەستم کرد ئاوەزم دەرووخێت و تێکدەشکێت لەو کاتەی دەیەوێت بیری لێبکاتەوە و لە کاتێکدا ئەمانە بەدیهێنراویشن، چۆن دەتوانێت بیر لە بەدیهێنەرەکەی بکاتەوە؟

چووم بەراوردی نێوان ئەم گەورەییە مەترسیدارەم کرد، کە ئاوەز لە وێناکردنی نزیک نابێتەوە، لەگەڵ ئەو وردییە مەترسیدارە: وردیی ئەو بەکتریایانەی هەزارەهایان لە کونی دەرزیەکەوە تێدەپەڕێت، وردیی ئەلکترۆنی کە لەیەک گەردیلەدا سەدەها ئەستێرەی بچووک بوونیان هەیە، هەندێکیان بە دەووری هەندێکیاندا دەسوڕێنەوە وەک چۆن ئەستێرەکانی کۆمەڵەی خۆر سووڕدەخۆن.... ئەمەم بەراورد بەوەکرد دەستەوسان بووم و نکوڵی نەفسی خۆمم کرد و، پڕبووم لە باوەڕبوونم بە ئافرێنەری هەرە مەزن، لە ناخی دڵمەوە هاوارم کرد: لاإله إلا الله.

* * *

نەفسی خۆم ون کرد، نەمدەبینی. دەست و قاچمم لە بیرکرد، هەتا بە بەشێک لە کورسیەکە هەژمارم کرد یان ئەو جێگایەی لێی دانیشت بووم، هەموو حەز و ئارەزووەکانیم فڕێدا، هەتا هیچ بۆ((من)) نەمایەوە و من بووم بە هەموو گەردوون، ئەو گەردوونەی لە تەکمدا وتەکەمەی دەووتەوە: ((لاإله إلا الله))، لەم کاتەدا نەفسمم ون کرد هەستێکم هەبوو کە وەسف ناکرێت:

لایعرف العشق إلا من یکابِدُه ولا الصّبابةَ إلاّ من یعانیها

وردە وردە لەو شتانە تێدەگەشتم کە لە وتەی ئەهلی تەسەوف خوێندبوومەوە، فێربووم مرۆڤ هەست بە گەورەیی خودا ناکات هەتا نەفس و گەورەییەکی لە بیرنەکات. ئا لێرەدا ئەم بەکتریا بچووکە کە لمێکە لە بیاباندا و عەدەمە لە بوونی ئەستێرەکاندا، تەمەنی ئەم تەنها ساتێکە لە تەمەنی ئاسماندا......دەبێتە گەورەتر لە ئەستێرەکان و نەمرتر لە ئاسمانەکان، لەبەر ئەوەی خودای ناسییوە و هەستی بە شیرینی ئیمان کردووە.

لە دوای هەموو ئەمانەوە هەستام نوێژبکەم، کە وتم: ((الله أكبر))، هەموو گەردوون لە وجودمدا توایەوە، تەنها منی بڕواداری لاواز و، پەروەردگاری گەورە و خاوەن دەسەڵاتماینەوە.

لەم دونیایەدا هیچ شتێک نییە گەورەتر و جوانتر بێت لە نوێژ!

# وەڵامی پەیامێک

لە ساڵی ١٩٥٩دا بڵاوکراوەتەوە

هەموو هەفتەیەک لە ڕێی پۆستەوە نزیکەی سی پەیامم پێدەگات، ئەو کەسانە دەینێرن کە لە ڕادیۆ گوێبیستم دەبن یان لە ڕۆژنامەکاندا خوێنەری بابەتەکانمن، لێ هیچیان وەک ئەو پەیامە نەبوو کە دوێنێ پێم گەیشت، پەیامێکبوو لە یەکێک لە دایکەکانەوە، لە ڕۆژی دایکدا ناردبووی، زمان پاراویی تێدا نییە بەڵام لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە ئایەتێکە لە ئایەتەکان، ئایا ڕەوانبێژیش هەر ئەوە نییە بتگەیەنێت بە ئامانج و مەبەستەکەت؟

ئەم دایکە دەڵێت گوێی لێبووە جەژنی دایک هەیە، لێ نەیبینیووە و، بەدبەختی دایکی بینیووە بەهۆی منداڵەوە، لێ باشی منداڵی بۆ دایک نەبینیووە، سکاڵای ئەوە ناکات کە منداڵەکانی بۆی خراپن، منداڵن و هێشتا نەگەشتونە ئاستی ئەوەی ئازاری بدەن، وەلێ سکاڵای دەست کورتی و لە دەستدانی یارمەتیدەرەکەی دەکات، تاوێک ئارام دەگرێت و تاوێک ئارامییەکەی نامێنێت، لێم دەپرسێت: ئایا منداڵەکانم لە قوتابخانە دەربکەم و بچن کاسپییەک

بکەن هەتا چەن دینارێک پەیدا بکەن و بژێوییان دابین بکات؟ دەپرسێت چیان لێدەردەچێت ئەگەر بخوێنن لە کاتێکدا پارەی خوێندن و پۆشاکی قوتابخانەم نییە؟ چۆن دەتوانن بە پۆشاکی کۆن و گیرفانی خاڵییەوە قوتابخانە تەواوبکەن و دەربچن؟

هەرگیز ئاواتە خوازنەبووم دەوڵەندبیم ئەمڕۆ نەبێت، بۆ ئەوەی بمتوانیایە دڵنەوایی بکەم بە دەست و پارە، نەک بە پێنووس و زوبان، بەڵام من نووسەرم، نووسەریش تەنها خاوەنی دڵ و زوبانیەتی. ئەمە دوو وتەیە لە دڵەوەیە: یەکیان بۆ تۆ، ئەوی تریش بۆ خوێنەران.

ئەو وتەیەی بۆ تۆیە، وادەزانم بۆ خەڵکی نامۆ بێت چونکە نووسەرەکان ڕانەهاتوون لە هاوشێوەی ئەمانە بڵێن، چونکە بوێری ئەوەیان نییە وێنەی ڕاستی خۆیان پێشانی خەڵکی بدەن و چۆنن ئاوا بیان بینن، بەڵکوو وێنەیەکی ڕازاوەی دەرهێنراوییان نیشان دەدەن، بە کامێرا و هونەرەکەیان گۆڕیوویانە. لەوەیە قەشەنگترین و جوانترین بێت بەڵام ئەوە وێنەی ئەوان نییە، ئەوان دڵیان پێشان خوێنەرەکانییان نادەن بەڵکوو ئاوەزییان پێشان دەدەن، هەرچەندە ئەوەی ئەمڕۆ دەیڵێم یەکێکە لە ڕێبازە پەیڕەوکراوەکان لەلای نووسەرە ئەورووپییەکان، نەک داهێنراوێکی وازلێهێنراو.

چیرۆکێکە بەڵام خەیاڵی نووسەرێک داینەهێناوە و پێنووسی ئەدیبێک نەینووسیوەتەوە، بەڵکوو بەشەکانی ژیان نوسوویەتیەوە، منیش هاتووم وەک خۆی بۆتان بگێڕمەوە. دەیگێڕمەوە بۆ ئەوەی بزانیت و هەموو دایکێکی بێئومێد و هەموو منداڵێک کە بە هەژاری گەشەی کردووە بزانێت، سەربەرزی و سەرکەوتن وابەستەیە بە دووشتەوە: یەکەم بە سازاندی خوداوە، خودا هەمووکەسێکی دڵسۆز دەسازێنێت و سەرکەوتووی دەکات، دووەمیش بە زانست و هەوڵدان.

ئێستاش گوێبیستی چیرۆکەکە ببە:

پێش چل ساڵ لە دیمەشق زانایەکەی پایەبەرز و بەڕێز هەبوو، بەخشندە و زەنگین بوو، دەرگای ماڵەکەی کراوەبوو بەڕووی خزم و میوان و فێرخوازاندا، سفرەی ڕاخراووبوو، ئەو دەمەی لە جەنگی جیهانی یەکەمدا خەڵکی توشی ناڕەحەتی و برسییەتی بوونەوە خودای گەورە فراوانی پێبەخشی و ناڕەحەتی نەبینی، لە نێو خەڵکیدا خاوەنی پلە و پایەیەکی بەرزبوو.

منداڵەکانی لەم ماڵەدا گەشەیان کرد و، واتای ناڕەحەتی پێویستی و سەختی برسێتیان نەدەزانی. لێ ڕۆژێک (لە ڕۆژەکانی ساڵی ١٩٢٥)، کە ئەو دەمە کوڕە گەورەکەیان تەمەنی شانزە ساڵان بوو،

براکانی تەمەنیان لە نێوان دەساڵ بۆ یەک مانگ دەبوو، باوکیان کۆچی دوایی کرد.

پەردەکە هەڵگیرا، ئەوەی لێی بە جێمابوو قەرزی خەڵکی بوو، هەموو شتەکانی ناوماڵیان فرۆشت بۆ ئەوەی قەرزەکانی بدەنەوە، پاشان ئەو ماڵە فراوانەیان لە ساڵحییە جێهێشت و لە ژێرفیشەک باراندا (کاتی شۆڕش بوو)بە دوای خانوویەکی کرێدا دەگەڕان. خانوویەکییان دەست کەوت...مەبەستم کوخێکە، گەوری ئاژەڵان و گەنجینەی کا بوو! لە گەڕەکی دیمەجییە. ناویت بیستووە؟ لە کۆتایی عوقیبەدایە، نزیک ئەو شوێنەی لەبەر خواری و تەسکییەکەی پێی دەڵێن(ئەو گەڕەکەی مەیمون بەچکەکەی لێ ونبوو). بەڕاستم بزانە ئەمە ناوەکەیەتی!

لە دوو ژووردا لە خشت و خۆڵ، لەبەردەم ماڵێکی بەرزی یەکێک لە دەوڵەمەندەکانی گەڕەکەکە کە خۆر و ڕووناکی لەم دووژوورە بڕیبوو، ئاوی تێدانەبوو، تەنها ئاوێکی ڕۆشتووی پیس نەبێت، کە پانیەکەی دووبست و قوڵییەکەی دوو پەنجەدەبوو، لە توراوە بە ساڵحیەدا دەهات بۆ ئەم گەڕەکە بەبێ ئەوەی سەری داپۆشرابێت، لەم ڕێگا دووردرێژەدا هەموو شتێکی باشیان فڕێدەدایە ناویی! ڕووناکی تێدانەبوو، ڕووناکی لۆکس نەبێت، جارێک ڕووناک دەبوو، چەندین جار دووکەڵی دەکرد....بنمیچەکەی لە داربوو،



پاشان لەسەرییەوە خۆڵبوو، ئەگەر پشیلەیەک بەسەریدا بڕۆشتایە دەلەرییەوە و تێک دەچوو، ئەگەر تکێ باران بباریایە دلۆپەی دەکرد و ئاو دەهاتە خواراوە.

چوار فەرش ڕاخرابوو، هیچ شتێکی لە ژێردا نەبوو، بەڕە و پێستە ڕاخرابوو بەسەریدا، ئەم منداڵانە لەسەری دەخەوتن کە لە نیعمەتدا گەورەبووبوون و بە بەنازی گۆشکرابوون، دایکیان-وەک تۆ- بێدار دەبوو بە دیارییانەوە و بەرگەی شتانێکی دەگرت کە دایکەکان بەرگەی ناگرن، دەیپارستن لە مێرووەکان و ئەو مێشولانەی کە ژوورەکەیان پڕکردبوو، لەگەڵ ئەو ئاوەی لە بنمیچەکەوە دەهاتە خوارەوە. بە درێژایی شەوەکە بێداردەبوو، بە ئەسرینی چاوەکانی گڕی دڵی خامۆش دەکرد، بیری ئەوەی دەکردەوە لە کوێدابوو هاتە کوێ و، ئەو خزمە دەوڵەمەندانەی کە لە ماڵی باوکیان دەرنەدەچوون، چۆن پشتیان کردە منداڵەکان و فەرامۆشییان کردن، هەتا ڕۆژێک هاتن جەژنە پیرۆزەیان لە ماڵە دەوڵەمەندەکە کرد، سوێند بە خودا نەیاندا لە دەرگای ئەمان؟ کەس چاودێری نەکردن، کەس بە هانایانەوە نەهات، برایەکی نەبێت لە میصر[٤] هاوکاری کردن بە چەند جونیەیەکی میصری، هەر هێندەش لە توانابیدا هەبوو.

---

[٤] ئەویش ئوستاز موحیبودین خەتیبە، نووسەرێکی گەورە و ناسراوە.

تا لەم کەشەدا دایکە بەڕێزەکەم..... وادەزانیت ئەم کەشە چۆنبوو؟ منداڵەکە و براکانی ڕوویان کردە قوتابخانە. چواردەووری شار بە دەستی شۆڕشگێڕەکانبوو، فەڕەنسییەکان تەنها سەنتەری شارەکەیان بەدەستەوەمابوو. هەموو ڕۆژێک بە ڕێگای مەرگدا دەچوون بەرەو قوتابخانە، بە لای بەرەی جەنگدا دەڕۆیشتن کە لە بەردەم مزگەوتی تەوبەدا دانرابوو، خۆڕاگربوون و متمانەیان بە خودابوو. خودا یارمەتیدان و سازاندنی، هەتا بوون بە........ دەڵێیت ئێستا بوونە بە چی؟

منداڵی دووەم بوو بە دادوەر، ئەدیب و شاعیر و نووسەر، سێیەم بوو بە مامۆستایەکی گەورەی زانکۆ و یەکەم کەسبوو لە سووریادا دکتۆرا بهێنێت لە بیرکاریدا، چوارەمیش بوو بە مامۆستایەکی سەرکەوتوو و بانگخواز و ئەدیب[°]. سەبارەت بە کوڕە گەورەکەی هیچ شتێک ناڵێم لەسەری چونکە گەواهی دانم لەسەری ڕەتکراوەیە؛ ئەو هاوڕێیەمە کە هەرگیز لێی جیانابمەوە، شەو و ڕۆژ لەگەڵیدام و هەرکات تەماشای ئاوێنە دەکەم دەیبینم و، لەسەرووی هەموو ئەمانەوە هەڵگری ناوێکە وەک ناوەکەی خۆم!

ئەم چیرۆکەم تەنها بۆ ئەوە گێڕایەوە، بۆ ئەوەی ببێتە دڵنەواییەک بۆت و خەمەکانت کەم بکاتەوە، بۆ ئەوەی دڵنیابیت لەوەی کە دوو

---

[°]ناجی تەنتاوی و عەبدولغەنی تەنتاوی و محەممەد سەعید تەنتاویی.



منداڵەکەت کە خۆراک و پۆشاکیان دەسناکەوێت، لەوەیە داهاتوویەک چاوەڕوانیان بێت منداڵی دەوڵەمەندەکان ئیرەیی پێببەن.

بە منداڵەکانت بڵێ شەرمەزار نەبن ئەگەر پۆشاکی جوان و کتێبی نوێ و پارەی زۆرییان نەبوو؛ زۆربەی بلیمەتەکان منداڵی هەژارەکان بوون. نووسەری ئەم دێڕانە(ئەگەر لەو بلیمەتانەش نەبێت کە نموونەیان پێدەهێنرێتەوە) بە پۆشاکێکەوە دەچوو بۆ قوتابخانەی دواناوەندی کە دایکی لە جبەکەی باوکی بۆی درووست کردبوو، توانای نەبوو بڕوانامەی زانکۆ وەربگرێتەوە هەندێ لە چاکەکاران یارمەتیاندا....

سوێند بە خودا من دەزانم لە کەسە دیارەکانی ئەمڕۆی ئەم شارە، تێیاندایە لە خراپترین جۆری هەژاریدا گەشەیان کردووە، پاشان بە زانستەکەیان گەورەترین دەوڵەمەندی و بەرزترین پلەیان بەدەستهێناوە، گەر بمزانییایە ڕازین ناویان بهێنم ئێستا ناوی چوارییی هەموویانم دەوت، ناوەکانیان لەسەر زارمە. دادگایەک پێ دەزانم کوڕی کارگوزارەکەی بۆتە دادوەری و، کوڕی بەڕێوەبەرەکەی وەک کارگوزار وایە!

* * *

ئەو وتەیەی بۆ خوێنەرانە، ئەوانەی دوێنێ شەو- ئەو دەمەی هەورەگرمە و هەورە برووسکەبوو، باران باری- لە جێگای ئارام و

ژووری گەرمدابوون، نەیانزانی دۆخی هەژارەکان چۆنبووە لەو شەوەدا،

پێتان دەڵێم:

لەم شارەدا، لە گەڕەکەکەتاندا، لە نێوان هاوسێکانتاندا، نموونەی زۆر هەیە لەو دایکەی کە باسمان کرد. لەم شارەدا و بەو شەوە ساردەی زستان کەسانێک هەن لە ماڵەکانی خۆیاندا لە سەرمادا هەڵدەلەرزن، و ئاگر لە ماڵیاندا ناکرێتەوە، خوێندکارانێک هەن کە بە چاوانێک دەخوێننەوە شۆڕبۆتەوە لەتاو برسێتی و نەبوونی، بە دەستانێک دەنووسن سووربۆتەوە لە سەرمادا. ئا لەمانەدا کەسانێک هەن گەر خۆراک و پۆشاکیان بدرێتێ و هاوکاری بکرێن لە خوێندندا، دەبنە بەهرەدارێک کە نیشتیمان بە هاوشێوەی ئەمانە سەربەرزدەبێت و گەلانی پێ بەرزدەبێتەوە، لە بیرتان بێت لە شەلاحی نانەوا و بەردەستی پارێزەرەکاندا کەسانێک هەن بۆ ئەوە ئافرێنراون لە گەورە زانا و بلیمەتەکان بن، لێ هەژاری تواناکانی پەکخستوون و ڕێگای بلیمەت بوونی لێگرتوون، زیرەکی و بە تواناییەکەی تەنها تاوانکاری لێ درووست بووە.

زۆربەی تاوانبارەکانی ناو زیندانەکان، سەرەتا منداڵێکی زیرەکبوونە، بەڵام کۆمەڵگا پێی وتوون: قەدەغەیە لەسەرت بخوێنیت و خوێندن تەواو بکەیت، بۆ ئەوەی ببیت لە یەکێک لە ڕۆشنبیرەکان، کەواتە ببن بە تاوانبارە زیرەکەکان!



ئەوەی دەوڵەمەندەکان لە خۆشی و زیادەڕەویدا بەکاری دەبەن، بەسە بۆ فێرکردنی هەموو منداڵەکانی شارەکەمان و، تێرکردنی هەموو برسییەکان و، بە هانەوە چوونی هەموو هەژارێک. یەک شایی لە شایی دەوڵەمەندەکان خەرجییەکەی بەشی خواردنی دە ماڵە هەژار دەکات بۆ ماوەی یەک مانگی تەواو، ئەوەی لە مەڕاسیمی بە خاکسپاردن و لە چەپکە گوڵی خۆشییەکاندا خەرج دەکرێت، هەموو ساڵێک چارەخانەیەکی خۆڕایی بۆ هەژارەکان پێدەکرێتەوە، خەرجی کیسی شەکراو لە ئاهەنگەکاندا بەشی ئەوە دەکات هەموو ساڵێک قوتابخانەیەکی پێ بکرێتەوە کە پێنج سەد خوێندکار بگرێتە خۆی، ئەوەی لە کڕینی ئەم سوورەبیا گەورانە و ئەم پەیکەرانەدا خەرج دەکرێت، ئەوەی لە ئاهەنگ و شایی و بار و شتە لەناوبەراکەندا خەرج دەکرێت بەشی ئەوە دەکات پێداویستی هەموو کەسەکانی پێ پڕبکرێتەوە.

ناڵێم: واز لەهەموو ئەوان بهێنن؛ چونکە بە قسەم ناکەن، بەڵکوو بەشێک لە ماڵەکانتان دابنێن بۆ ئەو داماوانە...ماڵەکانتان پاکبکەنەوە و زەکاتەکەی بدەن چونکە ئێوە نازانن بۆتان دەمێنێت یان لەدەستتان دەچێت.

کێ گەرەنتی ئەوەی وەرگرتووە لە زەمانە، کە حاڵی ناگۆڕێت و، پارە لە دەستی ناڕوات؟ کێ مافی ئەوەی داوە بە منداڵی دەوڵەمەند

کە هەمیشە هەر گەورەبێت، چ داوابکات بیدرێتێ و چی ویست وەریبگرێت، لەسەر منداڵی هەژاریش نووسراوە هەمیشە هەژار و بەدبەخت بێت؟ کێ متمانەی هەیە کە بەیانی منداڵەکەی پێویستی بە منداڵە هەژارەکە نابێت، داوای لێناکات و تکای کۆمەکی لێناکات؟

ئەگەر متمانەت بە مانەوەی پارە و ماڵ هەیە، ئەی متمانەتان بە مانەوەی لەشساغی هەیە؟ ناترسن لە نەخۆشی و بەڵا و مەینەتی؟

بە بەخشین ڕەحمەتی خودا بەدەستبهێنن و، بە چاکەکردن بەڵا لە خۆتان دووربخەنەوە.

تەنها ڕووی دەمم لە ملیۆنەرەکان نییە، بەڵکوو لەگەڵ هەموو خوێنەرەکانمە. خەڵکی چەند ئاستێکن؛ تۆ دڵخۆش نابیت ئەگەر کەسێکی ملیۆنەر هەزار لیرەت پێ ببەخشێت؟ کەواتە دە لیرە ببەخشە بەوەی کە نەبووە. ئەو دە لیرەیە وەک هەزار لیرە وایە بۆی، هەزاریش لای ملیۆنەرەکە وەک دە لیرەکەی لای تۆ وایە.

ئەو پۆشاکە کۆنەی فڕێی دەدەیت وەک پۆشاکی جەژن وایە لای کەسانی تر، بۆچی پۆشتەیان ناکەیت بە شتێک کە نە زیانت پێدەگەیەنێت نە هەست بە لە دەستدانی دەکەیت؟



ئەگەر هەرکەسە و بیبەخشیایە بەوەی لە خۆی هەژارترە، لە دونیادا کەسی هەژار نەدەما. ئەی خوێنەرەکان، داواتان لێدەکەم بە خودا: مەهێڵن قسەکانم بە هەوایا بچێت، سوێند بە خودا تەنها چاکەی ئێوەم دەوێت. ئەی ئەو دایکەی بۆ منت نوسیبوو، متمانەت بە خودا هەبێت، بێگومان خودا کەس لە دەست نادات.





# له ئەسرینی دڵ

له ساڵی ١٩٣٨دا بڵاوکراوەتەوە

ئەو ڕۆژەت بیرت دێت هاوڕێ گیان[٦] کە بەلای گۆڕستانی دەحداحدا
تێپەڕین من و تۆ دوو منداڵی سێوی بوین دەڕۆیشتینەوە
بۆ ماڵەوە لە سەمانە، ماوەی دووکاتژمێر لەسەر گڵکۆی
باوکمان دانیشتین....پاشان بە خێرایی ڕۆیشتین
بۆ ئەوەی ئازارەکانمان لەسەر سنگی دایکمان فڕێ بدەین؟

بیرت دێت چیت پێ وتم سەبارەت بە خۆشویستنی دایکت و وابەستەبوونت پێوەی؟
بیرت دێت لەوەدا هاوڕابووین کە مەحاڵە ژیان بکەین لەدوای دایکمان،
و هەمیشە لەگەڵیاندا دەبین و پێکەوە دەبین؟

---

[٦] مەبەستی ئەنوەر عەتارە، دواتر لەچەند بابەتێکدا باسی دەکات. وەرگێر.



ئەوەی گومانمان وابوو مەحاڵە، ڕوویدا، دایکی هەردووکمان مرد و ئەو گۆڕە جەمیکردن کە پێشتر باوکمانی جەمکردبوو.

لە دوای ئەوانییش ژیایین

....هیچمان لەئەوان بۆ نەمایەوە ئیللا ئەسرینێک نەبێت

لە چاومانـــدا و داخێکـــی ســـوتێنەر لە دڵمانـــدا....بـــۆ هەمیشـــە ماڵئاواییان کرد!

(عەلی)

نازانم چ شتێک دەمگەڕێنێتەوە بۆ باسکردنی ڕابردوو، هەڵدانەوەی ئێسکە پرووکاوەکەی؟ چ شتێک دەمخەڵەتێنێت شوێنی خەونەکانم بکەمەوە لە واقعدا و، دەشزانم ڕابردوو بە خۆشی و ناخۆشیەکانییەوە گوزەشتووە و تەنها ئەم یاداشتانەم بۆ ماوەتەوە، ئەو یاداشتانەی چەندێ هەوڵدەدەم هەڵیبدەمەوە سوچێکی تاریکی دەروونم و بۆ هەمیشە بخەوێت، هەرکات بمویستایە لە یادی بکەم هەڵدەستا و ژیانی لەبەرچاو ڕەش دەکردم بەجۆرێک هیچ جوانی و ڕازاوەییەکم نەدەبینی......من دەزانم ئەو خەونانەی کە بونیادمنان بە پارچەی دڵ و ڕۆژەکانم، باخچەکەیم ئاودا بە ئەسرینی چاوەکانم، لە گەشەکردن وەستاوە و گوڵەکەی وشک بووە و، بە یەکجار لەبەرچاومدا ڕووخا وەک چۆن ماڵێک لە کاغەز دەڕوخێت کە یەکێک دەستی لێبدات.....لێی بێئومێد بووم و بە دڵێکی شکاو و جەرگێکی سووتاوەوە ژیانم بەڕێکرد، پێدەکەنم و سۆعبەت دەکەم

هەتا خەڵکی وابزانن بەختەوەرترین کەسم، لە کاتێکدا من بەدبەخترین و هیوابڕواترین و خەمبارترینیانم!
بۆچی ئەمشەو دەگەڕێمەوە بۆ ڕابردوو، ڕابردوویەک کە ڕۆژ و خەون و کەسەکانی مردووە؟

***

لە بەلەکۆنی هۆتێلەکەوە تەماشای شارع ڕەشیدم دەکرد لە بەغداد، کە وێنەی ژیان پیشان دەدات و شرۆڤەی دەکات و وێنای هەقیقەتەکەی دەکات زۆرتر لە وێناکردنی ئەدیبەکان و شرۆڤەی بیریارەکان، بەڵکوو کاتژمێرێک تەماشای شارع ڕەشید بکەیت باشتر و بەسوودترە بۆت- بۆ تێگەشتن لە ژیان-لە خوێندنەوەی دە ساڵ لەم کتێبانە.

چی لە کتێبدا هەیە جگە لە دوودڵی و سەرلێشواوی؟ چ کەسێک هێندە گەمژەیە هەتا بانگەشەی ئەوە بکات لە ڕێی کتێبەوە لە ژیان تێگەیشتووە؟ من یەکێکم لە قوربانیانی ئەو کتێبانە، پرسیارم لێبکەن سەبارەت بەبێ هیوابوونم و زیانەکانم؟
کتێب وتی: ڕێگای ڕاست کورترین ڕێگایە بیگرە بەر، ڕاستبە دەگەیت بە ئامانجەکەت.
لەسەر ڕێگای ڕاست ڕۆیشتم و خۆمدا بە یەکەمین دیوار کە پێی گەیشتم و سەرم شکا و لە شوێنی خۆمدا دانیشتم، غەیری من



بایدایەوە و پێچی لێدا وەک چۆن ڕێگاکانی ژیان بادەداتەوە و پێچاو پێچە، گەیشت بە ئامانجەکەی.

کتێب وتی:(کەسێکی باشبە و سووربە لەسەر ڕەوشت بەرزی ئەوە ڕێگایە). بینیم کەسە خراپەکان دەگەن، بینیم بەد ڕەوشترین کەس بۆتە مامۆستای ڕەوشت لە گەورەترین قوتابخانەدا، سەرم سوڕما لە گاڵتەجاڕی دونیا!

کتێب وتی: هەق و، ژیان وتی:هێز....کتێب وتی: باشەکان و، ژیان وتی: ئارەزووەکان. کتێب وتی......بەڵام هیچ نەبوو ئیللا ئەوەی ژیان نەبێت!

تەماشای شارع ڕەشیدم کرد ئۆتۆمبێلەکان لە هەموو جۆر و ڕەنگێک بوون و، عارەبەکان لە هەموو شێواز و جۆرێک بوون، دووچەرخە و گالیسکەکان، هەموویان هەوڵدەدەن بۆ ئەوەی یەکەم کەس بگەن، هەموویان هاواردەکەن و دەقیژێنن، بەڵام گەر گەیشت بە ئامانجەکەی دەبینێت نەگەیشتووە بە هیچ، دووبارە دێتەوە قەرەباڵخی دروست دەکات و ڕادەکات و هاوار دەکات!

وتم: ئەمەیە ژیان؛ پێشبڕکێ کردن و پاڵەپەستۆکردن، لێ ئامانجەکە چییە؟ هیچ شتێك!



چوومە ژوورەکەی خۆم و دەرگاکەم داخست، ویستم بە تەنیا ببمەوە بە تەنیابونەوەیەک ئارامی دەروون و هێمنی تێدا بدۆزمەوە، بەڵام دایان لە دەرگا و سەید حەیدەر جەوادی هات، ئەو پیاوەی گۆرانی بۆ دکتۆر زەکی موبارەک وت و ئەویش زۆر پێی خۆشبوو، تەنانەت هەرکات دەیبینی خۆی بۆ نەدەگیرا گوێی لە دەنگی نەبێت، ناچاری کردبوو لە نووسینگەی گشتیدا گۆرانی بلێت، پێی وتبوو: ئا لێرەدا گۆرانی بلێ، وەڵلاهی خەلکی باسی دەکەن و، دەلێن زەکی موبارەک گۆرانی وتنی لە نوسینگەکاندا داهێناوە....هاتبوو بۆلام و ئەبوزییەک[7] لە ئەبوزییەکانی عێراقی بۆ وتم، کە گومانم وایە هیچ مرۆڤێک یان پەرییەک گۆرانیەکی بینیبێت بەهێزتربێت و خێراتر بگات بە دڵ و جوانتر وێنەی ئازارەکان بکات لەمە. دڵۆپەی ئەسرینەکانە کراوە بە گۆرانی، ترپەی دڵەکانە کراوە بە سروود، ئەو... ئەو پوختەی هونەری عەبقەرییە کە خەمەکان بە شێوەیەکی بلیمەتانە وێنا دەکات.

دەروونی هەژاندم بە هەژاندێکی توند، هەموو پەڕەکانی کردەوە و، ڕابردووی گەیاند بە ئێستای و، ڕادەستی سەرسوڕمانێکی قوڵی کرد، چێژێکی زۆرخۆشبوو، بەڵام بە ئێش و بە ئازار. ((عیتابا))[8]م هاتەوە یاد، ئەو گۆرانیەی بەردەوام شیوەکانی لوبنان دەیلێتەوە و زایەڵەکەی بە قەدپاڵ و لێژییەکانییدا بلاودەبێتەوە، کەس نازانێت

---

[7] وەک هۆرە و حەیران و لاوکی لای خۆمانە.وەرگێڕ

[8]



کێ هەڵیبەستووە و ئاوازەکەی داناوە، عیتابای نەمر سەردەمی نوێ و سەردەمی کۆن بەشداری کردووە لە نوسینەوەیدا، هەموو جیلێک خولی خۆیانی بۆ زیاد دەکەن، وێنەیەکی ڕاستگۆیانە دەبێت لە هەست و بیر و ئاوات و یاداشتی میللەتەکە، ئەو عیتابایەی لە وتنەوەیدا چەمەکان دەژیەنەوە و بەسەر بەرزایی و بەردەڵانەکاندا دەڕۆن بۆ ئەوەی بگەن بە ناخی شیوەکە، لە ئاوازی (با) وە لە دۆڵە دوورەکان، لە چرپەی گەڵاکاندا لە جەنگەڵی سنەوبەری بەرز و بڵند، لە بۆنی هەموو گوڵێک و بێدەنگی هەموو بەردێک، و تیشکی خۆرەوە، عیتابا لە هەموو لوتکەیەکی لوبناندا دەژی.

* * *

ئەم ((ئەبوزییە)) گەڕاندمیەوە بۆ ڕۆژە کۆنەکانم، هەموو وێنەکانی ژیانم هاتە پێش چاو بەیەکەوە و بەدوای یەکدا وەک فیلمێکی سینەمایی، ئاوڕی دابوویەوە لە تەمومژی ڕابردوو، ئازارەکانیم دەبینی کە بە ئەسرین و جەخارە خوێناوییەکانی شۆرابووەوە، وەلێ خۆشی و شادیم نەبینی. ئایا دوای ئەوەی لە سیساڵی تێپەڕم کردووە خۆش و شادی دەبینم؟

بەردەوام بیرم لە داهاتوو دەکردەوە و چاوەڕێی بووم، ئەوەتا داهاتوو بوو بە ئێستا، جگە لە بێهیوایی و ئازار چی ترم تێدا دۆزیوەتەوە؟

پیشە و هونەرەکانم تاقی کردۆتەوە و شاران گەڕاووم، هیچ سوودێکم لەوانە نەبینیووە جگە لەوە نەبێت لە هەر شارێک گۆڕێکم لە گۆڕی ئاواتەکانم جێهێشتووە. خۆشەویستی و پارەم لە دەستدا، سەربەرزی ئەدەبیم لە دەستدا، تەنانەت ئەم ئاوازەی لە دەوونمدا سووردەخوات لە دەستمدا، نەمتوانی خەڵکی گوێیان لە گۆرانی و دەنگی بێت، خەڵکی تەنها گوێیان لە کورترین گۆرانیم و ناشرینترینی بووە، ئەمە وتارەکانمە کە بڵاوی دەکەمەوە، کەی گوێتان لە جوانترین ئاوازم و درێژترینیان دەبێت؟

لە داهاتوودا!

بەڵا بدات لە دەروونم! داهاتوو چی بۆ هێشتمەوە مردن نەبێت، کە ئێستا خۆشمدەوێت و بانگی دەکەم ئەگەر گوێ بیستی بانگ کردن ببێت؟!

* * *

بینیم داهاتوو هیچ نییە و عەدەمە، ئایا سەرکۆنە دەکرێم ئەگەر بگەڕێمەوە بۆ ڕابردوو و تێیدا بژیم؟

لە ڕابردوودا دایکم و باوکم و خەونەکانمم بە خاکسپارد. زۆرم خۆشویست و زیاتر لەوە ئازارم چەشت، بەڵام تاکە خۆشەویستی هەقیقی کە دڵمی داگیرکرد و تاکە ئازاری ڕاستی کە ناسی بێتم،

خۆشەویستی دایکم و ئازاری کۆچکردنەکەیتی، جگە لەمە خۆشەویستییەکی درۆ و ئازارێکی لابەلایە.
هەموو شارەکان لە بیردەکەم تەنانەت ماڵە خۆشەویستەکەشم و شوێنی خۆشگوزەرانیشم، بەڵام هەرگیز ئەو تەنگەبەرە لەبیرناکەم کە لە عوقەیبەوە درێژدەبێتەوە بۆ کۆڵانەکانی دەحداح، لەبەرئەوەی یەکەمین بەختەوەرییم لەو کۆڵانانەدا لەدایکبوو، لە کۆتاییەکانیدا مرد لەو دەمەی دایک و باوکم مردن.

پەروەردگارا ڕەحمم پێبکە بە لەبیرچوونەوە. لە بیرچوونەوەکەم لە کوێیە؟

ئێستا تەماشای دەکەم و نەخۆشە و لەسەرجێگایە، وەک ئەوەی کاتژمێرێکە ڕوویداوە، دڵم دەگری و ناتوانم یەک وشەی لەبارەوە بنووسم. حەزناکەم خەمەکانم بڵاوبکەمەوە هەتا زمانی خەڵکی نەیکولێنێتەوە، با لەدڵما بێت و هەرخۆم هەڵیبگرم.

ناتوانم بڕوابکەم حەوت ساڵ بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕیووە. حەوت ساڵە دەژیم بەبێ ئەوەی دایکم ببینم، خەمبار دەبووم گەر ڕۆژێک نەمبینیایە؟ دەژیم و ئەویش ڕۆشتووە دوای ساڵێک و دە ساڵیش ناگەڕێتەوە، هەتا پێش قیامەت ناگەڕێتەوە؟

پەروەردگارا ئارامیم پێ ببەخشە، سوێند بە خودا ناتوانم ئارام بم.
دەڵێن بەڵاکان بچووکن پاشان گەورە دەبن، بەڵام لە دەستدانی دایکم هەموو ڕۆژێک لە دەروونمدا گەشە دەکات.

هیچ شتێک نییە لەم ژیانەدا سەرنجم ڕابکێشێت و حەزم بۆی زیاد بکات. چی لە ژیاندا هەیە؟ هەموو خۆشییەکی لە پشتیەوە ئازارێک هەیە؛ بەهارێکی جوانی تێدایە، بەڵام تێیدا تۆوی هاوینی سوتێنەر و زستانێکی سارد هەیە، تێیدا لەشساغی و گەنجێتی هەیە، بەڵام نەخۆشی و پیری لەخۆگرتووە. دەوڵەمەندی تێدایە، لێ من نەمدیووە گومانم وایە هەرگیزیش نایبینم.

ڕقم لە ژیان بوو، ئەو خەڵکەش ڕقەکەیان زیادکردم؛ کەس تێی نەگەیاندم و کەسم تێنەگەیاند. ئەگەر خەمباربم و پشتیان تێ بکەم و سەرقاڵی خەمەکانم ببم، دەڵێن: خۆی بە گەورە دەزانێت. ئەگەر بۆ هەق تووڕەببم و ناکۆک بم تێیدا، دەڵێن: قسەی ناقۆڵا دەکات. ئەگەر پەسنی ئەو خۆشەویستییە بکەم کە هەستی پێدەکەم وەک چۆن ئەوان هەستی پێدەکەن، دەڵێن: خراپەکارە. ئەگەر باسی ئیسلام بکەم دەڵێن: وشکە. ئەگەر بە لۆژیکی ئاوەز قسەبکەم دەڵێن: زەندیقە. چ بکەم؟ پەروەردگارا سکاڵام بۆلای تۆیە، ئیتر دایکێکی ڕاستگۆم نییە لەم دونیایەدا!

ئەو کەسەی بە ئەنگیەکانمەوە قبوڵی دەکردم، خەڵکیش تەنها باشیەکانم وەردەگرن. ئەو منی خۆشدەویست و خەڵکیش خۆیان خۆشدەوێت لە مندا. ئەو تاکە خۆشەویستم بوو کە کۆچ ناکات و خیانەت ناکات. ئەو دونیام بوو، داخی گرانم؛ دونیاکەم خۆڵ جەمی کردووە!

هیچ شوێنەوارێکی ئەو جیهانە پڕ دڵسۆزیی و خۆشەویستییە نەماوە جگە لە گڵکۆیەک و جۆگەیە بچووک و شۆڕەبییەک، ئەمەش هەموو شتێکە.

باسی ئەو درەختەم پێخۆشە و بیری دەکەم، جوڵەی چڵەکانی لە دەروونمدا جیهانێکی تەواو دەجوڵێنێت بەڵام گوێ ناداتە یاداشتەکانی. ئەو ڕاوەستاوە و بەسۆزە بۆ دزێکی لەناوبەر وەک چۆن بەسۆزە بۆ خۆشەویستێکی جەرگ سووتاو، تاوانبارێکی هەڵهاتوو داڵدە دەدات وەک چۆن شاعیرێک داڵدەدات. چەندێ یادگاری خۆشەویستان لە دەستچووە لەلای سرووشت و چەندێ لە دەستچووە لەلای خەڵکی!

• • •

حەیدەر جەوادی بەجێی هێشتم و هاوڕێکانم خەوتن و جێیان هێشتم بە تەنیا ئازار بچێژم. کێ بەسۆز دەبێت بۆم و بەشدار دەبێت

لەگەڵمدا لە هەڵگرتنی ئازارەکانمدا؟ لە سرووشت و هاوڕێکانم بێ هیوابووم، ئەی چاکەکاری نادیار کە هەرگیز ناتناسم تۆ لەگەڵمدا چاک دەبیت؟ تۆ ئەی ئەو کەسەی لەگەڵ خۆرهەڵاتندا دەچیتە گۆڕستانی دەحداح و سەردانی خۆشەویستێک دەکەیت کە خۆڵ جەمی کردووە، ئایا منەت دەکەیت بەسەر ئەم غەریبەدا کە ئازار دەچێژێت، ئەم شوێنەی دەژێنیتەوە و بەسۆز دەبیت بەو یاداشتانەی تێیدایە، کە بە شکۆترە لەلای لە ژیان چونکە ئەوانە جوانی ژیانی بوون؟ ئایا لە ڕۆشتندا نەرم و نیان دەبیت و دەزانیت ئەم خۆڵەی کە پێی پیادەنێن کەلاوەی دڵێکە پێشتر ئاوەدان و سەلامەت بووە؟ نەرم و نیان بە چونکە ئەگەر هەستێکت هەبوایە و یاداشتەکانیت پێی بزانیایە لەم شوێنەدا- لە نێوان خۆڵ و لمەکەیدا- پاشماوەی دڵێکی شکاوت دەبینی، پاشماوەیەکی خوێناوی خەمباراویی، گوێت لە قوڵپەی گریانی دەبوو.

ئەم دڵە تێک نەشکاوە بەهۆی کۆچی خۆشەویستێک و ڕووداوەکانی خۆشەویستی نەیڕووخاندووە، بەڵکوو گەردەلولێک لێی داوە بە مردنی دایکی و پایەکانی ڕووخاندووە، دڵۆپێک ئەسرین بکە بەسەر پاشماوەکەیدا، کاتژمێرێک پێوەی دەژی، یان وشەیەک بڵێ ڕووحە خەمبارەکەی پێ بەختەوەر بێت. پاشان ڕووبکە گۆڕی خۆشەویستان، بۆ لای گڵکۆی دایک و باوکم ئەی هاوڕێی نادیار، دوعای ڕەحمەت و لێخۆشبوونیان بۆ بکە، لە دوای ئەوانەوە خۆشەویست و دونیام نەماوە.



ئەی چاکەکاری نادیار لە ژێر قاچتدا دڵ و خۆشەویستەکەمم جێهێڵاوە، نەرمونیان بە بۆیان. ئەم سێوییە لاوازە دڵخۆش بکە، گەرچی خەڵکی بە شێخ بانگی دەکەن.

پەروەردگارا، ڕەحمەتێک بۆ ئەم سێوییە لاوازە، سی ساڵانە!

(پەروەردگارا لێم خۆشبە و لە دایک وباوکم خۆشببە، پەروەردگارا میهرەبان ببە بۆیان وەک چۆن بە منداڵی میهرەبان بوون بۆم و گەورەیان کردم).

* * *



# لە شوێنی نووسیندا

لە ساڵی ١٩٥٩دا بەخشکراوە

ویستم ئەم وتانە تەرخان بکەم بۆ ڕۆژی منداڵان، ویستەکە ڕاستبوو، بەڵام مەبەستەکە نەهاتە دی. ویستم تێیدا باسی کێشەی منداڵان بکەم لەم ڕۆژەدا، باسی یادگارییەکانی دوێنێی منداڵی خۆم بوو، ویستم ببێتە پەند و ئامۆژگاری، چیرۆک و یاداشتەکان هاتن. هەندێ جار پێنووس لە دەستی نووسەر یاخی دەبێت وەک چۆن ئەسپ لە دەستی ئەسپ سوار یاخی دەبێت، بەو ئاڕاستەیەدا دەڕوات خۆی دەیەوێت نەک خاوەنەکەی.

منیش دانیشم ئەم قسانە بنووسم ئامادەکارییم بۆی نەکردبوو، لەبەر ئەوەی کاتم کەم مابوو بۆ کاتەکەی خۆم، نە بنچینەی بیرۆکەکانم دانابوو نە شێوازی قسەکردنەکە، پێنووسم گرتە دەستم و چاوەڕێ بووم بزانم چی بە ڕوومدا دەکرێتەوە، دەرگای قسەکردن بەڕوومدا نەکرایەوە، بەڵکوو دەرگای ژوورەکەم کرایەوە، مونمینی چکۆلە[9] هاتە ژوورەوە، کچەزامە، چاوی سووربووبۆوە، ئەسرین بە

[9] ئێستا دکتۆرە لە بیمارستانی مەلیک فەهد لە جەددە.

ڕوومەتەکانیدا دەهاتە خوارەوە، هەنسکی دەدا هەنسک دانێکی خەفەتاوی. وامزانی شتێکی لێهاتوە لێم پرسی:
چیتە؟ کەوتوییت؟ سەری لەقاند.
وتم: ئەی لێیان داویت؟سەری لەقاند.
وتم: ئەی چیتە؟
بە دەنگێکی پڕ گریانەوە وتی: باپیلە (واتە: باپیرە)!
وتم: بەڵێ؟
وتی: ئەثم.....
وتم: ئەثی؟
وتی: نا، نەک تەب، ئەمان
لێی تێنەگەیشتم، پوورە بچووکەکەی(یەمان)[10] هات بە زمانە ناتەواوەکەی وەرگێڕانی بۆکرد، وتی: باپیلە نەک تەب، ئەمان.
وتم: لەگەڵ ئەماندا بچیت بۆ قوتابخانە؟
ڕووی گەشایەوە و بێدەنگ بوو، وتی: ئەثین نەکتەب ئەمان.
وتم: بۆ قوتابخانە دەگریت؟! لێرە دابنیشیت باشترە، لەوەی بچیت بۆ قوتابخانە.
کە گوێی لەمە بوو هاواری کرد، وەک هاواری ئەو کەسەی هەنگ پێوەی دەدات، دووبارە دەستی کردەوە گریان. ئارامم کردەوە و

---

[10] دەرچووی زانکۆی مەلیک عەبدولعەزیزە و دایکی چوار منداڵە. ئەم دوو پەراوێزە شێخ لەساڵی ١٩٨٧دا زیادیکردووە.

بەڵێنم پێیدا، سەرسام بووم پێی کە لە تامەزرۆبوونی بۆ قوتابخانە دەگری، ئەوەم کەوتە یاد ئێمەش چۆن دەگریان لە ترس و ڕق لێبوونەوە لێی.

* * *

یادگارییەکانم گەڕاندمیەوە بۆ ساڵی ١٩١٤، بۆ یەکەمین بەڵای زەمانە کە هاتە ڕێم. مەبەستم جەنگی جیهانی نییە، ئەو دەمە واتای جەنگم نەدەزانی و گوێم پێی نەدەدا، بەڵکوو مەبەستم لەوە توندتر و قێزەونترە، توندتر لەسەر من؛ یەکەمین جار کە چوومە قوتابخانە. ڕۆژێکی ڕەش بوو هەرگیز لە یادم ناچێت، وای لێکردم ڕقم لە قوتابخانە بێت و لە دەروونمدا هێندەی جێهێشت کە هەرگیز تەواو نابێت، هەتا ئێستاش- هەرکات بیرم دەکەوێتەوە- ترسناکی و توندییەکەی دێتە پێش چاوم، لە دوای ئەوە بووم بە مامۆستای سەرەتایی و ناوەندی و زانکۆ، گەورە و بچووکم فێرکرد، کچ و کوڕ، نارەحەتی قوتابخانە و دڵخۆش بوونم بە تەواوبوونی، دڵخۆشبوونم بە ڕۆژی پێنج شەممە و نارەحەت بوونم بە ڕۆژی شەممە هێشتا لە دەروونمدا ماوە، هەرکات چووبێتم بۆ قوتابخانە ئیللا ئاواتم خواستووە داخرابێت یان مانیان گرتبێت و وانە نەخوێنرێت!

ئەو ڕۆژە باپیرەم بردمی بۆ مزگەوتی تەوبە[11] نوێژی بەیانی کرد و کەمێک مایەوە، پاشان لە دەرگایەکەوە چووینە ژوورەوە بەرانبەر مزگەوتەکە بوو. منیش لەبەر ڕووناکی بەرەبەیان و خۆردابووم، لەو شوێنەدا چەند خولەکێک مامەوە هیچ شتێکی ناویم نەدەبینی، وەلێ لووتم هەستی بە بۆنێکی ناخۆش و هەوایەکی پیسی کرد. پاشان شوێنەکەم بینی، ژوورێکی گەورەبوو دە منداڵ لەسەر زەوی دانیشتبوون، سەریان بادەدا و ئەملاولایان دەکرد، لە دەستیاندا کتێبێکیان پێبوو تەماشایان دەکرد و، دەنگیان لێوەدەهات وەک ئەوەی شانە هەنگ بن و لە بڵندگۆوە دەنگەکەیان بگوازرێتەوە، لە ژێریاندا سەکۆیەک هەبوو لە دار درووست کرابوو، لە نزیک دەرگاکە کۆتایی پێدەهات، لەبەردەمیاندا زەوییەکی ڕووتەڵەی قوڕاوی هەبوو، بۆقەکان تیایدا ڕیزییان بەستبوو، لەلای چەپیشەوە پیرەمێردێکی ترسناک لەسەر کورسیەکی بەرز دانیشتبوو، دارێکی درێژی پێبوو لە منداڵەکانی دەدا، دارەکە دەگەیشت بەوەی کە لە کۆتا شوێندا دانیشتووە.

---

[11] ئەم مزگەوتە چیرۆکێکی هەیە؛ ئەویش ئەوەیە ئەو شوێنە خان بوو پێیان دەوت خانی زنجاری جۆرەها جۆری تاوان و خراپەی تێدا ئەنجام دەدا، هەواڵی ئەمە گەیشت بە مەلیک ئەشرەف شوێنەکەی کڕی و ڕووخاندی و ئەم مزگەوتی تێدا دروستکرد کە پێی دەڵێن مزگەوتی تەوبە، یەکێکە لە مزگەوتە گەورەکانی دیمەشق.

تا لێرەدا باوەڵێم جێی هێشتم؛ کە دەرگاکەی داخست و ڕۆیشت هەستم کرد دڵیشم لەگەڵیدا ڕۆیی، وەک ئەوە وابوو خرابێتمە گۆڕەوە، تەنیایی و ترسێک هات بەسەرمدا ئێستاش بیرمدەکەوێتەوە لە ترسان هەڵدەلەرزم! ئەمە قوتابخانەبوو لە ڕۆژانی ئێمەدا.

پێویست بوو خوێندکارەکان لەگەڵ خۆرهەڵهاتندا لەوێ بن، هەتا خۆرئاوابوون بمێننەوە، نە جوڵێن و قسەنەکەن، واز لە خوێندنەوە نەهێنن و لێی بێزار نەبن، خۆیان خواردنی خۆیان بهێنن و لەوێ بیخۆن، کە تونیان دەبوو دەچوون بۆ چەمەکە و دەمیان دەنا بە ئاوە پیسەکەیەوە و وەک حوشتر ئاویان دەخواردەوە، گەر پێداویستییەکان هەبوایە دەچوون بۆ پێشاوی مزگەوت و، شوێنەکەش بەردەوام داخرابوو، دەرگا و پەنجەرەکەی نەدەکرایەوە و هەوا گۆڕکێی نەدەکرد، ڕۆژێک بەسەر ئەم منداڵدا تێنەدەپەڕی لەلایەن مامۆستاوە سزا نەدرێت: یان بە دار دەیدا بەسەریاندا، یان بەدار فەلاقەی دەکردن، یان هەمەوو بەیانییەک ئەم دیمەنە دووبارە دەبوویەوە دیمەنی ئەو منداڵەی لە شوێنی خۆی وشک دەبێت و ڕەتی دەکاتەوە بە قسەیان بکات، خێزانەکەشی ڕایان دەکێشا و کەسانی پیادە و منداڵەکان لەمەدا یارمەتیان دەدا، دەستی بگەیشتایە بە هەرشتێک خۆیی پێوەدەگرت و خۆی بەزەوییەوە دەنوساند و لە قوڕاوودا ئەم دیوو دیووی دەکرد، گریانەکانی چاوی ئازاردەدا و هاوەڕەکانی قوڕگی بریندار دەکرد، لێدانەکان بەر سەری دەکەوت، ڕادەکێشرا وەک ئەوەی تاوانبارێکی سەرکەش بێت، خۆی

بە ستەم لێکراو دەبینێ و هەموو خەڵکی تەنانەت باوکیشی بە دژی خۆی دەزانێ...وێنا بکەن ئەمە چ کاریگەرییەک دەکاتە سەر دەروون و ژیانی داهاتووی!



جێی سەرسامی نییە -ڕۆڵەکانم- لە حەزکردنتان بۆ قوتابخانە بگرین، چونکە ئێستا بۆتە بەهەشت بۆتان، جێی سەرسامیش نییە ئێمە دەگریان چونکە وەک دۆزەخ وابوو بۆمان. بۆ ئێوە سفرەیەکی ڕاخراوە، بە چێژترین خواردنی ئاسانی لەسەردانراوە لە جوانترین دەووریدا، لە چواردەووریدا گوڵ وگوڵزار و لە پشتیەوە مۆسیقا هەیە، خواردنی ئێمەش خواردنێکی چەوری قوورس بوو، لە پیسترین دەووری و لە قێزەونترین دیمەندا.

بەڵام کێ لە ئێمە دەیتوانی زۆرتر بخوات و ئەوە هەرس بکات کە خواردییەتی و، سوودی لێوەربگرێت؟ ئێوە لەسەر هەموو ئەم شتە خۆشانە، یان ئێمە لەسەر هەموو ئەم شتە ڕاونەرانە؟!

ئێوە بۆ قوتابخانە جوانترین پۆشاک دەپۆشن، ئێمەش سوێند بە خودا بە پۆشاکی خەوەوە دەچووین، نە دەگەشتە نیوەی قاچمان، لەسەرییەوە چاکەتەکەی باوکم هەبوو کە جوانییەکەی لە دەستدابوو دایکیشم بچووکی کردبووەوە بۆ من، قابقاق یان قۆندەرەی مینخالییەمان دەکردە پێمان. گەشتمە ناوەندیی و دووکانی

بەرگدوورم نەبینی، ئەوانەم دەپۆشی کە دایکم(خوا لێی خۆشبێت) بۆی دەدووریم، بۆینباخمان نەدەکرد هەتا گەیشتن بە بەکالۆریا، ئەم چاودێرییەی ئێوە دەکرێن لە کوێ و ئەوەی ئێمەش لە کوێ؟ خوێندکار پێداچوونەوە بە وانەکانیدا دەکات و لە ماڵەکەیدا کارەبا هەیە، لەوەشە منداڵە دەوڵەمەندەکان شوێنی تایبەتی خۆیان هەبێت و تێیدا بخوێنن، ئێمەش لەبەر ڕۆشنایی فانۆس دەمانخوێند، هەندێ جار بایەک لێی دەدا و وێنەی پەرییەکانی لەسەر دیوارەکە دەکێشا، یان دووکەڵی دەکرد یان قڵپ دەبوویەوە زەیتەکەی دەڕژا و کاغەز و کتێبەکەی خراپ دەکرد.....ئەم کارەبایەی ئێستا نەبوو ئیللا لە ڕێگاکان و کەمێک لە ماڵەکاندا نەبێت، خێزانەکەی ئێمە یەکێک بوو لەو خێزانانەی لە سەرەتاوە ڕایان کێشا، لە ساڵی ١٩١٦ لقێکمان لە ماڵی دراوسێکەمانەوە ڕاکێشا و، ڕووناکی کارەبام بینی و چێژمان لێی وەرگرت، لێ بووە هۆی ئەوەی فەلاقەیەکی باشیش بکرێم، ئەویش بەهۆی ئەوەوەبوو چووم بۆ قوتابخانە و وتم لە ماڵەوە ڕووناکیەکمان هەیە بەبێ نەوت کاردەکات و بەبێ فوو دەکوژێتەوە، تاریفم کرد بۆیان، یەکیان دژم وەستایەوە و وتی درۆ دەکەیت، جوێنم پێدا و جوێنی پێدام، لێمدا، مامۆستا فەلاقەیەکی کردم ئێستاش تامەکەیم لە یادە!

ئەمڕۆ منداڵ نەخۆش دەکەوێت دکتۆر و دەرمان ئامادەیە، دەرمانەکە پارچەیەک شوکولاتەیە یان کوپێک لیمۆیە و حەپێکی بچووکە یان شروبێکی بە چێژە، ئێمەش کە نەخۆش دەکەوتین

دەرمانەکەمان دەرزی و سینامەککی و ڕۆنی گەرچەک بوو، دکتۆریش نەدەهات مەگەر زۆر لە مەترسیدا بووینایە. دکتۆر کاریگەری گەورەی نەبوو، چونکە نیوەی زانستی دکتۆریی ئەمڕۆ و سێ لەسەر چواری دەرمانی ئەمڕۆ کە بۆ چارەسەر بەکاردەهێنرێت لە دوای منداڵی ئێمەوە زانراوە و دۆزراوەتەوە. منداڵییمان بێ بەش بوو لەخۆ پاراستن و چارەسەر.

ئێوە لە دیمەشقێکی نوێدا دەژین شەقامی فراوان و باخی گەورەی هەیە. لە قوتابخانەدا سینەما و هۆکاری دڵخۆشیتان هەیە. لە هاویناندا دەچن بۆ هەوارگە و شاخەکان. ئێمەش لە کۆڵانێکی تەنگدا دەژیایین. و زستانمان لە قوڕاودا بەسەر دەبرد. لە دیمەشقدا تەنها یەک شەقام هەبوو. یەکەمین شەقام کە تێیدا کرایەوە شەقامی جەمال پاشابوو. هەوارگەکانمان نەدەزانی ئیللا ئەو ڕۆژانە نەبێت کە لە ماڵی جووتیارەکاندا بەسەرمان دەبرد لە جودەیدە و بەسیمە. کەم کەس دەچێت بۆ ئەوێ. سەبارەت بە سینەماش سوێند دەخۆم بەکالۆریام تەواو کرد و لە ساڵی ١٩٢٨ چووم بۆ میصر بۆ خوێندنی باڵا هێشتا نەمزانیبوو سینەما چییە.

• • •

ئەگەر ئەم منداڵە و هاوڕێکانی بگرین بۆ قوتابخانە و، باوکەکان قەرەباڵغی بکەن بۆی، هیچ جێی سەرسامی نییە. جێی سەرسامیش نییە ئێمە لە ترسی قوتابخانە دەگریایین. ئەگەر من- مامۆستای

لادێ بوومایە- یاسای خوێندنی ناچارییم جێ بەجێ دەکرد بۆ ئەوەی باوکەکان ناچاربن منداڵەکانییان بنێرن بۆ قوتابخانە.

بەڵام منداڵەکان قسەیەکم بۆتان هەیە، تکام وایە گوێی لێبگرن و تێی بگەن، ئەگەر لێی تێنەگەیشتن دایک و باوکی بەڕێز ئێوە بفەرموون تێیان بگەیەنن: ئێوە لە نێوان کۆمەڵێ خێر و خۆشیدان ئێمە لێی بێبەش بووین، چێژ لە هەندێ شت وەردەگرن ئێمە ناویشیمان نەبیستبوو، ئەوەی بۆم باسکردن کەمی کەمە لەوەی تێیدا بووین، بەڵام- لەگەڵ ئەمانەشدا- لە ئێوە باشتربووین.

باوکمان لێی دەداین، باوکەکانی ئەمڕۆ لەگەڵ کوڕەکانیان نەرم و نیانن و نازیان دەکێشن. گوێڕایەڵی دایباب و ڕێزگرتنی مامۆستاکانمان بە فەرز دەزانی لەسەرمان، هیچ کەسێک لە ئێمە بوێری ئەوەی تێدا نەبوو پێچەوانەی فەرمانی باوکی بجوڵێتەوە، هیچ باوکێک لە خۆی ڕازی نەدەبوو گەر منداڵەکەی پێچەوانەی فەرمانەکانی بجوڵایەتەوە، باوک توانا و دەسەڵاتی هەبوو، هیچ بڕیارێک نەبوو لە ماڵدا بڕیاری ئەو نەبێت، هیچ قسەیەک نەبوو لە خێزاندا قسەی ئەو نەبێت. دەستیمان ماچ دەکرد لە ڕۆشتن و هاتن لە هەستان و دانیشتندا. لە دانیشتنەکانیدا بە ملکەچی و بێدەنگییەوە دادەنیشتین قسەمان نەدەکرد هەتا مۆڵەتی دەداین و، یەکێک لە ئێمە دەبوو بە پیاو و هاتنەوەی بۆ ماڵەوە نەدەگەشتە



بانگی مەغریب، وەڵامی باوکی نەدەدایەوە ئەگەرچی بە ئاشکرا قسەی پێ بوتایە یان لەناو کۆمەڵێکدا لێی بدایە، بۆ دایکمان باشبووین و دەمانزانی مافی ئەمان لە مافی خودایە و باشبوونمان لەگەڵیان باشبوونە لەگەڵ خودادا.

سەبارەت بە مامۆستاش یەکێکمان تێدا نەبوو بیر لە بێزارکردنی بکاتەوە یان سست بێت لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانیدا.

ئایا منداڵەکانی ئەمڕۆ مافی دایک و باوکیان دەزانن، ئایا خوێندکارەکانی ئەمڕۆ مافی مامۆستاکانیان دەزانن بەسەریانەوە؟

وانەکانمان گرانتربوو، پرۆگرامی خوێندنەکەشمان زۆرتربوو، لەگەڵ ئەمەشدا زیاتر پێشوازیمان لێی دەکرد و پێوەی سەرقاڵ دەبووین، و دەردەچووین تێیدا، لەسەرووی ئەمانەشەوە زۆرێک لە کتێبە زانستیەکانمان دەخوێندەوە. دەیان کتێبی ئەدەبی و زمانەوانی و ئایینیم خوێندبووەوە هێشتا لە ناوەندی بووم. دەچووینە کۆڕی زانایان لە مزگەوت و ماڵەکاندا، کۆدەبووینەوە بۆ زانستی قوتابخانە و ئایین و لۆغە، وتە بەهێزەکانمان ئەزبەردەکرد و بەشێکی زۆرمان لە باسە بەچێژەکانمان دەگێڕایەوە؛ گەر ویستی دڵدانەوەمان هەبوایە چیرۆکی عەنتەر و مەلیک سەیف و حەمزە پاڵەوانمان دەخوێندەوە، کتێبی ئەدەب و پاڵەوانیەتییە، ئەم گۆڤار و چیرۆک و فیلمانەمان نەدەزانی، سوپاس بۆ خودا لە ڕۆژانی ئێمەدا هیچ شتێک لەمانە بوونی نەبوو، تەنها گۆڤاری پڕ سوود بونیان هەبوو

وەک ((المقتطف)) و((الهلال))ی کۆن، لە دیمەشقدا تەنها لە دوو شوێن سینەما هەبوو فیلمی بێدەنگی هیچی تێدا پەخشدەکرا و، لە دونیادا سینەمای دەنگ بوونی نەبوو، خاوەنی جوامێری و پیاوەتی ڕووی نەدەکردە ئەو شوێنانە.

لە دیمەشق تەنها یەک ناوەندی بوونی هەبوو، ئەویش قوتابخانەی عەنبەربوو، بەڵام ئەم تاکە ناوەندییە زۆربەی پیاوانی ئوممەتی پێگەیاند، ساڵ تێنەدەپەڕی ئیللا نووسەرێک یان شاعیرێک یان بلیمەتێکی لە بایۆلۆجی یان بیرکاری یان مۆسیقا یان وەرزشوانێکی پێشکەشی کۆمەڵگا دەکرد.....ئێستاش دەیان ناوەندییمان هەیە لە دیمەشق، لە کوێن ئەو ئەدیب و زانا و هونەرمەندانەی لێوەی دەرچوون؟

* * *

لە دوای هەموو ئەمانەوە، پێتان وایە شتێکم نوسیووە بۆ ڕۆژی منداڵان بشێت؟ نازانم، بەڵام ئەوە دەزانم ئەوەی وتم ڕاستییە، ئەگەر دووشەممەی داهاتوو ڕۆژی جیهانی منداڵان بێت و، حوکوومەت خۆی بۆ ئامادە کردبێت و کاری بۆ کردبێت، ئەوا هەموو ڕۆژێکی باوک ڕۆژی ((منداڵانە))، پێویستە لەسەری بە دەروون و ماڵی یارمەتی بدات، لەو منداڵەی ئەمڕۆ پیاوی سبەینێ دروست بکات و خۆی و خەڵکی سوودی لێوەربگرن، بە زانست و ڕەوشتەکەی



سوود بگەیەنێت، لەسەری پێویستە بە باشی پەروەردەی بکات و ڕێگای بەختەوەری هەردوو دونیا و ڕزگاربوونی لە هەردوو ژیانەکەیدا بۆ فەراهەم بکات. وەسەلام.

* * *



# لە پەیمانگای ماف

لە ساڵی ١٩٣٢دا بڵاو کراوەتەوە

دوێنێ ..... پێش ئەوەی وانەکە دەست پێبکات.
پۆلی سێ نارام بوو[١٢]. ئەو خوێندکارانەی لەم کاتە زووەدا هاتوون بۆ پەیمانگا لە مانگی ڕەمەزاندا(کەمن ئەوانە) بە سیستەمێکی سەیر دەووری ژۆپەکەیان داوە؛ یەکێک لەسەر کورسی مامۆستا دانیشتووە و سەری کردۆتە دوو توێی گۆڤارەکەوە و، یەکێکی تر دانیشتووە لەسەر دوانگەی پۆلەکە. بە قاچی دەیدا لەلاکەی، دراوسێکەی هاوار دەکات بەسەریدا. کە کورسی موعیدەکەی هێناووە و لەلای ژۆپاکەوە دانیشتوە و قاچی درێژ کردووە بەرەوو ڕووی کەسێکی تر. ئەویش پێی دەڵێت: بەسە کاکە!

خولەکێک ڕۆیشت و جوێنی هاوڕێیەتیان بەیەک دەدا. دواتر هێمنیەکەی پێشوو گەڕایەوە و لەم هۆڵە گەورەدا گوێبیستی هیچ

[١٢] ئەو کات خوێندنی ماف سێ ساڵبوو.



شتێک نابیت تەنها دەنگی جەڕەسە ئاسنەکەی زۆپاکە نەبێت، یان دەنگی ڕۆژنامەی((الأحرار)) لە دەستی خوێندکارێکدا، یان پژمەی کەسێک بە دەنگێکی بێزارکەر، کۆتاییەکەی وشەی کەسێکە دەڵێت: کۆتاییەکەی؟!

دۆخەکە بەم شێوەیە بوو هەتا چارەکێک، هەندێ خوێندکاری تر هاتن و لە دەووری ئاگرەکە بە بێدەنگی دانیشتن، دوای ئەوەی سڵاو و بەیانی باشیان کرد.



پاشان ورتە ورتێک هات لە سوچی پۆلەکەوە، ئەونەی پێنەچوو بووبە ژاوەژاوێکی گەورە دەنگەکان تێیدا تێکەڵ بوون و شێوە زاراوەکان بە دەرکەوتن، ئامادەبووان بە خێرایی

لێرە و لەوێ پرسیاریان دەکرد:

خوێندکاری شام: شو، شو الحكاية؟

خوێندکاری حەلەبی: أشو خبر خيو؟

خوێندکاری عێراقی: شنو هي الكصة؟

خوێندکاری میسری: طَب... ما تقولوا إيه الحكاية؟

لەدوای هەموو ئەمانە، توانیمان زوبانی ئاگرین خامۆش بکەین، و بەڕێکی و هێمنیەوە دەستمان کرد بە قسەکردن، بەڕێز((خ)) وتی: تکاتان لێدەکەم براکانم...بابە هێمنی قسە بکەین. دەتانەوێت گوێ بیستی بن؟

- چی؟

- لەم قەیرانەدا چل لیرە[١٣] بدەین بە بڕوانامەکانمان، شتێکە بەرگە ناگیرێت، پێویستە ڕێگایەکی دروست بگرینە بەر.

- بۆ ڕەتکردنەوەی وێنەی بڕوانامە؟

- نەخێر؛ تکا دەکەم پەلەمەکە. ڕەتکردنەوەی نابێت، بەڵام داوای کەمکردنەوەی نرخەکەی دەکەین.

- قسەیەکی پووچە!

کەسێکی تر: پەیوەندی بەتۆوە چییە؟ لێی گەڕێ قسەکانی بکات.

کەسێکی تر: بێدەنگ بە، بەڕێز((خ)) ڕاست دەکات.

خ: ڕێگای دروست ئەوەیە کە......

- عەریزەیەک بەرزبکەینەوە... پێشنیازی ئەمە دەکەم.

کەسێکی تر: نەخێر. پێشنیازەکەت لە شوێنی خۆیدا نییە. پێویستە شاندێک بنێرین.

- عەریزە باشترە لە شاند.

کەسێکی تر: ئەی ئەگەر عەریزەکە سوودی نەبوو.

- ئەگەر سەرکەوتوو نەبوو؟....پێویستە سەربکەوێت.

- لۆژیک!!

- گەر سەرکەوتوو نەبوو کەسمان ناچینە تاقیکردنەوەکانەوە.

- هاوڕام.

---

[١٣] سووچەکەم - مامۆستای سەرەتایی بووم- ٣٦لیرەبوو، کیلۆیەک نان بە نیو فرانک بوو.

کەسێکی تر: بە پێچەوانەوە؛ هاوڕانیم. بیرۆکەیەکی هیچە.

- ئەدەبی خۆت ڕاگرە.....تکا دەکەم.

- ئەدەبی خۆم ڕاگرتووە، بەڵکوو تۆ قسەکەت بکشێنەوە.

خ: من دەیگێڕمەوە، بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ ئەسڵی بابەتەکە.

-ئێمە لەسەر ئامانجێک هاوڕاین، لەسەر ئەو ڕێگایە ڕێدەکەوین کە دەمانگەیەنێت پێی، بۆچوونم وایە دوابخرێت بۆ کاتی کۆبوونەوەی خوێندکارەکان، ئێستا گوێ لە چیرۆکەکە بگرن.

- نەخێر؛ گوێ ناگرین، نامانەوێت گوێ لە چیرۆک بگرین.

- ئەفسانەش (پێکەنی).

خ: چیرۆکێکی واقعییە و ئەفسانە نییە، پەیوەندی بەباتەکەوە هەیە.

- هەرکەسێک نایەوێت گوێبیستی بێت با دەستبکاتە گوێچکەیەوە. فەرموو چیرۆکەکە بڵێ. بەلایەنی کەمەوە تۆزێ دڵنەواییمان دەکات، مانگی ڕەمەزان پێویستی بە دڵنەواییەکی بیگەردە.

خ: چیرۆکی خوێندکارێکی پەیمانگایە، پێش دووساڵ.

گومانم وایە هەندێکتان دەیناسن. بەڕێز سولەیمان فالح.

- من باش دەیناسم....خوالێی خۆشبێت.

- مردووە؟!

خ: گوێ بگرن، چیرۆکەکەیتان بۆباس دەکەم، لە زیرەکترین خوێندکارەکانی کۆلێژبوو، یەکێک بوو لە هەرە ڕۆشن فکرەکان.

لە تاقیکردنەوەی یەکەم ساڵ و دووەم ساڵ سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا. جێگای سەرنجی مامۆستا و خوێندکارەکان بوو. تەنانەت ئەو سیمینارەی کە لە هۆڵی کۆلێژ پێشکەشی کرد سێ ڕۆژنامەی شار بڵاوی کردەوە. گۆڤاری ((المقتطف)) پوختەکەی بڵاوکردەوە لە دوای ئەوەی ستایشی نووسەرەکەی کردبوو لەگەڵ مژدە پێدانی بە داهاتوویەکی پرشنگدار.

- کەواتە چۆن مرد؟

- لەوانە بوو کە بیریارەکان لەبارەیەوە دەڵێن: "بێدەنگ بوو. بیریکردەوە".

- لێبگەڕێ.... چی لێهات. دواتر چیبوو؟

- بە گیرفان هەژار، بە دەروون دەوڵەمەند. بەڵێ. هەژاربوو. لە دونیا و سامانەکەی هیچی نەبوو ئیللا ئەو سامانە مەعنەوییە نەبێت کە خودا پێی بەخشیبوو. کە قۆناخی سێی تەواو کرد وێنەی بڕوانامەکەی پێشکەشکرا. هیچ ڕێگایەکی نەبوو بۆ بە دەستهێنانی... ڕێگرییان لێی کرد لە چوونە تاقیکردنەوەکان.

- بە پوختی بیڵێ....مامۆستا هات.

- پوختەی قسان. هەستی کرد داهاتووی لە دەستداوە و کۆشکی هیواکانی ڕووخاوە. لە کاتی کاردانەوەدا فیشەکێکی نا بەخۆیەوە.

- داماوە.

- داماوە؟ شێتە.

- بەڵکوو تۆ شێتیت.



کە ((خ)) گەیشت بەم قسانە مامۆستا هاتە پۆلەوە، هەموومان بەخێرایی چووینەوە جێگاکانمان و داوایان لێ کردم وتارێک بنووسم بۆ ئەوەی ببێتە هەنگاوی یەکەم بۆ داواکردنی کەمکردنەوەی (( ئەم وێنە..... گرانە)) ئەنجامیشم دا.



# بڕوانامەی لیسانس[١٤] بۆ فرۆشتن

لە ساڵی ١٩٣٢دا بڵاوکراوەتەوە

خوێنەرە بەڕێزەکان چوار ڕۆژە لیسانسم لە مافدا بەدەستهێناوە و، ئەم بڕوانامە جوانە گەورەیە ڕازێنراوەتەوە بە دە مۆر و واژووی پیاوی گەورە و دەوڵەت و پایەبەرز و ئەوەشی نازانم چییە: سەرۆکی کۆمار و حوکوومەت و جێگری عەمید و سەرۆکی زانکۆ و کۆلێژ.... و بانگخواز. ئاتاج بۆی بەڕێز هەڵگری بڕوانامە! چوارچێوەیەکی جوانی بە نرخم بۆی کردووە بە شێوازێک لە شێوازەکان دەستم کەوتووە حەزناکەم نهێنییەکەی بۆ خوێنەران ئاشکرا بکەم، دەتوانن بڕوام پێ بکەن یەک قرووشم تێیدا خەرج نەکردووە، لە ماڵەوە هەڵمواسیووە و لەو ژوورەی کە پێویستبوو ژووری میوان بێت و ڕێکخراوبێت نەک وەک ئەوەی ئێستا بێت: هەر کەسێک بێت دەکەوێتە ناو کۆمەڵێک کتێبەوە، کە بەردەوام سوور دەخوات وەک چۆن قەڵاکانی بیابان سوور دەخوات. سەرەوەی دەچێت بۆ

---

[١٤] بڕوانامەی بەکالۆریۆس.

خوارەوە هەرکات بەدوای کتێبێکدا بگەڕێم، لەوێدا هەڵمواسیووە لەلای براکانی بەکالۆریا و سەرەتایی و پێزانینەکان. حەفتاو حەوت خولەک بەملکەچییەوە بەرانبەری وەستام، بیرم لەو دە ساڵە دەکردەوە کە خەرجم کرد لە بەدەستهێنانیدا، باشتربوو بۆم ئەو ماوە بەکرێ لای سەرتاشێک کارم بکردایە و چێژم لە جوانی و پارە وەربگرتایە، یان لە کۆمەڵەیەکدا هونەرمەند بوومایە و ژیانێکی پڕ نیعمەت و گەورەدانان بژیامایە، یان لە چاپخانەیەک کارم بکردایە زەمانە بگۆڕایەوە و ببومایە بە بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە.....یان لە خوێندنەوەی ڕۆمان و چیرۆکەکاندا بەسەرم ببردایە چێژ و خۆشیم لێی دەبرد(( ئەگەر سوودیشم لێوەرنەگرتایە)). لێی ڕامام و بە گەورەم دانا، بوێریم کرد و بە پێکەنینەوە دەستم لێیدا، وەک چۆن مرۆڤ دەست دەدات لە دەستەریڤانەیەکی بە نرخ بۆ ئەوەی زیاتر هەستی پێ بکات، یان شوێنەوارێکی پیرۆز بۆ ئەوەی تەبەڕووکی پێوەبکات[15].

دوای ئەوەی دانیشتم بیرمکردەوە: چی پێ بکەم لەدوای ئەوەی حەزی سەرکەوتن و ئارەزووی بەدەستهێنانی لە دەروونمدا نەهێشت؟ دەرگاکانم داخست و ڕووناکیەکانم کوژاندەوە، بخوردم

---

[15] لەلای موسڵمان هیچ شتێک پیرۆز نییە تەبەڕوکی پێوەبکات بۆ سوود یان بۆ زیان، تەنانەت بەردە ڕەشەکە نە سوودت پێدەگەیەنێت نە زیانت لێدووردەخاتەوە، بەڵکوو وەک شوێن کەوتن و عیبادەت ماچ دەکرێت.

داگیرساند...و ناوی پەرییەکانم خوێند و هاوارم کردە مەلیکی سوور و سەوز، پاشان بڕوانامەکەم سووتاند و لە بڵێسەکەی دێوێکی درێژ هاتە دەرەوە و بە ملکەچییەوە لە بەردەممدا وەستا.

پێم وت: ناوت چییە؟

- گەورەم لیسانس

- چیت پێدەکرێت؟

- هەموو شتێک گەورەم، خاوەن کورسییە نەزانەکان لادەدەم لەسەر کورسیەکانیان، بۆ ئەوەی تۆ لەسەری دابنیشیت، ئەی خاوەن لیسانس.

- دڵنیاییت لەوەی دەتوانیت؟

- بەڵێ گەورەم، بە مەرجێک دووژمنە سەرسەختەکەم لێدووربخەیتەوە.

- کێ دووژمنی سەرسەختی تۆیە؟

- شەیتانێکی بەهێزی ترسناکە کەس بەسەریدا زاڵ نابێت، پێی دەڵێن((تکاکردن))

- ناتوانم بتپارێزم لێی، چی ترت پێدەکرێت؟

- ئەو پارانەت بۆ دێنم کە داگیرکەر و درۆزنەکان خەزنیان کردووە لە گەنجینەکانیاندا و، ڕادەستی تۆ و ئەوانەی دەکەم، ئەی خاوەنی لیسانسن.

- باریکەڵڵا...هەستە بڕۆ، بیهێنە.

- بەڵام دەترسم.

- لە چی دەترسیت؟

- شەیتانێکی بەهێزی خراپەکارە، نابینایە و دەستەکانی لە ئاگرە، بدات لە هەر شوێنێک کونێکی بەرەو دۆزەخ دەکاتەوە، لە هەرکەسێکیش ڕازی بێت چی دەوێت و حەزی بەچییە پێی دەبەخشێت.

- ئەمە ناوی چییە لە نێوان شەیتانەکاندا؟

- ناوی بەختە گەورەم.

- چیتر دەتوانی؟

- گەورەم سەرۆکیت پێدەبەخشم و لەو نەزانانەی دەسەنمەوە.

- چەن چاکە، خێراکە.

- بەڵام لە هاوڕێی سەرۆکەکان دەترسم، شەیتانێکە چل وچوار قاچی هەیە لە یەک کاتدا بۆ چەند شوێنێک دەچێت و لە هەموویاندا هاواردەکات: دەژی دەژی!

- پەنادەگرم بە خودا، ئەمە خراپترین شەیتانە... ناوی چییە؟

- گەوجاندن گەورەم.

- کەواتە چیت پێدەکرێت ئەی لیسانسی لاواز؟ لاچۆ لەبەرچاوم ونبە.

* * *

لەدوای هەموو ئەمانەوە، ئەی خەڵکینە چ بکەین بە بڕوانامەکانمان؟
لەلای یەک لە پارێزەرەکان پێشنیاری ئەوەم کرد- بوێریم هەیە لەگەڵیدا چونکە مامۆستام بوو لە پەیمانگا- لەلای خۆی وەرمبگرێت هەتا فێرببم، ڕە..... ڕەتیکردەوە
وتیان: هەیە ڕاهێنەر وەردەگرێت، لێ هیچی ناداتێ؛ واتە کار بکەن لەسەر ڕۆحی دایکیان و ئاوی ژیانیان خەرج بکەن و قاچ و دەستیان بشکێنن لە کارکردندا لەو نووسینگەیەی کە کاری تێدا دەکەن، بۆ ئەوەی مامۆستاکان بەرووبوومی ڕەنجەکەیان بخۆن. توخوا بۆچی؟ لەبەرئەوەی مامۆستان؟ پێی ڕێزداربووین!

گەر بچین داوای کارێکی دادوەری بکەین دەبینین هەموو کارەکان گیراون، هەموو فەرمانبەرەکانیش دەترسن، بەڕێوەبەرەکەی ئەمی بە خەیاڵدا بێت و فڕێی بدات وەک چۆن تۆوێک فڕێ دەدرێت کە شیرینیەکەی لێدەرکراوە.
ئەگەر ئەم شارەش بەجێ بهێڵین و بچینە شارێکی تر دان بە بڕوانامە و پەیمانگاکەماندا نانێن، ئەم واژوو و مۆرانە بە کەڵکمان نایەن.

ئەگەر لەو نووسینگانەش بە خۆڕایی و لەبەرخودا کارمان کرد، لەگەڵ ئەوەشدا کارێکی تر بکەین بۆ ئەوەی نانەکەمانی پێ پەیدا

بکەین، دەڵێن: دروست نییە....واتە ڕەحمان پێناکەن و لێشمان ناگەڕێن بۆ ڕەحمی خودا؛ وادەزانن پارێزەری ڕاهێنەر تێر دەبێت و سکی پڕدەکات و پۆشتە دەبێت و هێمنی و ئارامی دەدۆزێتەوە ئەگەر جەنابی پارێزەر دە جۆر خواردن بخوات و دە جۆر پۆشاک بپۆشێت!

* * *

خوێنەرە بەڕێزەکان، من بڕوانامە و نازناوەکەم دەفرۆشم بە(نەقد و قیست)، سەبارەت بە ماندویی مێشکم و ڕۆژەکانی ژیانم هیچ شتێکم لەسەر ئەمە ناوێت، و پاداشتم لەلای خودایە.

کێ دەیکڕێت؟.....

بڕوانامەیەکی سپی گەورەی بێگەردە، نووسینەکەی جوانە، خاوەنی چوارچێوەیەکی قەشەنگە.... تازەیە! کێ دەیکڕێت؟

* * *



# پرۆژەی وتار

لە ساڵی ١٩٣٥دا بڵاوکراوەتەوە

نەریتم وایە لە ڕۆژی جەژندا دەرگا لە خۆم دادەخەم، بۆ کەسی ناکەمەوە هەتا جەژن کۆتایی دێت، مەگەر بچم بۆ نوێژ یان پێویست بێت هاوڕێیەکم ببینم، ئەم ڕۆژانە بەکاردەهێنم بۆ گەڕانەوە بۆ دەروونم و دڵخۆش بوون لەگەڵ خێزانەکەم و، تەماشاکردنی کتێب و تیانووسەکانم، مامۆستا وەحید ئەبیەش داوای لێکردم بابەتێک بنووسم بۆ((شوعلە)) وەڵامم دایەوە و بەڵێنم پێیدا لە ڕۆژانی جەژندا بۆی بنووسم.

بەڵام شەیتان لە بیری بردمەوە و زمانی گرتم بڵێم: ((ان شاءالله))، هەرشتێکیش خودا ویستی لێی نەبێت نابێت؛ هەر کە دانیشتم بۆ ئەوەی بنووسم دەرگاکان بە ڕوومدا داخران و، بابەتەکانم لێ ونبوو، قسە لە دەستم ڕایکرد، مامەوە وەک ئەوەی یەکەمجارم بێت بنووسم و پێشتر هیچم نەنوسی بێت، پێشتر گەر بمویستایە بنووسم پێنووسەکەم دەگرتە دەستم و دەمخستە سەر لاپەڕەکە، خۆی دەستی دەکرد بە نووسین و خۆم بەرزم دەکردەوە بۆ ئەوەی بابەتەکە بخوێنمەوە و واژووی بکەم!

زۆر بیرم کردەوە هیچم زیاد نەکرد، دوورکەوتنەوە و دەستەوسانبوون نەبێت، پێنووسەکەم دانا و زانیم قوفڵ بووەمە، دەروونیش وەک ئاسمان وایە، دەرگاکانی دەکرێتەوە و باران دەبارێت هەتا خودا شارێکی مردووی پێ زیندوو دەکاتەوە، زەوی تێراو دەکات و گەشە دەکات و هەموو جۆرە گوڵێکی لێ دەڕوێت، هەندێ جاریش خودا دایدەخات، ڕەزیلی و بەخیلی دەکات بە یەک دڵۆپە ئاویش!

پەنام بۆ شتێک برد ئیلهامی لێوەربگرم، پرسیارم لە ناجی برام کرد سەبارەت بەو وانەی دەیخوێنێتەوە وتم: بەڵکوو بابەتێکی تێدا بدۆزمەوە و لەسەری بنووسم، دەستی کرد بە قسە کردن، قسەکردنێکی قورس بۆ گوێچکە و بێزراو لەسەر دەروون، دڵم پێی تەنگ بوو، دەروونم مەیی، هیچی لێ تێنەگەیشتم، بەڵام بە بیرم هاتەوە پێشتر گوێم لێیبووە، بیرکردنەوەکەم ڕوونتر بوویەوە زانیم ئەم بابەتە لە پۆلی دووەمی بەکالۆریادا بووە، پاشان بیرم چۆتەوە وەک چۆن شتەکانی ترم بیرچۆتەوە لەو شتانەی وڕێنەمان پێوەی دەکرد لە وانەکانی کیمیا و فیزیا و بیرکاریی و جوگرافیا.... وازم لە براکەم هێنا بۆ خۆی ئەم وڕێنانە بڵێتەوە و دەستم کرد بە بیرکردنەوە: ڕۆژگار چی بۆ هێشتومەتەوە لەو پرۆگرامە دوور و درێژەی کە حەوتساڵی تەمەنم تێیدا خەرج کرد، کە بەهاری تەمەن و ساڵانی هێز و چالاکییە، ساڵانی لاوێتی و دەروون بەرزییە؟ چ سوودێکمان بینی لە وانەکان و خوێندنی باڵا؟ تەماشام کرد هەموو شتەکانی بیرکاریم لەبیرچۆتەوە، ئیللا ئەوە نەبێت

زانستی چەندیتییە، چەندیتیی یان نەوەتە پێکەوەن ئەمە لە زانستی ئەندازیاری باسدەکرێ یان چەندیتییەکی لێک جوودان لە زانستی ژمێریارییدا باسدەکرێ. جا لە زانستی ژمێریارییشدا جاری وایە ژمارەکان پیتن دەلالەت لەسەر زیاتر لە یەک بەهای دیاریکراو دەدەن بەمەش دەڵێن جەبر. زانستی ئەندازیاریش، ئەندازیاری رووکەشی و ئەندازیاری شێوەیی سێ رەهەندییەکانە یان ئەندازیاری رێژەیییە. شتێکی تری تێدابوو کە هەرگیز مرۆڤ لێی تێناگا ئەویش سێگۆشەکانە!! سەبارەت بە بیردۆز و بانگەشەکانی تر ئەوانە شتانێکی بەرز و گەورەن و، لە دەروونا نامێننەوە، لە پایەی ئەو نییە تێیدا بمێنێتەوە، بەڵکوو رێگاکەی ئەوەیە بفرێت! هەموو شتێکم لە کیمیادا لەبیرکردووە، یاساکانی فیزیا و بابەتەکانی جوگرافیام لەبیرکردووە، هەموو ئەوانەی خوێندوومانە و ئەزبەرمان کردووە و گەواهی دراوە کە ئێمە بەجوانی و رێکی ئەزبەرمان کردووە!

هەموو ئەوانەی ئێستا دەیزانم شتێکە لە زوبان و ئەدەب و مێژوو خۆم خوێندوومەتەوە و لەدوای تەواوکردنی قوتابخانە بەدەستم هێناوە، قوتابخانە تەنها ناوی زانستەکان و پەسنێکی گشتیانی فێرکردم، لێی دەرنەچووم ئیللا بەو رووحە نەبێت کە زاناکان و مامۆستاکانمان پێیان بەخشی بووین[١٦]. قوتابخانە هیچ شتێک فێری خوێندکار

---

[١٦] رەحمەتی خودایان لێبێت موسڵمانی رۆژهەڵاتی بوون، هێشتا ئەوروپا نەگەیشتبووە دین و نەریتیان!



ناکات بەڵکوو ڕێگایەکی نیشان دەدات و پلانەکەی بۆ دەکێشێت. ئایا پێویست نییە لەسەر مامۆستاکان ڕێنوێنی خوێندکارەکان بکەن بۆ ڕێگا و پلانی ڕاست و ڕەوان؟ ئایا پێویست نییە لەسەریان - پێش ئەوەی فێری باساکانی فیزیا و هاوکێشەکانی کیمیا و بیردۆزەکانی بیرکاریبیان بکەن کە بیریبان دەچێتەوە- فێریبیان بکەن باوپیرانیبیان کێیبە و شارستانییەکەیان کامەیە. لە دەروونیاندا ڕەوشتی عەرەبی و ئادابی ئیسلامی بچەسپێنن. زانستیان لەلا خۆشەویست بکرێت هەتا بە خۆشەویستی و چێژەوە ڕووی تێبکەن. نەک بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامە و ڕزگاربوون لە تاقیکردنەوە. بەڵکوو بۆ ئەوەی سوودی لێوەربگرێت بۆ بەرزکردنەوەی ژیانی و ژیانی میللەتەکەیان و خزمەتی وڵات و گەلەکەیانی پێ بکەن....((ڕاستییەکانی ژیان))ی تێبگەیەنن و بە ڕووتی پێشانی بدەن و بە هیچ شتێک پۆشتەی نەکەن؟

• • •

ئەمە ئەو بابەتەبوو بەدوایدا دەگەڕام دۆزیمەوە. وەلێ لە کاتێکدا کە پێویستە کۆتایی بە بابەتەکە بهێنم. کەواتە با بەبێ بابەت و ناونیشان بمێنێتەوە.

• • •



# چیرۆکی مامۆستا

لە ساڵی ١٩٣٥دا بڵاوکراوەتەوە

بە هاوڕێ ئەدیبەکەمم وت: ماوەی دە ساڵە نووسینەکانی تۆ دەخوێنمەوە، هیچ کات نەمبینیووە بە هاوشێوەی ئەم ڕۆژانە بەداخ بیت. گومانم وایە: ئەوە تۆی ئەوشتانە دەنووسیت یان لەوکاتەی خەوتویت پێنووسەکەت دەینووسێت، هەڵدەسیت و ناوی خۆتی لەسەر دەنووسیت؟ چیتە هاوڕێ گیان زمانپاراویت نەماوە و بلیمەتیەکەت سڕاوەتەوە؟

وتی: فلانە کەس وازم لێبهێنە، وازم لێبهێنە؛ چرای ژیانم وا دەکوژێتەوە و مۆمەکەم دەتوێتەوە، لەم ماوەدا دەبینیت مردووم یان بە شێتی بە بازاڕدا سووڕ دەخۆم و لێبوومەتەوە، دڵ و سەرمم فرۆشت بۆ نانێک.

وتم: لێت دەترسم پێم بڵێ چیتە، سوێند بە خودا ترساندمت.

وتی: هیچم نییە ئەوە نەبێت من مامۆستام. مامۆستام لە قوتابخانەیەکی سەرەتایی، ڕۆژم ڕۆژی شێتەکانە و شەویشم شەوی

کوژراوەکانە، کەی بیربکەمەوە و کەی بنووسم؟ ئێوارە دەڕۆمەوە بۆ ماڵەوە جەستەمە شەکەتە، سەرم دێشێت، قوڕگم وشکە، ناتوانم بخەوم هەتا سەد گەمژەیەتی نەخوێنمەوە، سەد تیانووس سەح نەکەم، چاوم کوێر دەبێت بە خوێندنەوەی و ئاماژەکردن بۆ هەڵەکانی و، ڕوونکردنەوەی ڕاستەکەی و دانانی نمرە بۆیان، ئەگەر لە هەموو ئەمانە تەواوبووم( خوێندکاریش هیچ یەکێک لەمانە ناخوێنێتەوە و تەماشای ناکات) دەچمە سەر کتێبی ئامادەکردنی وانەکان( مردنی سوورە و بەڵای شینە کە ئەم ساڵ درا بە سەرماندا) ئەو شتانەم تێیدا نوسی کە سبەینێ لە پۆلدا ئەنجامی دەدەم، خولەک بە خولەکی سات بە ساتی....و چ وشەیەک دەڵێم و چ یاسایەک باس دەکەم، و چ نموونەیەک دەهێنمەوە. هەتا دەگەم بە کۆتا وشەی کە تێیدایە کۆتا دڵۆپە ئاوی ژیانم دێتە خوارەوە، لە شوێنی خۆمدا بە کوژراوی دەکەوم و هەڵم دەگرن بۆ سەر جێگاکەم.....دەخەوم بە خەوتنێکی ناڕێک، پڕ لە خەونی بێزارکار و دیمەنی ترسناک، هەستم کرد کۆمەڵێک تیانووس بەرانبەرمە و پێویستە لەسەرم بەیانی سەحیان بکەم، ڕزگار نەبووم لێی هەتا بینیم پشکنەر لەسەر منارەوە قسە دەکات، یاسایەک نامێنێت لە یاساکانی پەروەردە بیردۆزێک لە بیردۆزەکانی فێرکردن کە دەرکەوتووە لە فەڕەنسا و ئینگلتەرا ئیللا دەبێت جێ بەجێی بکەم، لە پۆلێکدا کە حەفتا خوێندکاری تێ ترنجێنراوە، هیچ پرۆگرامێکی پەروەردە و هیچ یاسایەکی تەندرووستی بەمە ڕازی

نابن. ئەم دیمەنە لاچوو بینیم کە قسە بۆ خوێندکارێک دەکەم و گوێم لێدەگرێت و تێناگات، دووبارەی دەکەمەوە و تێناگات، هەڵدەستم بزانم چی دەکات، دەبینم مێشێکی گرتووە و قاچی بە پەت بەستووەتەوە، ئەگەر قسەی پێ بڵێم یان بیکەمە دەرەوە دەچێت ڕێی یاسام لێدەگرێت، ئەو یاسایەی هەموو سزاکانی قەدەغەکردووە، و دەستی ماموٚستای گرتوو و زمانی توندکردووە....بەردەوامم لە بینینی ئەم خەونە، ئەم دیوو و دیوومە، لەتاو سەر ئێشەدا هەستەکەم سەرم هێندەی ئوحود قورسە، هەتا خودا ڕۆژ دەکاتەوە، بە شلەژاوی لە خەو ڕادێم و دەترسم کات پێشم بکەوێت، نازانم چەندێ ڕکوع و سوجدەم بردووە، چیم خواردووە و چیم پۆشیووە، ڕادەکەم بەرەو قوتابخانە، نابێ لێی دوابکەوم گەرچی ئازار بمهاڕێت و ((تا))بمسوتێنێت، چونکە یاسا ڕێگەم پێنادات لە ڕۆژانی خوێندندا نەخۆش بکەوم، بۆ خۆم چوار مانگم هەیە((پشووی هاوین)) دەتوانم تێیدا نەخۆش بکەوم، ئەگەر پێچەوانەی ئەمە بکەم و نەخۆش بکەوم لە مووچەکەم دەبڕدرێت[17]!

دەگەمە قوتابخانە و دەچمە سەر خوێندکارانی پۆلی سێیەمی سەرەتایی، ئەمانە خوێندنکاری منن بە شایستەیان نەزانیووم وانە بە لەوان گەورەتر بڵێم....لە مێشکم دەکەمەوە بۆ ئەوەی مێشکی ئەوان تەواو بکەم، دەروونی خۆم دەدڕێنم بۆ ئەوەی دەروونی ئەوان پینە

[17] ئەو دەمە یاسا بوو.

کەم، پاشان سەرکەوتوونابم لە فێرکردن و تێگەیاندیان و نازانم بەچی ڕێگایەک تێدەگەن، یەک کاتژمێر تەواو تەرخان دەکەم جوانترین وتە و دەستەواژە بەکاردەهێنم، بۆ ئەوەی تێیان بگەیەنم(( ناو: وشەیەکە بەڵگەیە لەسەر ناوێکی سەربەخۆ و کات بەشێک نییە لە ئەو))، هیچ لەمە تێناگەن، ناشتوانم ئەم پێناسە هیچە لابدەم یان بیگۆڕم، یەک کاتژمێر وڕینە دەکەم دواتر دەڵێم: کێ تێگەیشتووە؟ یەکێک دەستی بەرزدەکاتەوە، سوپاسی خودا دەکەم کە خوێندکارێک تێگەیشتووە و دەڵێم: هەستە کوڕەکەم باریکەڵڵا، واتای پێناسەکەم پێ بڵێ.

دەڵێت: مامۆستا! ئەمە قاچی نا بەقاچما.

هاوارەدەکەم: ماڵ وێران بیت شتە پیس! من پرسیاری پێناسەی ناوت لێدەکەم، بۆچی قاچ دەنێی بە قاچیدا؟

ئەموت ئەم سکاڵایانە لە کاتی وانە وتنەوەدا قەدەغەیە؟

دەڵێت: بۆچی قاچی دەنێ بە قاچمدا؟

هاوارەدەکەم بەسەر ئەوی تردا: بۆ قاچت ناوە بە قاچیدا ئەی شەیتان؟

دەڵێت: سوێند بەخودا درۆ دەکات، قاچم نەناوە بە قاچیدا خۆی قەپی لەگوێم گرت.

تووڕە دەبم و هاوارەدەکەم بەسەریدا: چۆن قەپت لێدەگرێت و منیش لێرەم؟

دەڵێت: ئێستا نا، دوێنێ قەپی لێگرتم.

عفریتە بچووکەکانیش گەواهی دەدەن لەسەر سکاڵاکار و سکاڵالێکراو، پۆلەکە دەهەژێت، بە گۆچانەکەم دەدەم بە تەختەکەدا و بێدەنگیان دەکەم و هەڕەشەیان لێدەکەم ئەوەی قسە بکات توندترین سزای دەدەم( خۆشم نازانم توندترین سزا چییە)، بێدەنگ دەبن و دەگەڕێمەوە بۆ وانەکە دەبینم لە مێشکیان فڕیووە، لە کاتێکدا هەر تێیدا جێگیر نەبووە!

فوودەکرێت بەکەڕەنادا، قیامەت هەڵدەسێت و منداڵەکان دەردەچن بۆ پشوو، پاشان دەگەڕێینەوە بۆ وانەی قورئان.

دەڵێم: کێ سورەتی فاتیحەی لەبەرکردووە؟

هاواردەکەن: من ..... من.....من.

- بێدەنگ بن! تەنها یەک کەستان.....تۆ بیخوێنەوە.

- الحمدلله رب العالمین. إیاك نعبِد....

دەڵێم: إیاك نعبُد....

دەڵێت: نعبِد.

- نَع بُ د.

دەڵێت: نَع بِ د.

- سەیرکە کوڕەکەم: نَع بود.

دەیلێت.

- باشە، بڵێ: نعبُد.

دەڵێت: نعبِد.

هەر لەم ((نعبُد)) و((نعبِد))دا دەمێنینەوە، و هەر بەکەسرەش دەیلێین چونکە یەکەمین ساڵ بە هەڵە ئەزبەرییان کردووە.

* * *

هەموو ڕۆژەکە لەم بەڵایەدا دەبم، ئێوارە دێت و نە ئاوەز نەهێزم تێدا ماوە، پاشان نە من وەزارەتم ڕازی کردووە، نە سوودم بە منداڵانی موسڵمانان گەیاندووە، نەخۆم چوومە بەلای خوێندنەوە و نوسینەکانمەوە.

ئەمە کتێبخانەکەمە لە یەکەمین ساڵی مامۆستایمەوە نەچوومەتە ناوی، ئەمەش پرۆژەی نووسین و توێژینەوەکانمە کە دەیانووسم، و ئەمەش ئەو کتێبەیە کە دەینووسم لە سوچی ژوورەکەدایە، ونبووە و فەرامۆشکراوە. سەرکۆنەم دەکەن-لەدوای هەموو ئەمانەوە- کە لەم ڕۆژانەدا بەباشی نانووسم؟

وتم: سوێند بە خودا ئەمە حاڵی منیشە، سەرکۆنەت ناکەم خودا هەردووکمان ڕزگاربکات[18]!

---

[18] بەم گفتوۆیە خەیالییە عەلی تەنتاوی باسی ژیانی خۆی کردووە لەو کاتەدا، پرسیارکەر و وەڵام دەرەوە خۆیەتی. وەرگێڕ



# بەرەو حەڵبوون

١٩٣١ بڵاوکراوەتەوە

داوات لێکردبووم باسی گەشتەکەی حەڵبوونت بۆ بکەم. سوێند بە خودا سەرسام نەبووم بە پرسیارەکەت بەڵکوو سەرسام بووم بە ناونانی ئەم سەردانییە چکۆڵە بە گەشت. هاوڕێ گیان خەڵکی گەشت دەکات بۆ پاریس و لەندەن نەک بۆ حەڵبوون! خەڵکی چیرۆک دەنووسنەوە کە چێژێک یان سوودێکی تێدابێت. چیرۆکەکەی من هیچیانی تێدا نییە و شایەنی نوسینەوە نییە. بەڵام تۆ پێداگریت کرد هەر بۆیە بۆم نوسیت. نازانم دەتەوێت چی پێبکەیت؟ دەترسم بۆ خەڵکی بخوێنیتەوە یان بڵاویبکەیتەوە لە نێوانیاندا ئابڕووم ببەی پێی، نەمنووسیوە بۆ ئەوەی بڵاوبکرێتەوە یان بخوێنرێتەوە بەڵکوو لەبەر ئەوە نوسیوومە تۆ بیخوێنیتەوە و تەواو.

* * *

حوکوومەت لە حەڵبوون قوتابخانەیەکی سەرەتایی دروستکردووە لە چاوی حەڵبوونێکاندا گەورەتربوو لە زانکۆی سۆربوون لە بۆچوونی پاریسیەکاندا. یەکێک لە مامۆستا گەنجەکانی هاوڕێمانی بۆ

دەست نیشان کرابوو، ئەویش بانگهێشتی کردین بۆ ئەوەی لەگەڵیدا ببینین، بە سوپاسەوە وەڵامی داواکارییەکەیمان دایەوە.
ئێمە- هاوڕێکەم- سێ کەس بووین: مامۆستا، مەبەستم مامۆستای زانکۆی حەڵبونیەیە[19] گەنجێک بوو لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا، مەجلیس خۆش و گفت شیرین بوو، بە چەندین کاتژمێر لەگەڵیدا دابنیشیت هەست بە بێزاری ناکەیت و تەنها گوێت لە وتەی باش دەبێت.

من و..... سێیەم شاعیرێک بوو، ئەویش جێگای مەبەستە لە چیرۆکەکەدا، گومانم وایە بە وشەی ((شاعیر)) لە زۆرێک سیفات و کردەوەکانی تێدەگەیت؛ هەموو دونیا بە بیرۆکەیەکی بەدیهێنەرانە دەزانێت، یان خەیاڵێکی ناوازە، یان وێنەیەکی دڵڕفێن، باسی خۆشەویستی و جوانی، یادەوەری و خەمباریت بۆ دەکات.... وێنەی هۆگۆ و لامارتینی فەرەنسی و، بۆچوونی دانتی و لۆمبرۆزۆی ئیتالی و، حیکمەتەکانی تۆلستۆی ڕووسی و فەلسەفەکانی تاغوری هیندیت بۆ دێنێت.... ئەمانەش خۆیان هیچ زانستێکیان پێی نییە، تەنها بەرهەمی ئەو ساتەیە و شاعیرە گەنجەکە لە ئاوەزی خۆی دەریهێناوە!

* * *

[19] خردا ئەوەی بەدیهێنا، ئەمڕۆ دکتۆر حیکمە هاشم بەڕێوبەری زانکۆکەیە.

شوێنی دیدەنیمان ماڵی شاعیرەکە بوو کاتژمێر هەشت، لە کاتی خۆیدا چووین، بینیمان خەریکی شیعر نوسینە.

پەلەمان لێی کرد و زۆرمان لێی کرد، وەڵامی داینەوە و پەلەی کرد، بەڵام بە نیو کاتژمێر پۆشاکەکەی پۆشی، هۆنراوەیەکی بۆ خوێندینەوە بە یەک کاتژمێر، بە دوو کاتژمێر باسی ڕۆمانێکی بۆ کردین. نیوەڕۆ لە ماڵیان دەرچووین. وتی: دەچن بۆ کوێ؟

وتمان: بۆ لای ئۆتۆمبێلەکان.

وتی: هۆ، چەندێ دوورە؛ هێشتا پێداویستیەکانم نەکڕیووە. من نان و گۆشت و پیاز و توورم دەوێت.

وتم: منیش سەرین و دۆشەک و بەتانیم دەوێت.

وتی: بۆچی؟

وتم: دەخەوم. هەرکات تەواو بوویت هەڵمسێنە!

لێک جیابوونەوە لەسەر ئەوەی کاتژمێرێکی تر بگەینەوە بە یەک. دوای کاتژمێرێک هاتینەوە لە سوچێکی ماڵەکەیدا دانیشتبوو، بێدەنگ و خەمباربوو، لە نەفسی خۆمدا وتم: چیەتی؟ پارەکەی لەدەستداوە؟ شیعرەکانی ون کردووە ؟خەونەکانی ڕووخاون؟

لێم پرسی: پێداویستیەکانت کڕی؟

وتی: نەخێر... کارێکی ناخۆش ڕوویدا.

- چییە؟



- ئەو مریشکە داماوە لەسەربانەوە کەوتە خوارەوە قاچی شکا، دانیشتووم بە شیعرێک شیوەنی بۆ دەکەم و دەیلاوێنمەوە.
وتم: ئای لە گومڕایی ئەو کەسەی شوێنی شاعیرێک دەکەوێت! یەک کاتژمێرە سەرقاڵی ئەمەیت؟ هەستە، هەستە، پێداویستیەکانت بکڕە.

* * *

بەخێرایی بەرەو لای ئۆتۆمبێلەکان چوین ئۆتۆمبێلی گواستنەوە، ئەو ئۆتۆمبێلەی دەچوو بۆ ساڵحییە ڕۆشتبوو، دەبوو هەر سەربکەوتینایە، کەسمان توانای کرێی ئۆتۆمبێلی تایبەتمان نەبوو. من مایەپووچترین دروستکراوی خودام و شانازیش ناکەم، مامۆستاش لە زەنگینەکان نەبوو، شاعیرەکەش دووربوو لە بژاردنی دیرهەمەکانی و سەرقاڵ بوو بە بیرکردنەوە بۆ لە دەستچووە بە نرخەکەی: قاچی مریشکەکە!

ئۆتۆمبێلەکە بۆ نۆ کەس بوو، بەڵام ئەوان پانزە کەس و مەڕێکی قەڵەو و چل دار مێویان کردبووە ناوی! لە ترسی سەرما جامەکانیان داخستبوو، زیندە بە چاڵ کراین تێیدا. سەبارەت بە شاعیری گەورەمان سووربوو لەسەر ئەوەی پێش خۆمانی بخەین و لە باشترین شوێندا ((لای شۆفێرەکە))دای بنێین هەتا قەرەباڵغی شوێنەکە سەرقاڵی نەکات لەوەی چامە هەڵواسراوەکەی تەواو بکات. ئەوەشم

بیرچوو پێت بڵێم هەر سوارییەک سەبەتەیەک بۆ دووسەبەتەی پێبوو کردبوویانە کۆشیانەوە یان لە نێوان قاچیاندا دایان بوو!

ئۆتۆمبێل کەوتە ڕێ و هەڵیدەساندین و دایدەنیشاندین، کە هەڵی دەساندین گەدەمان دەهاتە قوڕگمانەوە و سەرمان دەیدا بە سەقفەکەدا، کە دایدەنیشاندین سمتمان.......کە پێچی دەکردەوە بەلای ڕاست و چەپەوە دەیبردین؛ کەس بە پێوە و بە دانیشتنەوە نابینین و، بۆنی مەڕ و سیر و پیاز ئەم کۆڕە پیرۆزەی پڕکردبوو....لەسەرووی هەمووی ئەمانەوە شۆفێرەکە دەستی کردبووە قسەکردن و دەنگێکی بەرز و ناخۆشی هەبوو.

لە کۆتاییدا بەسەلامەتی گەیشتین((یان ویستت لێبوو بە مردنی سوور))بە تل. پاشان کەوتە ڕێ- هەندێ کەسی دابەزاند- بەرەو منین. ماڵی شاعیری بەڕێز[20]، چووینە ماڵی و خۆمدا بە عەرزا، ئەوەی ئەو بەشەی لە ڕووحم ڕۆیشتووە بیگەڕێنمەوە و هەندێ هەوای پاک هەڵمژم، دوای ئەوەی یەک کاتژمێر هەوای زەمهەریری دۆزەخم هەڵدەمژی. ئەگەر ئەمە نەبوایە و، گڵاسێک ئاوی لیمۆ نەبوایە. بێگومان دەمردم.

---

[20] ماڵی ئەنوەر عەتار. وەرگێڕ

بوژامەوە و دڵخۆش بووم نموونەم بەو شیعرە هێنایەوە:

فألقت عصاها واستقر بها النوى

كما قر عينا بالإياب المسافر

ئینجا شاعیرەکە دەیوت: ئەمە چ کانیەکە؟ کانییەکەت گەرم بوو! ڕێگا ئاسانەکەت بڕیووە و ڕێگا قورسەکەت ماوە! هاوارم کرد و وتم: ئاخر بە ئۆتۆمبێل نایبڕم....بە ئۆتۆمبێل نایبڕم. تێگەیشتی؟ هەرگیز، هەرگیز..... سەر ترۆمبێل ناکەوم.

وتی: لێت دەترسم تۆزێ هێمن بەرەوە، بە سواری گوێدرێژ و ماین دەیبڕیت.

وتم: الحمدلله؛ سوێند بە خودا گوێدرێژ باشترە لەم ترۆمبێلانە!

مامۆستاکە بەخێرای چوو بۆلای تەلەفونەکە و داوای لە خەڵکی حەڵبوون کرد سێ ئەسپمان بۆ بنێرن؛ بۆ مامۆستا و میوانەکانی. شاعیرەکە لە تەلەفۆنەکە نزیک بوویەوە و، وتی: با ئەسپی عەرەبی ڕەسەنی ئامادەکراوی زین کراو بێت، خێراکەن خێراکەن.... دەی دەی...............زوو زوو.

بەڵام تەلەفۆنەکەیان بە سەریدا داخستەوە وایان زانیبوو ئەوەی دەڵێت ناوی پەرییەکانە. تووڕەبوو هاواری کرد: ئەلوو، ئەلوو، ئەلوو سەگبابانە، ئەلوو..........

وەڵامییان نەدایەوە، سووربوو لەسەر ئەوەی ئەگەر بگاتە حەڵبوون تۆڵەیان لێبکاتەوە. بەڵام من سووربووم لەسەر ئەوەی تاریفیان بکەم و ماستاوییان بۆ بکەم، بۆ ئەوەی جەستەکەم هەڵبگرنەوە ئەگەر هێسترەکە هەڵیدامە خوارەوە یان سەرم شکا یان ملم شکا.

پاشان گەڕاینەوە بۆ ماڵی شاعیرەکە لە منین.

چیت بۆ باس دەکەم؟ تۆ وتبووت بە کورتی بۆم باس بکە؟ و هاوشێوەی ئەم قسانەش دەبێت بەدرێژی باس بکرێت... بەڵام چی بکەم لە مەرجەکەت؟

کاتژمێرێک لە منینماینەوە، هەوای پاکمان هەڵمژی خراپی ئۆتۆمبێلەکە و نامۆی شاعیرەکانی لەبیر بردینەوە، لە سەکۆی ماڵەکەدا دانیشتین، کە دەیڕوانییە شیوێکی دلڕفێن، گەڵای دارەکان وەریبوو، کارێزەکانی منین دەڕژانە شیوەکە، سوڕی دەخوارد و دەڕۆیشت، شەپۆلی دەدا و کەفی دەکرد، پاشان تیشکی خۆر لێی دەدا و دیمەنێکی قەشەنگت دەبینی، وەک پەڕە پرژەی ئاڵتون لەسەر ڕاخەری ئاوریشم، شاخە بەرزەکانیش لە ئامێزی گرتووە وەک چۆن دایکێکی بەسۆز منداڵەکەی لە ئامێز دەگرێت.



وەک ئەوەی ئەم زنجیرە چیایانە تەماشام دەکەن و باسی ڕابردوو دەگێڕنەوە، تاریفی شوێنەواری ڕۆم و کۆشکەکانی غەساسەنەی بەڵخ دەکەن، کە بڵاوبۆتەوە بەسەر قەد پاڵەکانیدا، پاشان هەواڵی مەئمومان پێدەدات کە ئەم ناوەی لێرەوە ڕادەکێشت بەرەو قاسیۆن و دەیگەیەنێت بە لوتکەکەی، ئەم هەواڵانەمان بۆ دەگێڕێتەوە و، هەست دەکەین ڕۆحمان لە کۆتی زەمانە دەردەچێت، پاشان ناخی چەرخەکان تێدەپەڕێنێت و لە شێوەکانی ڕابردووی پەڕاگەندەدا سووڕدەخوات، لەم خەونەدا ڕۆدەچێت و نزیکە لێی بە ئاگا نەیەتەوە، گەر گوێبیستی قاقای ئەم چیایانە نەبوایە کە گاڵتەی لە لوتبەرزی مرۆڤەکان دێت، خۆی بەشتێکی باسکراو دەزانێت و هەوڵدەدات بە مێشکی خۆی لە بارەی هەموو شتێکەوە بدوێت لە کاتێکدا بە توانا نییە لە خۆی تێبگات، تەمەنی ئەم لەم زەمانەدا( کە پێشەوەی ڕۆیشتووە وەک ئەوەی سەرەتای نەبێت، لە دوای ئەوەشەوە دەڕوات وەک ئەوەی کۆتایی نەبێت) تەنها وەک دەنکە خۆڵێکە لە بیابانێکی سوێرەڵادا یان بچووکتر لەوە!

ئەوە چیمە بەم بیرکردنەوا ماندووت دەکەم؟ دەگەڕێمە سەر قسەکانم:

شاعیرەکە خواردنێکی بەتامی بۆ هێناین، کە لە هەموو شتێک زیاتر پێویستمان پێی هەبوو، بە یەکجار هەڵمەتێکمان بۆی برد و

ددانم بۆتیژ کرد و قۆڵمان بۆی هەڵماڵی و هێرشمان کرد، هیچی لە بەردەماندا نەمایەوە.

پاشان هەستیان بەناو منین گەڕاین، بەو ڕێگا تاکەدا ڕۆیشتین کە درێژ بۆتەوە بەقەد پاڵی شاخەکەدا هەتا دەگاتە کارێزەکە، لەسەرووی ئەوەوە پردێکی پتەو هەیە، لێوەی دەڕوانیت، ئاوێکی شیرین و زوڵاڵ دەبینیت وەک ئاوێنەیەکی ئەزەلی وایە کە خودا دایناوە بۆ ئەوەی هەست و تێڕامانەکەت وێنەبداتەوە و خەیاڵی خۆشەویستی و یادگارییە خۆشەکانی تێدا دەربکەوێت... پاشان هاتین بەرەو خۆرئاوا لە دووڕیانەکەدا وەستاین و تەماشای ڕێگای حەڵبوونمان دەکرد، چاوەڕێی ئەو ئەسپە ئامادەکراوانە و زینە ئاڵتونییەمان دەکرد کە جەنابی شاعیر داوای کردبوو.

ئینجا شاعیرەکەمان دەستی کرد بە باس کردنی ئەو بە هاوارچوونە کە لەگەڵ گەشتنیدا ڕوودەدات، پەسنی یەکەم و دووەمیانی دەکرد، بە ئەسپەکەی ڕۆشتنێک دەڕوات کەس شان لە شانی نادات و بواری ئەوە ناهێڵێتەوە کەس پێی بگات، وا و وا....هەرگیزیش سەر ئەسپ نەکەوتبوو! سەبارەت بە خۆشم دەستەوسان بوونی خۆمم زانی، ئەو دیمەنەم دەهێنایە پێش چاوی خۆم کە لەژێر قاچی ئەسپی شاعیرەکەدام و بە مردنی من ئوممەت تاکێکی لە دەست دەدات و نەدەبیش شیعرێکی لاواندنەوەی دەست دەکەوێت، گومانم



وایە هاوڕێ شاعیرەکەشمان ڕەزیلی ناکات بەرانبەرم لەمەدا لە دەمێکدا مریشکێکی دەلاواندەوە.

لە دووڕیانەکەدا وەستابووین و چاوەڕێمان دەکرد، هەر تەپ و تۆزێکمان ببینیایە دەمانوت ئەوە تەپ و تۆزی ئەوانەیە کە هاتوون بۆ پێشوازیمان، بەڵام چاوەڕوانییەکەمان درێژەی کێشا و هیچمان نەبینی جگە لە سوارییەک نەبێت لە دوورەوە، چاودێریمان کرد هەتا هاتە نزیکمانەوە لێمان پرسی: کۆمەڵێ ئەسپی ڕەسەنی زین کراوت نەدیووە؟

وتی: وەڵڵاهی لە قسەکانتان تێناگەم و، هیچم ناوێت ئەوە نەبێت مامۆستا تازەکەمانم نیشان بدەن.

وتمان: تۆ کێی خودا بتاپرێزێت و ڕێزدارت بکات؟

وتی: من پاسەوانی حەڵبوونم.

وتمان: خۆشحاڵبووین، ئەمە مامۆستا و ئێمەش......

پشتی تێکردین، خودا پشتی بشکێنێت! نەیویست بزانێت ئێمە کێین، بەڵام شاعیرەکە خۆی پێگەیاند و پێی وت: من...من...بەڵێ، من شاعیرم.

ماموستاکە تەریق بوویەوە، وتمان بەپێ دەڕۆین، منیش سوێندم لە شاعیرەکە خوارد بێت لەگەڵماندا هاوڕێیەتیمان بکات، بۆ ئەوەی بە زیندوویتی دڵنەواییمان بکات و بە مردوویی شیوەنمان بۆ بکات.

سەبارەت بە ڕێگاکە پرسیارم لە پاسەوانی حەڵبوون کرد
وتی: ڕێگا ئاسانە دوورەکە ئەمەیە و ڕێگا قورسە نزیکەکەش ئەمەیە.
وتم: ئێمە لەوکەسانەین کە حەزمان بەسەرکەوتنە.
وتی: ترسناکە.
وتم: ئێمە ئازایین.
وتی: بێزار دەبن.
وتم: جەنابی شاعیرمان لەگەڵدایە.
سوارسەری خۆم بووم و ڕەتم کردەوە ئیللا ڕێگای شاخ نەبێت، ئەوانیش بەقسەیان کردم، پاسەوانەکەش ڕازیبوو، نازانم بە هۆی قەناعەت کردن بە بەڵگەکانمەوە ڕازیبوون یان لەبێزاریدا لە قسەکانم بوو.

* * *

شاعیری بەڕێزمان سوار کرد و ئێمەش بە دوایدا ڕۆشتین، دەمەو ئێوارەبوو خەریکبوو دونیا تاریکدەبوو، بەسەر شاخەکەدا

سەرکەوتین، هەر لوتکەیەکمان دەبڕی لوتکەیەکی تری بەدوادا دەهات، هەتا شەو بەسەرماندا هات، تەماشای دوای خۆمانەوەمان کرد، منین بە ئەندازەی دیرهەمێک دەبوو، وەک ئەوە وابوو لە قولایی بیرێکدا بێت، لە پێشمانەوە و لەلای ڕاست و چەپمانەوە هێندە شاخ و تەپۆلکە هەبوون لە هەژمار نەدەهاتن، گەشتبووین بە شوێنێک لەیەک کاتدا غوتەی دیمەشق و گوندی منین و شیوی بەرەدامان دەبینی، قاسیۆنمان دەبینی وەک ئەوەی تەپۆلکەیەک بێت لە ژێرماندا بێت، پاشان تاریکی گەردوونی داپۆشی بە شێوەیەک شوێن پێیەکانی خۆمانمان نەدەبینی، پاشان ڕێمان کەوتە شیوێک و ڕێگاکەمان سەخت بوو لە پەنایدا شاخێکی بەرز هەبوو وەک دیوار، لەلای چەپیشی دۆڵێک هەبوو چاو بڕی نەدەکردە ئەوسەری، وەک ئەوەی ئەمە دۆڵی لەبیرچوونەوە بێت کە هەموو شتێک قووت دەدات.

شاعیرەکە دابەزی و بە پیادەیی ڕێی دەکرد و، هەموو کەسێک لە چاوی خۆیدا بچووک دەبویەوە، تەنانەت لە کەڵەشێر لاوازتربووین لەبەردەم شێردا.

تۆ ئەمانە دەخوێنیتەوە —لە ماڵی خۆتداییت- ئارام و دڵنیایی، ناتوانیت وێنای بکەیت، گەر لە تەمەنتدا یەکجار ڕوودایکی بەم شێوەیەت بەسەردا بهاتایە دەتزانی چ کاریگەریەک دەکاتە سەر





دەروونت؛ کەسمان توانای گۆ کردنمان نەمابوو، هەر بەردێکی گەورە یان درەختێکمان ببینیایە واماندەزانی ئەو دڕندانەیە کە گوێمان لەدەنگیانە، ورچی حەڵبوون، تۆ چوزانیت ورچی حەڵبوون چۆنە؟ هەندێ جاریش ئاوڕمان دەدایەوە تەماشامان دەکرد: ئایا شەیتان یان دڕندەیەک شوێنمان نەکەوتووە؟ قاچمان ئاوسابوو لەبەفری ئەم شاخانە. ئا لێرەدا مولحیدەکان باوەڕ بەخودا دێنن، دەزانن هیچ شتێک نییە ڕووی تێبکرێت و داوای سەلامەتی لێبکرێت خودا نەبێت.

ئەم شاخە سەختانەمان بە سێ کاتژمێر بڕی، هیچ شتێک لە ژیانمدا هێندەی ئەمە نارەحەتی نەکردووم، مردنمان بە چاوی خۆمان بینی و عیزرائیل چەند جارێک خەریکبوو ڕۆحمان بکێشێت، ڕووناکی حەڵبوونمان نەبینی هەتا دڵمان شەقی برد لە ترسدا و، قاچمان ئاوسا لەڕێ کردندا.

لێرەدا دیمەنێکمان بینی بەدبەختی و ئازارەکەی لە بیربردینەوە، بەڕاستی پێشوازی کردنێکی مەزن بوو پێشتر بۆ کەس نەکرابوو، بۆ دیدەنیمان هاتبوونە گۆڕستانی گوندەکە. دەنگی هوتافەکانیان دەگەیشتە ناو جەرگەی ئەو بیبانەی ڕزگارمانبوو لێی، لە خۆشیاندا بازیان دەدا.

بەڵام دەزانیت ئەمانە کێ بوون؟

سەگەکانی گۆڕستانەکە بوون، ئێمەیان بینی بوو گەشتوین، هاتبوون بۆمان بۆ ئەوەی پۆشاکەکانمان بدڕن و قەپمان لێبگرن.
زانیم گەیشتووین بە حەڵبوون.



# ئەو جەژنەی لەدەستمداوە و بیری دەکەم

لە ساڵی ١٩٤٦دا پەخشکراوە

ئەی ئەوانەی دڵتان بە جەژن خۆشە: گوێ لە قسەی پیاوێک دەگرن کە جەژنەکەی ونکردووە و، پێشتر چەندین جەژنی هەبووە، یان خەیاڵێکی خەمناک ئازارتان دەدات لەوکاتەی بە خەونی خۆشیەکانتاندا تێپەڕ دەبێت؟ گەر گوێ ڕادەدێرن بۆ وتەکانم سوپاستان دەکەم، گەر پشتیشم تێدەکەن ئەوا زیانم پێ ناگەیەنێت. یەکێک لە نیعمەتەکانی ڕادیۆ ئەوەیە کە قسەکەر نازانێت کێ گوێبیستی دەبێت و کێ لایدەدا و، گوێی لە ستایش کردن و زەمکردن نابێت، تەنها ئەم دەفرە دەبینێت کە قسەی بۆ دەکات، دەفرەکەش وەڵامی کەس ناداتەوە.

ئەگەر گوێبیستی قسەکانم بوون مەڵێن: ئەم پیاوە هەر باسی خۆی دەکات. هەموو ئەدیبەکان بەم شێوەیەن؛ تەنها باسی خۆیان دەکەن، کە باسی خەون و ئاواتەکانیان کرد باسی خەون و ئاواتی هەموو

خەڵکی دەکەن، وەرگێڕی هەست و خواست و زوبانی دڵ و، زایەڵەی ڕازەکانیانن، هەتا بۆ ئەوەی لەو دەمەی خوێنەر بەرهەمەکانیان دەخوێننەوە بڵێن: ئەمە چییە؟ ئەمە گوزارشت لەوە دەکات کە هەستی پێدەکەم، ئەمە بە تایبەت باسی من دەکات....تەنها بۆ ئەویش نییە، بەڵکوو پەسنە بۆ هەموو دەروونێک.

ئای ئەدیبەکان چەندێ چاکەیان بەسەر خەڵکیەوە هەیە! بەڵام خەڵکی سوپاسگوزار نین.

بەڕێزان: لە ژیانمدا یەک جەژنم هەبوو، بەڵام تێپەڕینی ڕۆژگار وێنەکەی لە دەروونمدا سڕایەوە و تەنها چەند دیمەنێکی دەبینم. جەژنی خۆمم بینیەوە لە پێڵاوێکی سووردا ڕۆژێک هەستام و لە لای فەرشەکەوە بینیم. جاران فەرشمان ڕادەخست و لەسەر زەوی دەخەوتین، بەم شێوەی ئێستا جێگای نوێن بڵاونەبوو، تەنها بۆ کەسە گەورەکانبوو. لەگەڵیدا جزداشەیەکی سووریان پێدام، هەندێ خەتی سووری تێدابوو لەسەرووی ڕەنگە سەوزەکەیەوە، لە کێڵگەی گەنم دەچوو کە ڕیزە گوڵاڵە سوورەی تێدا ڕوواوە، شەوقی دەدایەوە وەک تاجی پاشایەکی تازە، عابایەکی نەرمیش هەندێکی سوور و هەندێکی سپی بوو لێوارەکەشی ئاڵتونییەکی درەوشاوەبوو.

باوەڕم نەکرد هەموو ئەمانە بۆمن بێت، بۆ دڵنیایی پرسیم ئەوە هی منە. وتیان: هی تۆیە، ئەوە پۆشاکی جەژنە. وتم: جەژن چییە؟ وتیان جەژن؟! نازانی جەژن چییە؟ نەمناسی، وەلێ بەهۆی نیعمەتەکانییەوە قەناعەتم پێیکرد، خەیاڵم کرد میوانێکی جوانە و هاتووە بۆ شارەکەمان.

ڕۆیشتین بۆ ئەوەی جەژن ببینین، لە ڕێگاکاندا ڕێمان کرد، ڕووەکان دەم بەخەندە و ڕووخۆشبوون، وەک ئەوەی دەگەڵ پۆشاکی جوان و درەوشاوەدا پۆشاکی بەسۆزیی و ڕازاوەییان پۆشیووە، ئەو ڕۆژە -منداڵ بووم- کەسمان نەبینی بەهۆی گەمژەییەکانمانەوە یان هەڵەکانمانەوە سەر کۆنەمان بکەن، بەڵکوو هەر کەسێک لە خزمەکانمان یان کەسە نزیکەکانی باوکمم سڵاوم لێیان بکردایە پارەی مسی پاکیان دەدامێ وەک دینار دەبریسکایەوە، ڕێژەیەکی زۆر پارەم دەستکەوت کە بەنیسبەت منداڵێکی وەک منەوە سەروەتێکە وەک سەروەتی هەندێ لەو کەسە قۆرخکارانەی کە دەیانناسین، بەڵام من بە حەڵاڵی دەستمکەوت و ئەوانیش بە حەرامی، لە دەمی بێ هاوژین و سێوییەکانەوە دەریانکردووە، ساردی و سەلامەتی بوو بۆیان لە بڵێسەی جەنگی جیهانیدا، لێ لەدوایدا دەبێتە ئاگرێک لە جگەرییاندا، ژەهرێک لە گەدەیاندا و تیکەیەکی خنکێنەر لەگەرویاندا، نەفرەتێکی بەردەوام لە نەوەکانیاندا،



دۆزەخێکی هەڵگیراساویش لەقیامەتدا. چاوەڕێ بکەن- دەوڵەمەندەکانی جەنگ- لەگەڵ ئێوەدا لە چاوەڕوانکارانین!

* * *

ماڵەکەمان لە عوقەیبەبوو، یەکەمین شت کە لە جەژندا پێی گەیشتم مزگەوتی تەوبە بوو، ئەو مزگەوتە شادوومانکارەی بەردەوام کەشەکەی ملکەچی و شادوومانیت پێدەبەخشێت، ئەو ڕۆژە نەمدەزانی ملکەچی چییە و شادوومانی ڕۆح چییە، بەڵام هەستم بە خۆشییەک کرد و دەروونمی پڕکرد. چووین بۆ مزگەوتی ئەمەویی، دەنگی تەکبیری بە بەهێزی و تیژییەوە لێدەهاتە دەرەوە وەک ئەوەی گرمەی بەرەدا بێت لەلای قەڵوەزی تەکییەوە، هەستم بە حاڵێک کرد پێشتر هەستم پێی نەکردبوو، نەشمزانی چییە، هەستم بەو حەماسەتە کرد کە خوێنی موسڵمانەکان دەکوڵێنێت لەو کاتەی گوێبیستی ئەم نەشیدە ئیسلامییە دەبن، کە دوو گوێچکەی زەوی بیسەری نەشیدێک نەبووە لەم ناوازەتر و توندتر یان بەهێزتر بێت، ئەم نەشیدەی زانیم- لەدواتردا- باپیرانمان گرمەیان پێدەکرد لە قوڕگیاندا، قەڵاکان لە بەردەمیاندا دەڕمان، شوراکان دەکەوتن، دەرگای شکۆمەندییان بۆ دەکرایەوە هەتا دونیایان پێکردەوە، ئەو نەشیدەی کە مژدە پێدەری هیوا بوو کە سەربازەکانی ئیسلام کردیانە درووشمی خۆیان بۆ ئەوەی، ئەوەی بچڕاوە لە ملوانکەی شکۆمەندیمان بیلکێننەوە، کە تەوقی گەردنی زەمانەمان

پێدابوو، بۆ ئەوەی بۆ جاری دووەم بە ئاسۆکانی زەویدا بڵاوببکەنەوە، شاخ و شیوو و شار و لادێکان لەگەڵیاندا وتیانەوە.

چوومە مزگەوت و چێژێکم وەرگرت کە هەرگیز نەمبینیبوو لەو کەیفانەی ئەنجامم دەدا یان ئەو چێژانەی دڵخۆشدەبووم پێی، بینیم-نەمدەزانی- چێژی دین و دنیا کۆبۆتەوە: زۆری و ئولفەت، پۆشاکی جوان و پاکی و سیستەم، تەقوا و دڵسۆزی، دەوڵەمەندی بەخشندەی سوپاسگوزار و هەژاری جوانی خۆڕاگر، یارمەتیدان لەخێردا و، یەکسانی و پێشخستن.... مزگەوتەکە ئافرەتی لێبوو لە مەشهەد[21] کۆبووبوونەوە بە پۆشاکی سپی پۆشتەی داپۆشەرەوە، و دەست و قاچیان بەدەرەوە نەبوو، هاتبوون بۆ نوێژ.

شارەکەمان بەم شێوەیە بوو پێش ئەوەی ئەم شارستانییە نوێیەی پێ بگات، ئەو دەمە خەڵکەکەی هەمووی وشک و دواکەوتووبوون، بریا بگەڕانایەتەوە بۆ ئەو دەمە، بریا هەر دواکەوتووبوینایە لە شوێنکەوتنی خراپە و پێشی نەکەوتینایە. وشک بوینایە و ئەم شلییەمان نەزانیایە. وشک دەیگرێت و جێگیرە، بەڵام شل دەڕوات هەتا لە بەلوعەوە دێتە دەرەوە...ئێستا چارەنووسی خۆتان زانی ئەی شلەکان؟!

---

[21] مەشهەد لە ئەمەوییدا ناوە بۆ حەرەمێکی بچووک لاوەکی ، چوار مەشهەدی تێدایە لە یەکێکیاندا سەری حوسەینی تێدایە، لێرەیە نەک لە میسر، خوداش زاناترە.



پاشان ڕوومانکردە گۆڕستانی دەحداح، ژیانی ڕووبەخەندە هاتبوو تەنگی بە مردنی گرژ و مۆن هەڵچنیبوو لەسەر زەوییەکەی و لانکەی لێدەسەند، گۆڕستان، کەماڵی سامناکی و عیبرەتە، جەژن کردبووی بە شوێنی خۆشی و کەیفکردن، جۆلانێ و چەرخوفەلەکی تێدا دانرابوو، عارەبانە بچووکەکان ڕازێنرابوونەوە بە ئالای ڕەنگاوڕەنگ و جەرەس و زەنگۆڵە بەلاکانیەوە توندکرابوو، منداڵەکان بە پۆشاکە کانیان بەهارییان دەگێڕایەوە، سوور و زەرد و سەوز و زیوی و ئاڵتونی تێدابوو، خاوەنی لێوار و زێواربوو، سەر جۆلانی کەوتبوون و سوڕیدەدان، یان لەسەر کورسی چەرخوفەلەک دانیشتبوون و بەرز و نزمی دەکردنەوە، ئافرەتەکانیش لەلای ڕووبارەکە دانیشتبوون، پیاوەکانیش لای تەپۆڵکەکە کۆبووبوونەوە، لەسەر گۆڕەکانیش مۆردی سەوز هەبوون ئەوەی دەیبینی وایدەزانی لە بەهەشتێکی دڵڕفێندایە، لەلای ئەویشەوە کەژاوەی ڕازاوە و چادرگە هەبوون، فرۆشیاری نۆکی برژاو و ناوکە کولەکە و عیرقسوسیش بەناو خەڵکیدا دەڕۆیشتن بە نامۆترین شێوە هاوارییان دەکرد، پاقلە فرۆشیش ئاگرەکەی داگیرساندبوو مەنجەڵەکەی خستبووە سەر و سفرەی ڕاخستبوو، منداڵ و کچۆڵان دەوورییان دابوو، خاوەنی سندووقی دنیا سندووقەکەی دانابوو، منداڵەکانیش لەدەووریدا خڕبووبوون و تەماشایان دەکرد، گەشتیان بە شارەکاندا دەکرد و عەبلە و عەنتەری کوڕی شەدادیان دەبینی، نزیکدەبوو

لەم خەوندا ڕۆبچن و تێیدا نقووم ببن، پەردەکە دادەدرایەوە و دادەبەزینەوە ئەرزی واقیع، ئەوەی تێیدابوون ڕۆیشت وەک چۆن خەونەکان دەڕوات، هیچی بە جێنەهێشت یادەوەرییەک نەبێت کە بە ئازاری لە دەستدان دەچوو.

گۆڕستان بەم شێوەیەبوو لە یەکەمین جەژنمدا؛ ئەمە وێنەی گۆڕستان بوو لەو ڕۆژەی شەیتان فوویکرد بە شەیپوری جەنگی جیهانی یەکەمدا لە ساڵی ١٩١٤دا.

گوێگرە بەڕێزەکان ئارامبگرن و مۆڵەتم بدەن زیاتر لەسەر ئەم گۆڕستانە بوەستم. ئێوە نازانن چ پلەیەکی هەیە لە دڵمدا، ناشتوانم پێتانی بڵێم. چۆن؟ ئەری بەڕاستم دەزانن گەر پێتان بڵێم وێنەی ئەو گۆڕستانە لە وێنەی باخچەکان بەلامەوە قەشەنگترە، یادەوەرییەکانی لە یادەوەری خۆشەویستی جوانترە؟ ئەو ڕووبارە بچووکە پیسەی خۆشەویسترە لەلام لەبەردەدا و دیجلە و نیل، ئەو دارانەی شۆڕبوونەتەوە بەسەریدا گەورەترە لەلام لە سنەوبەری فالوغا و دارخورماکانی ئەعزەمییە. کورسیەکانی مەزنترە لەلام لە سیستەمی ((ئۆریان پالاس))و((شبرد))؟

لەو گۆڕستانەدا پاشماوەی دڵمی لێیە. لە دەروونمدا مێژوویەکی هەیە ئەنودری برام زۆرینەی دەزانێت. لە ئەنودر بپرسن چ کاتێک



هەڵدەسێت بە وەفابوون بەرانبەر ئەم یادەوەرییانە و بە شیعرە عەبقەرییەکانی نەمری پێدەبەخشێت؟ من ناتوانم بە جوانی نەمری پێببەخشم، ناتوانم بەو شێوەیە بەوەفابم بۆی. لێی بپرسن ئەرێ ئەو شەوانەی بیرچوو کە دەچووین بۆ سەردانی گۆڕی ئازیزانمان لە تاریکی شەودا: باوک و دایکم و دایکی و باوکی، دەگریان لەسەری و گۆڕستانەکەش چۆڵ و هێمنبوو، تەنها چاوی ئەستێرەکان دەیانبینین و هیچ کەس گوێبیستمان نەدەبوو، لە تاریکی زەمانەدا شڵەژابووین و چاوەڕێی ئەوەمان بوو ڕووناکی ئازیزانمان ببینین کە زۆر بیرییان دەکەین و دوورییان درێژەی کێشاوە، هیچ نابینین جگە لە تاریکیەکی چڕ نەبێت، دووبارە دەگەڕێینەوە و هەوڵی سوتانی ئەو حیجابە دەدەین بۆ ئەوەی شیرینی هیواکان ببینین، هیچ نابینین جگە لە تاریکی نەبێت؟..... ئەو شەوانەی کە دەهاتینەوە ئازار شەکەتی کردبووین و خەفەت وێرانی کردبووین، گوێبیستی نۆبەرەی شیعرەکانی ئەنوەر دەبووم و ئەویش بیسەری نامە سەرەتاییەکانم دەبوو، ئەو نۆبەرانەی کە خەڵکی خوێندیانەوە بینیان شێدارە بە ئەسرین و فرمێ لە خەفەت، وتیان: ئەم گەنجە چیداوە لە خەفەت، بۆچی هەر شیعری خەفەتاوی دەنوسێت؟ نەیانزانی ئەو شیعرانە دەنکەکانی لەسەر گۆڕی دایبابی هۆنیوەتەوە لە شەوە گرژەکاندا.

ئەدیبەکان چەندێ داماون؛ بەشێکی دڵیان دەهێنن بە ئەسرینی چاوەکانیان بۆ ئەوەی پەیکەری ئەدەبی لێ دروستبکەن، خەڵکیش بە گاڵتە وەریدەگرن و، بە سوکیەوە لێی دەڕوانن، بە ستەمەوە ڕەخنەی لێدەگرن، پاشان لێی بێزاردەبن وەک چۆن منداڵ لە یارییەکەی بێزاردەبێت، فڕێدەدەن، دەیشکێنن و بەدوای یارییەکی نوێدا دەگەڕێن!

ئەدیبەکان چەندێ داماون!

* * *

بەڕێزان:

لە دوای ئەوەوە زەمانە تێپەڕی و بە شارەکاندا گەشتمکرد، گەورەبووم و ڕۆژژمێر وتی ڕۆژی جەژنە، لە شارەکەی خۆم بینیم دیمەشق، لە ئەعزەمییە بینیم لە بەغداد، لە بەسرە بینیم خاوەنی کەنار و دارخورماکان، لە دارستانەکانی بەیروت و لە قاهیرەی دایکی دونیا.... وەلێ ئەو خۆشی و چێژەم نەبینی کە لە پێڵاوە سوور و عەگاڵە ئاڵتونییەکەدا هەبوو، لە عەرەبانە چارۆکە سوور و زەنگۆڵەکانیدا هەبوو، لە پۆشاکە ڕەنگاڵەکاندا هەبوو کە چیرۆکی بەهاری دەگێڕایەوە.

دونیا گۆڕاوە یان جەژنەکەم لەدەستداوە؟



ئەی خەڵکینە دونیا گۆڕاوە، یان خەڵکی خۆشی ژیانیان لە دەستداوە، لەوکاتەی وازیان لەو ژیانە پاک و بە قەناعەتە هێنا و ڕوویانکردە پیسی شارستانی ڕۆژئاوا؟

بەڕێزەکان سەیری چواردەوری خۆتان بکەن، پرسیار لەوکەسانە بکەن ئێستا پیربوونە و ڕۆڵەی ئەو سەردەمەن....لە چاوەکانیاندا فرمێسک و لە دڵیاندا حەسرەت دەبینن، یەک وەڵامیش لەسەر زاریانە: ڕەحمەتی خودا لەو ڕۆژانە بێت، ڕۆژانی کرانەوە بوو....

فێڵی سیاسەت و هەوڵدان بۆ سەرۆکایەتی، گومان لە زانستدا، سوکێتییەکانی شارستانییان نەدەزانی، ناکۆک نەدەبوون لەگەڵ بۆچوونی کۆمەڵگادا، شەڕییان نەدەکرد بۆ بەرژەوەندی حیزبی سیاسی، لە دەرگای وەزیفەیان نەدەدا، گەر فێری زانست بونایە لەبەر خودابوو نەک بڕوانامە، گەر پارەیان بویستایە لە ڕێی بازرگانییەوە بەدەستیان دەهێنا نەک لە ڕێی قۆرخکاری و بەرتیلەوە، گەر چێژ و خۆشیان بویستایە ڕوویاندەکردە ڕەبوە یان میزان یان شازریوان، سەماوەری چا و نانەبەنەی خواردن و بەرماڵی نوێژییان ڕادەخست، سینەما و مەلها و مەیخانە و یانەی دیمەشقیان نەدەزانی! مزگەوتەکانیان پڕکردبوو، قوتابخانەکانی زانست پڕبوون لە کوڕەکانیان، زاناکان پێشەوابوون؛ شوێنی زانست کەوتن بۆ قیامەت نەک دونیا، خودا دونیا و قیامەتی پێبەخشین، ماڵەکان بەهەشتی سەر زەوی بوون، ئافرەتەکانیش حۆری ئەو بەهەشتە بوون،

خۆدەرخستن و خۆڕووتکردنەوەیان نەدەزانی، کەس لە دەرەوە نەیدەبینین مەگەر بۆ کارێکی زۆر پێویست نەبێت لەم کاتەشدا لەگەڵ هاوسەر یان باوکیان دەبوون، پێشدەکەوتن و ئەویش بەدوایدا دەڕۆیشت، ماڵی خراپە و شوێنی تاوان و شوێنی غەزەبیان نەدەزانی، بە خەیاڵیاندا نەدەهات کە دونیا بە جۆرێک خراپ دەبێت دەستەی گومڕاکەری تێدا درووست دەبێت....!

ئەوان ئاوابوون و هەموو ڕۆژێکیان جەژنبوو، ئەی جەژنی ئێمە لە کوێیە؟

لەم شار و زانستەدا قازانجمان کردووە.........یان دۆڕاندوومانە؟
لەو جەنگە بپرسن زانستەکەیان چی بە بەختەوەری مرۆڤەکان کردووە؟
لە مێژوو بپرسن بە زانست و شەریعەتەکەمان چیمان کردووە.

بەڕێزەکان:
ئەمڕۆ لەبری جیزداشە قات لەبەردەکەین، لەسەر سیستەم دەخەوین، بە چەتاڵ و کەوچک دەخۆین، هەواڵی ئەمەریکا و ئەورووپا دەخوێنینەوە و لە جوگرافیا و کیمیا و سیاسەتدا قسە دەکەین، سەر ئۆتۆمبێل و فڕۆکە دەکەوین، بیسەری ڕادیۆ و بینەری سینەما دەبین. ئەمەمان قازانج کردووە، وەلێ تەقوا و پاکی و ئارامیمان



لەدەستداوە. باپیرانمان دوورتربوون لە شارستانی ئەورووپا، بەڵام لە ئێمە زیاتر لە خودا ڕازیبوون و لێوەی نزیکتر بوون، بە ڕەوشتر و دڵپاکتربوون، نهێنی پاکتر و ڕاستگۆتربوون لە مامەڵەدا، لە ئێمە ئاسوودەتربوون لە ژیاندا....

نەخێر بەڕێزەکان؛ لە جەژنەکاندا خۆشی نابینیم، ڕابردووم بۆ بگەڕێننەوە، جەژنی گۆڕستان و مزگەوتم بۆ بگەڕێننەوە چونکە بەختەوەرییم تەنها لەوەدا دەستکەوت، لەم زانست و شارستانییە ڕزگارم بکەن، من وشکم، من دواکەوتووم، دواکەوتووم، دواکەوتووم!!

بەڕێزان بمبوورن، بەم قسە شێواو و ناخۆشە جەژنەکەم لێ تێکدان. یاساکانی ئادابی کۆمەڵایەتییم لەبیرکرد و ڕۆژە سافیەکانم لێڵ کردن، لەلای ئێوە خاوەنی حەزێکی خراپ و بژاردەی هەڵەبووم، لێم مەگرن...ڕووبکەنە جەژن و خۆشی خۆتان، لێم گەڕێن بگریم- لە ڕۆژی جەژندا- بۆ ڕۆژانی ڕابردووم.

هەموو ساڵێکتان بەخێر و خۆشی بێت.



# لەبەردەم سی ساڵیدا

سەردتای ساڵی **١٩٣٩** بڵاوکراوەتەوە

ئەمڕۆ تەماشای تۆماری لە دایکبوونەکەمم کرد بینیم لەبەر دەرگای سی ساڵیدام، وازم لە کارەکەم هێنا و دانیشتم بیرمکردەوە: داخی گرانم لەم سی ساڵەدا چیم بۆ ماوەتەوە؟ هیچم بۆ نەماوەتەوە تەنها کەمێک یاداشت نەبێ پاشماوەی دڵم جەمی کردووە و سۆلاڤەکانی بڵاوبوونەتەوە بە قەدپاڵی قاسیۆن لە دیمەشق و، جۆگەکانی ئەعزەمییە لە بەغداد و، دارستانە سنۆبەرەکانی لوبنان...... و، لە ڕێگای ئەهرامەکانی میسر و، کەنارەکانی بەسرە و، باخە خورماکانی مەدینە.....سۆلاڤێک لە دڵمەوە و سۆلاڤێک... چ سودێکم بینی لە تەمەنی لەدەست چووم و لاوێتی ڕۆیشتووم؟ هیچ! نە پلەوپایە نە پارە نە منداڵ. هیچ سوودێکم نەبینی ئیللا ناوێک نەبێت لە وڵاتەکاندا بڵاوبوویەوە و بەشی خۆی وەرگرت لە ستایش کردن و زەمکردن، لە بەشکۆدانان و جوێن دان، بەڵام من لە دووری هەموو ئەمانەوە بووم هیچ شتێکیم بەرنەکەوت. ناوەکەم لە من نییە؛ درووستکراوە لە پیتەکان، بەڵام من مرۆڤێکم لە گۆشت و خوێن. ئایا بەناوبانگی تێرم دەکات، یان



ستایش کردن پۆشتەم دەکات؟ خاوەنی هیچ شتێک نەبووم تەنها دڵێک نەبێت کە زۆر خوشیویست و زۆر دڵسۆزبوو، بەڵام بەهۆی نارەحەتیەکانی خۆشەویستی و دڵسۆزی بە ماندووی کەوت، سەرێکیش پڕم کرد لە زانست و زانیاری، زانستەکەی پەکی خست لەوەی پێش بکەویت، سەر سووکە بەتاڵەکان شوێنەکەیان داگیر کرد!

بریا پێشتر بمزانیایە ژیان وەک دەریا وایە، شەپۆل دەدات و پووچەکان بەرزدەکاتەوە و، پڕکانیش دەباتە خوارەوە!

***

ئێستا بیر لەوەدەکەمەوە بە منداڵی چۆن دەمڕوانییە ئەو کەسانەی سی ساڵان، ئەوان گەنجێکی کامڵن و گەشتوونەتە لوتکەی ژیان و دڵنیایی و جێگیربونیان ناسیووە، ئێستا دەبینم لە نێوان من و ئەواندا جیاوازییەکی زۆر هەیە و وایدەبینم هەرگیز نەگەشتوومەتە سی ساڵی..... ئەوەش بەهۆی ئەوەوەیە هەموو ئەوەی دەیزانم من لە دایکبووم و چوار ساڵان بووم، دواتر چوومە قوتابخانە، هەموو ساڵێك تێیدا دەژیام بۆ ئەوەی لە تاقیکردنەوەکاندا دەربچم و پۆل بە پۆل ببڕم و چێژ لە پشوەکان وەربگرم. ئەو دەمەی خوێندنی باڵام تەواو کرد و قوتابخانە و تاقیکردنەوەم نەما وەستام و پێشنەکەوتم، ئامانجەکەمم لەدەستدا و هەستم نەدەکرد کە دەژیم. پاشان ئاوڕمدایەوە بۆ ڕابردوو بە یاداشتەکانیەوە دەژیم، وام لێهاتووە هەرساڵێک تەواو دەکەم ساڵێک دەگەڕێمەوە بۆ دواوە، هەتا

گەورەبم بچووک دەبمەوە و هەتا لە منداڵی دووربکەومەوە زیاتر لێی نزیک دەبمەوە.
کەی دەگەمە سی ساڵان، کەی بارگەی گەشتەکەم دادەنێم لەدوای ئەم گەڕانە؟

***

دڵم جەخار دایپۆشی، دەنکێ شقارتەم داگیرساند بۆ ئەوەی زۆپاکە داگیرسێنم - لە شۆکدا بووم- ئاگرەکەی کوژایەوە، پاشان دووبارە دام گیرساندەوە پاشان دەمڕوانییە ئاگرەکەی زەقەی چاوم دەهات و نقوم بوو بووم لە جیهانێکی دووری ونبوودا، هەتا هەستم بە گەرمی ئاگرەکە کرد، بە ئاگا هاتمەوە و شقارتەکەم فڕێدا، بووبە خەڵوزێکی ڕەشی لاواز کە لەگەڵ شنەبایەکدا بە هەوادا دەچێت....وتم: ئەمە ژیانە؛ ئەو جەخارەی ئەمشەو هەستم پێی کرد دەروونم دەسوتێنێت وەک چۆن ئەم ئاگرە دەستی سوتاندم، لە کۆتاییدا هەمان ئەنجامی ئەوم دەبێت. دەڕۆم وەک چۆن ئەو شقارتەیە ڕۆیشت، بەڵام من لەدوای خۆم هیچ جێناهێڵم، نە پارە، نە پلەوپایە، نە کار. چونکە من سەرقاڵبووم -داخی گرانم-بە ئەدەبەوە!

بریا تەنها خۆم بۆ ئەدەب تەرخان بکردایە و هەموو ژیانم لە هەوڵدان بۆ بژێوی نەڕۆشتایە. هیچم نەکردووە، لە سەر و دڵمدا شت

گەلێکی زۆر بوونیان هەیە، بەڵام پێنووسەکەم شکاوە و، ئامرازەکانم وشک بوون، و زوبانم بە گوریس بەستراوە، من ناتوانم بڵێم.....

ئاوازی زۆرم لەلایە و حەزدەکەم گۆرانی بچڕم، بەڵام گۆرانیەکانی دەبنە — لە تەنگیدا- هەناسەدان و لە وتارەکانمەوە دەردەچن، خەڵکی وادەزانن ئەوە هەموو ئاوازەکانمە، بەڵام ئاوازەکانم هێشتا لە سینەمدایە و هیچ مرۆڤێک گوێبیستی نەبووە. چ سودێکم پێدەگەیەنێت ئەگەر خەڵکی گوێ بیستی ببن و بێنە سەما و چەپڵەی بۆ لێدەن و منیش بە تەنیا هیوا بڕاوی و خەفەتم بۆ بمێنێتەوە؟ خەڵکی خوو ناگرن بە گۆرانیەکەوە مەگەر هیچ و پووچ بێت، دەی با گۆرانیە شیرینەکان لە سینەمدا بمێنێتەوە، بە تەنها خۆم گوێی بۆ ڕادەدێرم بەبێ ئەوەی زوبانم بجوڵێنم، چونکە زوبانم سەرقاڵە بە وانە وتنەوە.

هەموو ئەوانەی دەینووسم هەناسەیەکی خەفەتاوی و ئاماژەی ناگۆیە، ڕۆژێک دێت ئەم هەناسەیە ببێت بە گۆرانی و ئاماژەکان ببێت بە وشە و واتا؟



لە کاتێکدا ئەم هەناسە و ئاماژانە دڵدانەوەی دەروونمە، ئەم((الرسالة)) چەندێ چاکەی زۆرە لەسەرم، ئەو ئەدیبانە چەندێ

چاکەیان زۆرە بەسەرمەوە هەر ئەوان دەتوانن لەم دونیا تەنگەمدا بمگوازنەوە بۆ دونیایەکی فراوان و ڕووحم بە ئازادی تێدا بفڕێت، هاوشێوەی ڕافعی و مەعروف و زەیات! ئایا زەیات دەزانێت، یان ئایا مەعروف ئەرنائوت دەزانێت، کە من چەندین شەوم بەسەر بردووە بە دیار فرتەر و رفائیل[22] و سەیدی قوڕەیش و عومەری کوڕی خەتاب، پەنام بۆیان دەبرد و لە دەرگاکانیانم دەدا و لە بەهەشتە ئەفسوناویەکانیاندا لە پشت شوراکانەوە خۆم دەشاردەوە، ناتوانم تاریفیان بکەم تەنها بەوە نەبێت کە بڵێم دەستەوسانم لە تاریف کردنیادا؟ چ دونیایەک لەسەری مەعروفدایە، چ دونیایەک لە سینەیدایە؟ چ بەرزییەک لەم زمانەدا هەیە، زمانی مەعروف و زەیات و ڕافعی، ئەمەیە دەدرەوشێتەوە بە گەوهەر و مروارییەکەی، لە کاتێکدا زمانی کتێبەکانی ئەم سەردەمە زوبانێکی ڕزاوە و پڕە لە ناڕاستی...زوبانێکی مەزن وات لێدەکات هەست بە گەورەیی و شکۆداری بکەیت، نەک وەک ئەم زمانە لاواز و ڕووتەڵانە.

هیکل چەندێ چاکەی بەسەرمەوە هەیە، تەواوبووم لە خوێندنەوەی کتێبی((منزل الوحي)) چەندین ڕۆژ لە سەردەمی پێغەمبەردا دەژیام، بەو شوێنانەدا تێپەڕیم کە باسی دەکرد و دەروونمی پڕ کرد لە

---

[22] پاشان بۆم دەرکەوت هەموو ئەمانە هیچن، بەسوود ئەو شتەیە سوودی بۆ دوارۆژت هەبێت.



جیهانێک لە یاداشت و هیوا و ڕازەکان، بینیم خۆم هەمووی دەزانم زۆرتر لەوەی لە کتێبەکەی ((هیکل))دا بوونی هەیە.

* * *

ڕەحمەتی خودا لەو ڕۆژانەبێت! ئەوڕۆژانەی دەرگاکەم دادەخست، پاشان ڕوومدەکردە کتێبەکانم لەگەڵ زاناکان و ئەدیبەکاندا دادەنیشتم و لە قسە بێدەنگەکانیان چێژ و خۆشیم دەبینی. دەمخوێندەوە چونکە نەزانبووم بە ژیان، کە ژیانم ناسی توانای خوێندنەوە و توێژینەوەم نەما. بۆچی بخوێنمەوە؟ بۆچی فێرببم؟ بۆچی کەسێکی باش بم؟ لە کاتێکدا ژیان جەنگێکە لە دژی فێرخوازان و چاکەکاران، مرۆڤەکانیش وەک ژیان وان چونکە ڕۆڵە و خوێندکاری ئەون!

ئەریێ کەسی دووڕوو و درۆزن ژیانێکی خۆش و بەڕێزانە ناژی، کەسی ڕاستگۆی بەڕێزیش بە هەژاری و سوکێتیەوە نامرێت؟ ئەریێ خەڵکی کەسی فاڵچی بەڕاست نازانن، چونکە دەچێتە دەروونیانەوە لە دەرگای نایینەوە و، زانایەکی باشیش بە درۆ ناخەنەوە؟ ئایا ڕێگای فاڵچێتی و بانگەشەکردنی کەرامەت و ناڕاستگۆبوون لەگەڵ خەڵکیدا، بە زانینی نهێنی پیتەکانیان و ئامادەکردنی پەرییەکان و دەرکردنی پەری لە لاشەی مرۆڤەکان، لەلای زۆربەی خەڵکی پێش نەخراوە بەسەر زانستی ڕاست و ئەدەبی تەواودا؟ ئایا

ئەم دزە چێژ لە متمانەیەک وەرناگرێت کە زانایەکەی پسپۆڕ یان توێژەرێکی وردبین خەونی پێوە دەبینێت، پارەیەکی زۆری چنگ دەکەوێت و خەڵکانێکی زۆر دێنە سەردانی بۆ چاکبوونەوە؟ ئایا کەسێکی دووڕووی دەغەڵ ناگاتە بەرزترین پلەوپایە و کەسی ڕاستگۆی بەڕێزیش لە خواری خوارەوە نامێنێتەوە؟ ئایا کەسی نەزان سواری ئۆتۆمبێلی گرانبەها نابێت و نیشتەجێی کۆشکێکی گەورە نابێت و پلەیەکی بەرزی زانستی داگیرناکات؟ کەسی زاناش دەگەڕێتەوە بۆ ماڵە هیچەکەی کە هیچ کەسێک نایزانێت؟ ئایا بازاڕی خراپە ئاوەدان نییە و خەڵکی دەوریان نەداوە؟، بازاڕی چاکەش چۆڵ و خاپوور نییە؟

ئایا کەسی درۆزن کەسی بێتاوان ناگرێت؟ ئایا کەسی بەهێز زاڵ نابێت بەسەر لاوازدا؟ ئایا پارە سەرناکەوێت بەسەر زانستدا؟ بۆچی بخوێنمەوە؟ بۆچی فێربم؟ بۆچی چاک بم؟

* * *

هەستام و حساباتی خۆمم لەگەڵ ژیاندا تەواو کردبوو، سی ساڵ لە تەمەنم دۆڕاندبوو کە گوڵی تەمەن و بەهاری ژیانم بوو، هیچ شتێکیشم دەست نەکەوت!



# وێنەیەکی نووسەر بە پێنووسەکەی

لە ساڵی ١٩٣٦دا بڵاوکراوەتەوە، یەکێک لە شاعیرەکان
بە وێنەی خۆی زانیبوو کردبوویە سەردنای دیوانەکەی!

..... بە نامۆیی و دژە باوی ناسرابوو، گوێی پێنەدەدا- ئەگەر بۆچوونێکی بوتایە- خەڵکی چ دەڵێن لەبارەیەوە، قەدەغەکردنی قەدەغەکار و ئامۆژگاری ئامۆژگاریکار کاری تێنەدەکرد. ئەمەی لە دەروونی خۆیدا دەزانی و تووڕە نەدەبوو گەر تاریفیان بکردایە بە ئەمە، بەڵکوو زۆر جار گوێمان لێی دەبوو باسی دەکرد و شاناندنی دەکرد تێیدا، لە دەرخستنی شتەکانی ناخی بۆ خەڵکی چێژ و خۆشی دەبینی، وەک ئەوەی خودی خۆی بارێکی قوورس بخاتە سەر شانی.

لە دەروونیدا چەندین دژ یەکی کۆکردبۆوە: لەوکاتەی نقووم بووبوو لە دەریایی ژیانێکی نارێکدا لە تەنیایی دەترسا و ڕقی لە هێمنی بوو، سەر پشتی جەربەزەییەکان دەکەوت لە بوارەکانی ئەدەب و سیاسەتدا، لە مزگەتەکاندا وتاری دەدا و لە ڕۆژنامەکاندا گفتوگۆی دەکرد، لەوکاتەشی دڵنیادەبوو لە ژیان و ڕووی تێدەکرد،

بیرۆکەی تەسەوف زاڵ دەبوو بەسەریدا، خەمۆکی دەروونی داگیردەکرد و، دڵی پڕدەبوو لە بێئومێدی، و هەستی بەوە دەکرد پێویستە لە خەڵکی ڕابکات و حەزی بە تەنیایی دەکرد، وای لێدەهات تەنانەت حەزی بە دیداری خۆشەویسترین هاوڕێی نەدەکرد، حەزی بە ژیانێکی ئارام و هێمن دەکرد، شادوومانی خۆی لە دووان لەگەڵ دەروونیدا و موناجاتی پەروەردگاریدا دەبینییەوە.

خێراترین کەس بوو بۆ سۆعبەت و گەمەکردن، لە هەمووان زیاتر دڵتەنگ دەبوو بە کۆڕی جدیات، لە هەموویان زیاتر دوورتربوو لە بێدەنگی و شوێنکەوتنی ئەتەکێت؛ لە هەر کۆڕێکدا بێت ئیللا دەیجوڵێنێت بە قسە و ئاماژە و نوکتەکانی، پڕی دەکات لە ڕووحی خۆشی و خۆشەویستییەکی تەواو. بەڵام شەپۆلێکی خەفەت لە ناکاودا دەدات بەسەر دڵیدا لەوکاتەی زۆر بەختەوەرە و لە هەمووان زیاتر کۆڕەکانی خۆشترە، بێتاقەت و خەمبار دەبێت، بە خەڵکی ناڕەحەت دەبێت و بێزار دەبێت بە سۆعبەت و گەمەیان، وای لێدێت حەزی لە جدیات و سەرخۆییە، حەز بەتوندێتی و خۆڕاگریی دەکات، پشت دەکات لەوەی پێش چەند ساتێک تێیدا بوو؛ خەڵکی نازانن (خۆشی نازانێت) چی تووش بوو، وا لەو حاڵەوە گۆڕی بۆ ئەم حاڵە.



تاوێك دێت بەسەریدا هەست و سۆز زاڵ دەبێت بەسەریدا لە هەمووان زیاتر هەست ناسکتر دەبێت، دیمەنێکی جوانی لە دیمەنەکانی گەردوون دەبینێت، یان گوێی لە گۆرانیەکی خۆش دەبێت، یان شعرێکی ناسک دەخوێنێتەوە یان چیرۆکێکی خەمناک دەخوێنێتەوە، دڵی بۆی لێدەدات و پەلەپەل دەکات، هەستی پێدەکات و بە سووتان دەیسوتێنێت، هەستێکی ملهوڕی نادیار بەسەر دەروونیدا زاڵ دەبێت هیچ ڕێگایەک شک نابات لێوەی دەرچێت، وجوودی دێتە لەرزین وەک چۆن بورکان زەوی دێنێتە لەرزین ئەگەر دەرچەیەک نەدۆزێتەوە لێوەی دەربچێت، پێی دەڵێن کەسێکی جیاوازە...

تاوێکیش ئاوەز بەسەریدا زاڵ دەبێت گاڵتەی لە هەست و سۆز دێت، و بانگەواز بۆ ئەدەبێکی بەهێز دەکات، گاڵتەی لە خۆشەویستی دێت و بە عاشقەکان ڕادەبوێرێت، ئەو چیرۆک و شیعرانە بە کەم دەزانێت کە کەمێک پێش ئێستا دڵی دەهاتە سەما بۆی و ئەسرینی بۆ دەڕشت، ڕوو دەکاتە کاری سەرسوڕهێنەر و حەزێکی بەهێز، دەخوێنێتەوە و دەنووسێت، بەردەوام کار دەکات وەک ئامرازێک کە هەرگیز لاواز و بێهێز نابێت، پاشان لەناکاودا هەست بە ڕق لێبونی کارکردن و ڕاکردن لە خوێندنەوە و نوسین دەکات، تەمەڵییەک بەسەر ئاوەزیدا زاڵ دەبێت کە ناتوانێت هیچ کارێک ئەنجام بدات!

لە قوتابخانەی سەرەتایی کاریدەکرد، دایانبەزاندبووە ئەوێ. لە کارکردن تێیدا هیچ کۆشش و نارەحەتیەکی نەدەبینی و بە هیچ جۆرێک بیرکردنەوەی سەرقاڵ نەدەکرد، چێژی لە کات و دەروونی دەبینی وەک خۆی دەیویست. سەرقاڵی ئەدەب دەبوو وەک چێژ و خۆشییەکی هونەری، چی پێخۆشبوایە ئەوەی دەخوێندەوە، حەزی بە چی بوایە ئەوەی دەنووسی، مەیلی بەلای چی بوایە ئەوەی دەنووسی. ڕقی لەم ژیانە بوویەوە، ڕقی لەم ژیانە ڕێکخراوە بوویەوە کە ناچاری دەکات وانەیەکی دیاریکراو بە جۆرێکی دیاریکراو بڵێتەوە.

لە شوێنێکدا دەژیا فەرشی خۆشەویستی بۆ ڕاخرابوو، سەرینەکانی دڵسۆزیبوو، پۆشاکی بەختەوەرییان کردبووە بەری، لە نێوان کۆمەڵێک برادابوو کە هاوشێوەیان نەبووە لە زیرەکی و ڕاوەستاوێتییاندا، لە گوێڕایەڵی کردن بۆی و خۆشەویستی و هەوڵدان بۆ ڕازی کردنی. کۆمەڵێک هاوڕێی هەبوو دەروون پاک و ژیان پاکبوون، لە شارەکەیدا پلەیەکی هەبوو ئەوانەی لە خۆی گەورەتربوون بە ساڵ و تەمەن و زانست و پارە حەسوودییان پێی دەبرد، بێزاربوو لەم ژیانە و ڕوویکردە کۆچکردن و ئاسۆیەکی نوێ، ڕوویکردە بەغداد، وازی لە کارەکەی خۆی هێنا لە وەزارەتی



مەعاریف، بە قسەی ئامۆژگاریکاران و ڕێگرانی نەکرد لە خێزان و هاوڕێکانی.

هات بۆ بەغداد، بارگەی گەشتەکەی دانەنا هەتا تووشی خەمۆکی و بێزارییەک بوویەوە کە هۆکارەکەی نەدەزانی، هەستی دەکرد تاسەکردن و تامەزرۆبوون دڵی بێتاقەت کردووە و خوێنی لێدەچۆڕێت، یەکێک لە سۆزەکانی دای لە مێشکی تەنها یەک بیرکردنەوەی لە مێشکیدا هێڵایەوە، ئەویش حەزکردن بوو لە گەڕانەوە، گوێ ناداتە ئەوەی چی لەبارەیەوە دەڵێن و چی لەدەست چووە، لێ وەڵامی نەدایەوە هەتا هاوکاری بۆ هات لە مێشکیەوە، لە لێدانەکە چاکبوویەوە و لە هەستەکەی ڕزگاریبوو، مانەوەی پێش خست و ڕوویکردە کارکردن، ڕۆژێک بەسەریدا تێنەپەڕی هەتا گوێی لەیەکێک بوو دەڵێت:

فيم الإقامة بالزوراء؟ لاسَكَني بها، ولاناقتي فيها و لا جملي

سۆزەکەی دووبارە چالاکبویەوە، هاواری کرد بەڕووی مێشکدا: بۆچی لە زەورا دەمێنیتەوە؟ دووبارە مێشک زاڵبوویەوە و ڕۆیشت و خۆی بۆ جەنگێکی تازە ئامادەکرد.

لە بەغداد ڕێزێکیان لێی دەنا لە سەرووی ئەوەی خۆی بیری لێدەکردەوە، ناوەکەی پێش خۆی کەوتبوو، خوێنەران و سەرسام بووەکانی بەخێرایی دەووریاندا و سڵاویان لێی کرد و لە دەووری کۆبوونەوە، ڕقی لە هیچ شتێکیش نەبوو هێندەی ئەم کۆبوونەوانە،

پشتی تێدەکرن و گەمژانەترین کاری دەکرد لەم بارەدا، تەنانەت کۆبونەوەیەکی جێدەهێلا کە کەسە بەرزەکانی تێدابوو، ڕایدەکرد لێی، تەنها بۆلای ئەویش هاتبوون، بەبێ مۆڵەت وەرگرتن و پۆزش هێنانەوە جێی دەهێشتن و دەڕۆیشت بۆ ژوورەکەی و، خۆی پێ دەپاراست، بەڵام خۆی دەزانێت هیچ بێ وەفاییەک لە کارەکەیدا نییە، بەڵکوو ناچارە وابکات، هەست دەکات کەشی ئەم دانیشتنە قورسە بۆیی و خەریکە دەیخنکێنێت، وەک ئەو کەسەی لێدێت لوت و دەمی گیراوە، سەرکۆنەی دەکەن بەرگری لە خۆی ناکات و هەوڵی نکوڵی کردنی نادات، دان بە لاوازی و دەستەوسان بوونیدا دەنێت.

ئەو ناتوانێت ناوەکەی خۆی هەڵبگرێت، ناتوانێت بە ڕوو و جەستە ئەم سەرسامبوونە وەربگرێت، ئەوان واگومان دەبەن ئاراستەی کەسێکی تری دەکەن کە لە((الرسالة))دا بابەتەکانی بلاودەکاتەوە، وەک ئەوەی دوو کەسایەتی هەبێت، ئەمەیان پێی دەخوات و دەخواتەوە و پێی دەڕوات و پێدەکەنێت و سۆعبەت دەکات جگە لەو کەسەی بیری پێدەکاتەوە و دەنووسێت، هیچ هۆکارێک نایانبەستێت بەیەکەوە. ئەوەی جێی سەرسامییە ئەو نارەحەت دەبێت بە قسەکردن لەو جۆرە دانیشتنانە و سڵی لێدەکاتەوە، هەر کە سەرەتا دەیبینی وادەزانیت کەسێکی نەزانە و ڕەوانبێژ و زمانپاراو نییە، بەڵام ئەگەر پەیوەندیت پێوەکرد و دەزووەکەت بەست بە دەزووەکەیەوە

دەبینیت قسەزان و زمانپاراوە، ئەگەر تێکەڵی بووی و نهێنیەکانیت زانی دەبینیت سڵ لە هیچ هەڵوێستێک ناکاتە جا پلەکەی هەرچییەک بێت........



ئاواتە خوازبوو چێژ لە وتنەوە وانەی ئەدەبدا بدۆزێتەوە، ئەزموونی کرد و لێی بێزاربوو، زانی سەرقاڵبوون بە ئەدەبەوە بۆ چێژ وەرگرتن لەگەڵ ئەم سیستەمە بەردەوامەدا ڕێناکەوێت. ئەو بەیانی دەکاتەوە و بیرکردنەوەیەک لە مێشکیدایە، دەیەوێت بابەتێکی لەسەر بنوسێت، کاتی قوتابخانە دێت، دەڕوات بۆ قوتابخانە و بیرکردنەوەکەش بەڕێگای خۆیدا دەڕوات، یان بەیانی دەکاتەوە ڕقی لە قسەکردنە و حەزی لە بێدەنگییە، حەزدەکات بیربکاتەوە و خەون ببینێت و تێیدا نقوم بێت، دەبینێت پێویستە پێنج بۆ شەش کاتژمێر قسە بکات، نووسەرێک یان شاعیرێکی خۆشدەوێت و حەزی پێیەتی، پرۆگرامی خوێندن ناچاری دەکات ژیاننامەی شاعیرێک بخوێنێت کە خۆشی ناوێت و لە ئەدەبیاتی تێ ناگات، خوێندکارەکانی ناچاری دەکەن درێژە بە قسەکانی بدات لە کاتێکدا بابەتەکە پێویستی بە قسەی کەمە، یان داوای لێدەکەن کەم قسەبکات بابەتەکەش قسەی زۆری دەوێت، یان لێی تێناگەن و دەگەڵیدا نایەن، لە ئاسمانی چێژی ئەدەبییەوە دێتە خوارەوە بۆ ئەوەی دەگەڵ تێگەشتن و ئاوەزیاندا بڕوات!

* * *

ئەو پیاوێکی تەبیعەت نامۆیە، هەستەکانی دژ یەکن؛ تامەزرۆی شارەکەیەتی، گەر بگەڕێتەوە پەشیمان دەبێت، گەر بمێنێتەوە تامەزرۆبوون دەیبزوێنێت، گەر پەنا ببات بۆ ئاوەزی، هەستی دەجولێت، گەر شوێنی هەست وسۆزی بکەوێت ئاوەزی ڕەتیدەکاتەوە...

کەس لێی تێناگات، خۆشی لەخۆی تێناگات....ئەو ئەدیبە!

* * *



1:18 AM

# هەناسەیەکی بەفیڕۆ چوو

له سالی ۱۹٤۰دا بلاوکراوەتەوە

بۆ فلانە هاوڕێم:

ئێستا لە بالکۆنەکەوە لەسەرووی پێنج جادەکەوەوە کە بەرزییەکەی دووسەد مەترە دەڕوانمە دیمەشق، هەموو دیمەشق دەبینم وەک لەپی دەست، نیوە شەوە و میوانەکان ڕۆشتوونەتەوە، دوای ئەوەی شەوێکی نموونەییان زیندوو کردەوە لە ماڵماندا، گەردوون بێدەنگ بووە و شکۆمەندی پۆشیوە، منیش بە تەنیا دانیشتووم و بیردەکەمەوە، بیر لەو دیمەشقە ناکەمەوە کە بیرت دەکرد و یادگارییەکانی تامەزرۆیان کردبوویت، ئەو دیمەشقەی هەر زوو بەهار پێی گەیی و غوتەی گەشایەوە و کەشەکەی پڕکرد لە بۆنی خۆش، بیری لێناکەمەوە چونکە ئێستا دڵم ناکرێتەوە بۆ هەست کردن بە جوانی، قوڕگم چالاک نابێت بۆ پەسنی بەهار و، شوێنی شیعر لە دەروونمدا وشک و چۆڵە، چۆن قوڕگم وشک نابێت و چڵی شیعر لەدەروونمدا وشک نابێت، هاتوومەتەوە بۆ دیمەشق بەهۆی زۆر تامەزرۆبوونم و بیرکردنییەوە، کەسانێکی بەڕێزم لە عێراق بەجێهێشتووە، وڵاتێکی پاک و گەلێکی زیندوو، ئاڵایان هەڵگرتووە و دەشەکێتەوە، پێش



دەکەون بۆ کۆکردنەوەی ئەوەی پەرتەوازەبووە، کۆکردنەوەی عەرەبی پەرتەوازەبوو، یەکخستنی گەلان و گەڕانەوەی سەربەرزی و شکۆمەندی، برایەتی بکەن لەنێوانی عەرەبدا لە شاری و دەشتەکییان...... هەموو ئەوانەم بە جێهێشتووە و گەڕامەتەوە بۆ شاری یەکەمم(بریا بەغداد شاری یەکەمم بوایە) هیچم نەبینی لە دیمەشق نکوڵی کردن و ئازاردان نەبێت، هیچم نەبینی ئەوە نەبێت کە خراپە و ئازارم دەدات.

بەڵام ئایا مرۆڤ سکاڵا لە دەستی شارەکەی دەکات؟
ئایا بەدەستی خۆی ماڵی خۆی وێران دەکات؟

ئەگەر قسەبکەم حەسوودەکان دەڵێن: سەرکەشی کرد و ستەمی کرد، ئەگەر بێدەنگ بم جوێنەدەرەکان دەڵێن: ڕازی بوو یان دەستەوسان بوو! دڵیش بەبێ دەنگی دەشکێت، سینەش بەبێ دەنگی دەتەقێت، قسەش.... ئایا دروستە بۆم قسە بکەم؟

خۆزگە هەر دوور بوومایە لە شارەکەم قەناعەتم بەو وێنە شیرینە هەبوایە کە لەڕێگای خەیاڵەکانمەوە دەمبینی. ئامەزرۆبوونێکی شێتانە کە ئیلهامی لە ئاسەکردنێکی زۆردارەوە وەردەگرت!
خۆزگە.....((خۆزگە)) سوود بەهیچ شتێک دەگەیەنێت؟



خاوەن دەسەڵاتەکان نابینا بوون لە بینینی ئەدەب و زانست و ئەو شتانەی بڵاوەکردۆتەوە لە کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا، بەلایەنی کەمەوە سێ هەزار لاپەڕە دەبێت، وای دابنێ قسانێکی ڕێکخراوی تێدایە هیچ مانایەکی تێدا نییە بەڵام لە نووسینەوە و ڕێکخستنیدا ماندووبوومە، چۆن و لە کاتێکدا هەموویان بەرهەمی تێرامانێکی درێژن، ئەنجامی ماندوبوونی ڕازەکانم و گوشینی ناوەزمە، هیچ شتێکی تێدا نییە دزی بێتم لە ئەدیبێک لە ئەدیبەکانی فەرەنسا و ئینگلتەرا! دەسەڵات لە ناست هەموو ئەمانە نابینابوون و دادپەروەر نەبوون لەو کاغەزەی کە ئەوان لە ماڵی بێگانەکانەوە هێناویانە شایەتیان بۆ دەدات کە هەرکەسێک لەوێ نیشتەجێ بێت لە عەرەبی تێدەگات و شایەنی ئەوەن و دەتوانن بیلێنەوە....منیان تەنها بە شایستەی ئەوە زانی کە ((مامۆستا... بم))

ئایا ستەم و دەستدرێژیم کردووە ئەگەر ئەوەی توشم بووە ئاشکرای بکەم و بۆ خوێنەرانی باس بکەم، ئەوان هاوڕێی منن، هیچ هاوڕێیەکم بۆ نەماوە جگە لە ئەوان؟ هیچ هاوڕێیەکم نەماوە لەم ژیانەدا....تۆ ئەمە دەزانیت، بەڵام سکاڵای حاڵی خۆم ناکەم!

ئەوان دەڵێن من عینادم، گێرەشێوێنم، کێشەکان دەجوڵێنم.......بۆ هەموو ئەمانە تەنها یەک واتا تێدەگەم، ئەویش ئەوەیە من

ڕاستگۆیی دەجوڵێنم و ئاشکرای دەکەم، شتێک ناڵێم و ئەنجامی نادەم هەتا دڵنیا نەبم ئەوە هەقە.

ئایا تاوانە بەرگریم لە باشیەکان کردووە کە تۆمەتبار دەکرێت، بەرگریم لە ڕەوشتی بەرزکردووە کە سوکایەتی پێدەکرێت، خەباتم بۆیکرد و بۆی جەنگام، بە خوێندکارەکانم وتووە: خەباتی بۆبکەن و لە پێناویدا بجەنگێن؟ ئایا تاوانبارم بۆ محەممەد توڕەبووم، لەوەی کەسێکی نەزانی هەڵخەڵەتێنراو نکوڵی پەیامبەرێتی و پەیامەکەی بکات، لە ئاهەنگێکدا کە سازدرابوو بۆ ڕێزلێنانی محەممەد و بەرزڕاگرتنی یادی؟
ئایا تاوانبارم ئەگەر بە تاریکی شەو نەڵێم: تۆ ڕووناک و پرشنگداریت، بە نابینا نەڵێم: ماشەڵڵا چاوەکانت قەشەنگن؟

ئەمە تاوانی منە کە بەهۆیەوە باشترین هاوڕێکانم لەدەستدا و، دژایەتی سەرۆکەکانم بەدەستهێنا و، دوژمنایەتی نەزانەکانم بردەوە و لە گەورە گێرەشێوێنەکان هەژمارکرام.

***

نزیک بەرەبەیانە و ڕووناکی شار کوژاوەتەوە، دووکاتژمێرە بیر دەکەمەوە، هەموو شتێکی چواردەرووم وەستاو و مردووە، وەک ژیانم! چەندین ساڵە خاڵییە، هیچ شتێکی جوڵاوی تێدا نییە...لە خەوندا

دەژیم، بەردەوام چاوەڕێی ئەو ڕووداوە دەکەم کە ژیانە وەستاوەکەم دەجولێنێت و کارامەییە خامۆشەکانم ڕۆشن دەکاتەوە و پاڵنەرم دەبێت بۆ کارکردن، بەڵام دەمێکە چاوەڕێم و هێندەی نەماوە لە چاوەڕوانی بێئومێدبم.

تۆ سەرنجم ڕادەکێشیت بە ئەو ناوبانگەی هەمە و بە ئەو پلەوپایەیەی بەدەستم هێناوە، لەوەیە لەوەدا دڵدانەوەیەک هەبێت بۆم ئەگەر هەستم پێی بکردایە یان دەستم لێی بدایە، سوێند بە خودا هەستی پێناکەم، من وەک گۆرانیبێژێکم کە نابیست و نابینایە، خەڵکی کەیف خۆشدەکات و چەپڵەی بۆ لێدەدەن و هوتافی بۆ دەکێشن، لێ نابیستێت و نایبینێت، بە خەمبارییەوە دەڕوات و وادەزانێت دۆڕاوە و خراپبووە!

خەڵکی شارەکەم نکوڵی هەموو شتێکم لێدەکەن تەنانەت ئەدەبیش! دوێنێ وتارێکم خوێندەوە، نووسەرەکەی لێدانێکی کوێرانە لێی داوە، ئەدیبانەکانی دیمەشق باس دەکات یان ئەوانەی خۆی بە ئەدیبیان دەزانێت، هەموو فەرمانبەرێکی باس کردووە کە فەرمانبەرن لە وەزارەتی ڕۆشنبیری یان خوێندکارن لە ئەورووپا، هەموو مامۆستایەکی مێژوو و جوگرافیاش! بەڵام باسی عەلی تەنتاوی و سەعید ئەفغانی ناکات، لەمە نەزانی تر و نکوڵی کردنت بیستووە؟

ئەمە حاڵی ئێمەیە لەو دیمەشقەی کە لە هەندەرەوە بیرمان دەکرد. شەوانمان زیندوودەکردەوە بە بیرکردنەوە لێی. وێنەکەیمان دەبینی لە ئاسۆدا لەلای پردی زەمانێک یان لوتکەی ئەهرامەکان. بێداردەبووین لەگەڵ ئەستێرەکاندا و بیرمان لێی دەکردەوە. ڕۆژەکانمان دەژمارد بۆ گەیشتن پێی. دیمەشق وەک پشیلەی لێهاتووە-لە خۆشەویستیدا- منداڵەکانی دەخوات!

لەڕێی پۆستەوە کۆمەڵێک پەیامی زۆرم بۆ هاتووە لەلایەن ئەوانەی دەیناسم و نایانناسم. لێم دەپرسن: لەم ڕۆژانەدا بۆچی بابەت نانووسیت لە ڕیسالەدا؟ لەم نامەدا دڵنەوایی خۆمم بینییەوە. سوپاسیانم کرد. لە کاتی خوێندنەوەیاندا خەیاڵم کرد لەم دونیایەدا کەسانێک هەن بیرم لێدەکەنەوە و نووسراوەکانم دەخوێننەوە، لێ وەڵامی هیچیانم نەدایەوە.بەچی وەڵامییان بدەمەوە؟ چۆن پێیان بڵێم دیمەشق ڕووحی ئەدەبی لە دەروونمدا کوشتووە؟
چۆن سکاڵا بکەم لە دیمەشق کە خۆشمدەوێت؟ چۆن زەمی بکەم لەسەر کارەکەی؟

* * *

لە سی ساڵ تەمەن تەنها یەک شتم بۆ دەرچووە. ئەویش ئەوەیە ژیانم بینی وەک سفرەی قومار وایە؛ لە خەڵکیدا هەیە سامانەکەی لەدەست دەدات و دێتە دەرەوە و فوو لە لەپی دەکات، هەیانە بەبارێکی گرانەوە لێی دەردەچێت بەو سامانەی لە خەڵکی تری



بردۆتەوە، هەیانە لە ڕێگادا دادەنیشێت و پێڵاو بۆیاخ دەکات، هەیانە پێڵاوەکەی درێژدەکات بۆ ئەوەی بۆی بۆیاخ بکەن، هەیانە لەسەر جێگایەکی خۆش دەخەوێت، هەیانە لە شەقامەکاندا بێدار دەبێت پاسەوانی ئەو کەسانە دەکات کە خەوتوون، هەیانە نۆ بەدەست دێنێت بەبێ کارکردن، هەیانە ماندوو دەبێت و تێدەکۆشێت ناگات بە یەک، زانا ملکەچە بۆ نەزان، نەزان سەرۆکی زانایە، بینیم پارە و زانست و ڕەوشت و بڕوانامە پشک و دیارییە؛ هەندێ زەنگین زانستیان نییە و هەندێ زانا سامانی نییە، خاوەنی بڕوانامە زانستی نییە، خاوەنی زانست بڕوانامەی نییە، هەندێ ڕەوشت بەرز هیچیان نییە، خاوەنی هەموو شتێک ڕەوشتی نییە، مامۆستام بینی لە سەرۆکی زانکۆ زیرەکتربوو، فەرمانبەرم بینی زۆر لە وەزیر باشتربوو، لێ بەخت کوێرە، یان لە دانایی و کاربەجێی پەروەردگارە و تەنها خۆی نهێنیەکەی دەزانێت، تاقیکردووینەتەوە بەشاردنەوەی بۆ ئەوەی ببینێت: ڕازی یان نا؟

کەواتە ڕۆژەکانی ژیانم لەدەست نەداوە لە قوتابخانەی ژیاندا کە هەموو ئەم شتانە فێربووم بە سی ساڵ!



وا بانگی بەیانی دەدات و بێدارم، منارەکانی دیمەشق ڕووناکبوونەوە کە لە هەژمار نایەن، لە سەرانسەری وجوددا دەنگی بانگبێژان دەنگی دایەوە بە دەنگێکی پاک و پاراو:

الله أكبر.... الله أكبر

خودا لە هەموو شتێک گەورەترە، پەروەردگارا سکاڵای خۆم دەگەیەنمە لای تۆ.

پەروەردگارا دەستم لە دەستی خەڵکی بۆتەوە، تەنها داوای یەک شتت لێدەکەم: لە خۆتم دانەبڕێنیت، ڕێنوێنیم بکەیت بەرەو لای خۆت، هەتا لەژێر چاودێریی تۆدا شادوومانی دونیا و بەختەوەری دوارۆژ بەدەست بهێنم.

* * *



# هەناسەیەکی تر

لە ساڵی ١٩٤٠دا بڵاوکراوەتەوە

یادەوەرییەکان بەسەرمدا دادەبارین. کتێبەکەم دانا و ڕووەکردە ڕابردوو، لە باخچە وشکەکەیدا بەدوای گوڵێکدا دەگەڕام بای بەهێزی زستان و بەفر و بارانەکەی ونیان کردووە، لەلای بەردێکدا خۆی شاردۆتەوە یان لە پەنای دیوارێکدا. دەبێتە وێنەیەکی بەهاری گوزەراوو.... هیچم نەبینییەوە ئیللا ڕوفاتی ئەو گەڵایانە نەبێت کە سەوز و گەشاوە بوون، هەیکەلی درەخت ڕووتەکان نەبێت کە لە بەهاردا پۆشاکی ئاوریشمیان پۆشیبوو، مردن دابەزیبووە سەریان و سەرمایەکی بەهێز لێی دابوون. ڕووم وەچەرخان بەرەو داهاتوو، تەنها تاریکم لە دوای تاریکی بەدیکرد. بینیم ئێستام مەنگە مەنگ بوونی فەنا. بێدەنگە بێدەنگبوونی عەدەم؛ دڵم تەنگ بوو نقومی کردم لە دەریا پڕەکەیدا. بەدوای هاوڕێیەکدا دەگەڕام دەستم بگرێت، هاوڕێیەک سکاڵای خەم و حاڵمی لەلا بکەم. هیچ هاوڕێیەکم نەدۆزییەوە تەنها خوێنەرانم نەبێت؛ ئەوان هاوڕێی منن کە نایانناسم و هیچ سودێکیان لێوەرناگرم. باوەڕم وایە ئەوان بەسۆز دەبن بۆم و بەشداری ناکەن لەگەڵ ئەو حەسوودانەی بە

حەسوودییەکەیان ئازارییان دام، بۆم نووسین و باسی سکالاکەم دەکەم و یاداشتەکانمیان بۆ دەگێڕمەوە. لەوەیە ئەو خوێنەرانە بە قسەکانم دڵیان تەنگ بێت و پشتی تێ بکەن و قورس بێت لەسەریان، لەوەیە باوەڕبوونم بەوەی هاوڕێی منن خەیاڵێک بێت لە خەیاڵەکان، لێ من حەزناکەم ئەم خەیاڵە بەکەم بزانم و باوەڕم بە پووچێتی هەبێت، چونکە لە ژیانی هەقیقەتدا پێوەی دەژیم.

کێ وەکو من نامۆیە لە شارەکەیدا کە نیوەیان دەناسێت و دوو لەسەر سێیان دەیناسن، لە شارێکی قەرەباڵغ بە خەڵکی بە تەنیا ڕێدەکات وەک ئەوەی لە سارادا بێت، دەگات بە چەند کەسێک کە ژمارەیان لە پەنجەکانی هەردوو دەست تێپەڕ ناکات. سووڕدەخوات لەم بازنە بەتاڵەدا، هیچ دەرچە و ڕزگارکەرێکی نییە. ژیانی خاڵی بووە لە خۆشی و خەفەت، وەک ئاوێکی بۆگەنی لێهاتووە نە شەپۆل دەدات نە با دەیجوڵێنێت....کێ خوازیارە ئەوشتە بدۆزێتەوە کە سەرقاڵی دەکات و وەستاوییەکانی دەجوڵێنێت، ئەوشتەی پاڵنەری دەبێت بۆ بیرکردنەوە و کارکردن، ئەگەرچی بەڵایەک یان سوتانێک بێت، یان شاربەدەرکردن یان زیندانی کردن بێت.... کێ بەیانی دەکاتەوە و نازانێت ئەمڕۆ چی بکات و چۆن ئەمڕۆژە تەواو بکات، شەو دەکاتەوە و نازانێت ئەمشەو چی بکات و چۆن ئەمشەو بخەوێت....کێ هەست بە دژواری بیرکردنەوەکانی دەکات لەسەر شانی بەڵام هیچ ڕێگایەکی نییە بۆ بڵاوکردنەوەیان،



دەبینێت کاتی زۆرە و هێزی هەیە بەڵام نازانێت کاتەکەی ببەخشێت بەچی و لە چیدا هێزەکەی خەرج بکات...کێ وەک من دوورەپەرێزە، نە بێ پێویستە لە ژیان نە ڕادەکات لە جەنگەکانی، بەڵام بێئومێد بووە لە ڕۆژەکانی داهاتووی و بێهیوایە لە خێرەکانی، بە تەنیا بۆتەوە لەگەڵ یادەوەرییەکانی و خۆیی پێ چارەدەکات و ڕێزی لێدەنێت، قسەی لەگەڵ دەکات و چرپەی بۆ دەکات. لە خەیاڵەکانی ڕابردوودا دەژی چونکە دەستەوسان بووە لە ژیانکردن لە هەقیقەتی ئێستای.... کێ وەک من سکاڵای هەژاری پارە و دەروونی ناکات، بەڵکوو هەژاری لە کاردا، کێ هێندە سامانی هەیە بەشی ئەمڕۆ و پێداویستیەکانی دەکات، لێ نازانێت بەیانی چ دەبێت، کێ سکاڵاکەی ڕۆچوونە لە هەست کردن و نکوڵی کردنی خەڵکییە، سکاڵای ئەوە دەکات دونیا نارەسەن پێش دەخات و بەڕێز و بەخشندە دوادەخات، دونیایەک هەموو شتێکی تێدا خراپبووە هەتا ژێرەکانیشی چاوەڕێی قیامەتن............

هەریەکێک حاڵی ئاوا بێت هەستی بە هەقیقەتی حاڵم کردووە و لە کرۆکی نووسینەکەم تێگەیشتووە، لەگەڵ لۆمەکاراندا لۆمەی نەکردووم و لە دژم نەبووە لەگەڵ دوژمنە حەسوودەکانم.



چەندین خەڵکی پێم دەڵێت: بۆ ڕابردوو لە یادناکەیت و پشوو نادەیت لە یادەوەرییەکانی؟ ئایا واز لە داهاتوو دێنیت و تیرامان لێی وەلا دەنێیت؟ ئەی نازانیت ئەوەی گوزەشت گوزەشت و ئەوەی دێت پەنهانە، ئەو کاتەت هەیە کە ئێستا تێیدا دەژیت؟ دەڵێم: بەڵێ، هەموو ئەمانە دەزانم، بەڵام چ ڕێگایەک هەیە بۆ بیرچوونەوە؟

گەر هەموو شتێک لەبیربکەم چۆن ئەو ڕۆژانە لەبیردەکەم کە باڵندەیەکی باڵکراو نەبووم تێیدا، ئەو چڵە نەبووم توندەبا بمشکێنێت، بەڵکوو ڕووبەڕووی توندەبا دەبوومەوە و پشتم دابووە دارێکی پتەوەوە، قەدی داربەڕوویەکی چەسپاو، بە دوو باڵی بەهێزەوە بە سەریدا دەفڕیم .... زەمانە قەد و باڵی شکاندم، ئەوکاتەی دایکمم لە دەستدا، وایلێکردم ببمە ئامانجی توندباکان، وای لێکردم وەک پەڕێک بم لە دۆخێکدا جێگیر نەبم بەهۆی ڕاڕای و ترس و بیم و چەڵەمەوە!

چۆن لە بیری دەکەم گەر باوکم بژیایە، زانای ڕێنوێنی کار و خاوەن پلەی بەرز، مردن بە گەنجی نەیبردایەتەوە، دەیپاراستین لە فێڵەکانی ژیان و لە ژێر سایەیدا گەشەمان دەکرد وەک چۆن چڵێکی نەرم گەشە دەکات لە ناوەڕاستی دارێکی گەورەی پتەودا، ناچارنەدەبووین ڕووبەڕووی ژیان ببینەوە و ئەزموونی مەینەتیەکانی بکەین، لە کاتێکدا ئێمە چەند لاوێکی دڵپاک بووین، بێتاوان

بووین، نە دەماینەوە هەتا پیس ببین بە چەپەڵیەکانی فێڵ و پلاندانان، فێری بنەماکانی ژیان ببین وەک چۆن منداڵێکی هەڵەکار بنەماکانی هونەری تاوانکردن فێر دەبێت لە یەکەم زیندانی کردنیدا، لێی دەرناچێت هەتا بەکالۆریا نەهێنێت لە تاوانکاریدا؟!
چۆن ئەو پارچانە لە بیرەدەکەم لە دڵ و جەرگم لێکرانەوە لە زەوی فراوانی خودادا، کە گوێ ناداتە نەرمی سۆزەکان و پەیمانی دڵەکان ناپارێزێت، لە قەدپاڵی قاسیۆنی خۆشەویست، لە غوتەی دەوڵەمەنددا....

لە جەنگەڵەکانی بەیروت کە سۆنبەرەکانی دەدات لە ئاسمان، بە ڕووتی هاتونەتە دەرەوە و تەماشای ئاوی ڕووبارەکە دەکەن بە چاوانێک کە وەک ئاوەکە شینە. نهێنیەکانی هێندەی قوڵی ڕووبارەکەیە.....ئەو جەنگەڵە، لە ژێر هەموو دارێکیدا یادگارییەکم هەیە کە تەنها خودا و دڵم دەیزانن، ئەو دڵەی ڕۆیشت و کۆچی کرد....خۆم نەڕۆیشتم و کۆچم نەکرد، هیچ نهێنیەکیم پەخش نەکرد و بڵاومنەکردەوە!

لە ڕێگای صەیدا چەندێ سۆزم دانا و ماڵئاوایم لە یادگارییەکان کرد؟ پرسیار لە خوێندکارەکانم بکەن خوێندکارانی کۆلیژی شەریعە لە بەیروت: ئایا ئەو ڕێگایە گەواهیمان بۆ نادات ئێمە باشترین هاوڕێ بووینە کە پێیدا تێپەڕیوین، دڵەکانیان

کردنم لە گەڕانەوەم بۆ میسر و ژیان کردن تێیدا؛ میسربوو هەنگاوەکانی ڕاستکردمەوە لە ڕێگای نەدەبدا، ئەو فێری کردم، وڵاتی خێزانەکەمە، ئەو وای لێکردم -پێش دوانزە ساڵ- بنووسم و لە بەرێزترین گۆڤارەکاندا بابەت بڵاوبکەمەوە، لەوکاتەی ئەم بەڕێزانە لە خوێندکارەکانی (شێخ مارسیه) لەسەر کورسی قوتابخانەی سەرەتایی بوون!

ئایا جێی سەرسامی نییە من - لەگەڵ خۆشەویستیم بۆ میسر- لەلای هەندێ مامۆستای میسری لە عێراق دوژمنی ژمارە یەکی میسرییەکان بووم؟ خودا لەو هاوڕێیانەمان ببوورێت و لێیان خۆشبێت لەو فێڵ و پلانەنەی لەدژی مندا گێڕاویانە، لە منیش خۆشبێت لەسەر ئەوەی ئازارمداون بە زمانە ئابڕووبەرەکەم.

چۆن لە بیری دەکەم چەندێ چاکەم بۆ دەروونی خۆم لەدەستداوە، لەو دەرفەتانەی هاتۆتە بەردەستم و نەمقۆستەتەوە؟

لە هاوڕێکانم لە کۆلێژی ماف هەیانە ئێستا لە گەورە پارێزەرەکانە و ڕاوێژی پێ دەکرێت، لە یەک وەستانی لە دادگادا تەنها سەد جونییەی میسری داماو وەردەگرێت، بۆچی پشتم لە پارێزەری کرد و ڕوومکردە پیشەیەک کە پێنج جونیە وەردەگرم لەسەر سەد وانە بۆ



چل خوێندکار، بێدەنگ کردن و جڵەوگرتنیان پێویستی بە دوو پۆلیسی پڕ چەکە؟!

لە هاوڕێکانی ناوەندیم هەیانە ئێستا بەڕێوەبەری ناوەندییەکی گەورەیە، منیش مامۆستام، بۆچی مافم خوێند ئەگەر وەزارەت دان نانێت بە نرخی پیاوەکاندا بەو بڕوانامانە نەبێت کە بەدەستیان هێناوە، خاوەنی لیسانس لە مافدا لەلای ئەو بە ئەدیب هەژمار ناکرێت گەرچی شەوقی سەردەمی خۆشی بێت، خاوەنی لیسانس لە ئەدەبدا ئەدیبە ئەگەر چی بێ ئاگاترین کەسیش بێت و لە نەفام نەفامتر بێت؟!

چۆن بیرم دەچێت کە من ماوەی دە ساڵ پێشڕەوی هەموو خوێندکارەکانی دیمەشقم دەکرد و جەربەزەییم پێدەکردن لە گۆڕەپانی سیاسەتدا، گەر ویستم لێبوایە دەمێکبوو بووبووم بە پەرلەمانتار؟ خەڵکی ئەمەیان لەبیر نەکردوە من چۆن لەبیری دەکەم؟ ئەوان دەزانن لە پۆشاکەکەمدا وتاربێژێک هەیە هیچ کەسێک نییە لەبەری هەڵنەسێت لە ڕووی گەوردانان و کاریگەری و زیندووکردنەوەی هیمەتەکاندا، لێ هەیە حەسوودی زمانی بەستوە لەوەی گەواهی هەق بدات.

أستغفرالله، حەزم بە شانازی کردن نییە، بەڵام ناچاربووم وتم. ئایا بێدەنگ بم، کاتێک خەڵکی بێدەنگ بوون لە ڕوونکردنەوەی مافەکەم؟

ستەملێکراو قسەی بۆ هەیە و ئەمەش یەکێک بوو لە قسەکانم، گەر شانازی کردنە لە کۆندا شانازی کردن لە هونەری ئەدەبی عەرەبی بووە، گەر ئەوە نەبێت یاداشتە و، مێژووی ڕەوشتی خەڵکیی و کۆمەڵگایە.

چۆن لە بیری دەکەم لە ڕابردوودا هەڵەکانیم لەدەستدا و یادگاریەکانیم لەبیرکرد و چەندین سۆزی بە جۆش و هەستی ئاگرگرتووم لەدەستدا، ڕۆژەکانی ئێستاشم تێکدا بە گەڕانەوە بۆ ڕابردوو، بەیانی و ئێوارەیم خەرج کرد لە هەڵدانەوەی یاداشتەکان و گەڕان لەناو کەلاوەکەیدا بۆ گەوهەر و گەنجینە، هیچم دەسنەکەوت ئەوە نەبێت گەنجینەی ژیانم و گەوهەری تەمەنم لە گۆڕنا....داهاتوویەکیش کە هیچ هیوایەکم پێی نییە چونکە بێئومێدم لێی چاکەیەکی پێ بێت بۆم.

کێ دەتوانێ بەڕاستم بزانێت من ئاواتە خوازم کەسێکی گێلی نەزانی بێ ئاگابوومایە بۆ ئەوەی پشوویدەم و ئارام بم، چونکە بینیم زیرەکی بەرەو ئازار و بەدبەختیت دەبات، بە قەستی واز لە خوێندنەوە

دەهێنم بۆ ئەوەی ئەوشتانەی زانیوومە لە بیرم بچێت، دەبمە نەزان و ئازار ناچێژم ئەگەر نەزانێکی وەک خۆم پێش بکەوێت و سەرکۆنەی ژیان ناکەم لەوەی ستەمی لێکردووم....نەمتوانی، دەمبینی پاڵنەرم هەیە بۆ ئەوەی زانست زیاتر بکەم، وەک ئەوەی قەدەر بەدار عاساکەیەوە واملێدەکات زۆر بخوێنمەوە، بە زانست زیاتر ئازاز دەچێژم ئەو کاتەی دەبینم زانستەکەم ئازارە بۆم و دەبینم نەزانەکان پێشم دەکەون و ماڵەکەم دەدزن! گەر ئەو شەوانەی زیندووم دەکردەوە بە خوێندەوە و لێکۆڵینەوە و چۆکدانان لەبەردەم زاناکاندا بمگۆڕیایەتەوە بە یەک گەشت کردن بۆ ئەو (شوێنانە) لە دوای دوومانگ بگەڕێمەوە بە بڕوانامەیەک لە زمانی عەرەبیدا کە بە زمانی عەرەبی نەنوسراوە، ئەمە باشتر و چاکتر دەبوو بۆم لە هەموو زانستەکان سەرزەوی ئەگەر بەدەستم بهێنایە.

بەڵام پێم خۆشنەبوو لە ژیانمدا پشت بە غەیری ئەدەبەکەم ببەستم و، خۆم بە دوور گرت لەوەی پشت بەستم بە وەرەقەیەک کە گێل و بێ ئاگا و نەزان و دزەکان هەڵگرین، تەنانەت ئەو دزانەشی کە توێژینەوە و شوێنەواری زاناکان دەدزن!

پایەی من ئەم پێنووسەیە، چڵێکە لە چڵەکانی بەهەشت بۆ ئەو کەسانەی شایەنیانە، پشکۆیەکە لە پشکۆکانی دۆزەخ بۆ ئەو کەسانەی ئەهلی دۆزەخن!

بەڵام سوودی ئەم قسانە چییە؟

چ سودێکی هەیە لە کاتێکدا بەهاری تەمەنم ڕۆیشت، ڕۆژەکانم پشتیان هەڵکرد، دڵی ڕەسەنی ئاڵتونیم بوو بە شەوێکی ڕەش ڕەش؟ بە تەواوی چۆڵبووە، وەک ئەو پیرە پیاوەم لێهاتووە کە زەمانە تێکی شکاندووە و ئازاری داوە بە مردنی ڕۆڵەکانی، لە شوێنەکاندا دەگەڕێت و بە گریانەوە بانگیان دەکات. منداڵەکانم ئاواتەکانمن، گۆڕی ئاواتەکانیش تەنها دڵە بێئومێدەکانە!

ڕەحمەتی خودا لەو ئاواتانە بێت!

ڕەحمەتی خودا لەو ڕۆژانە بێت کە بێئاگابووم و هەموو فێڵبازێکی درۆزنم بەڕاست دەزانی، کە باوەڕی وابوو لە دونیادا باشی و ڕەوشت هەیە و نرخی مرۆڤ بەوەیە کە خاوەنیەتی! ئەدیب و مامۆستاکان هەڵیان خەڵەتاندم، بۆچی خوێندکارەکانم هەڵبخەڵەتێنم؟ بۆچی پێیان نەڵێم: فێڵ و درۆ و دووڕوی لە شەرعی ژیاندا وانە باشەکان، خۆتان ئامادە دەکەن بۆ چاککردنەوەی لارییەکانی شەریعەتەکەی یان دادەبەزنە ئاستی حوکمەکەی و بەزمانی خۆی لەگەڵی دەدوێن و لە دەرگایەوە دەچنە ژوورەوە؟



پەروەردەکارەکان و مامۆستاکان نکوڵی ئەمە دەکەن و گەورەی دەکەن و بە هەڕەشەی دەزانن لەسەر ئاوەزی تازە پێگەشتووەکان، دەی با ئەوە ببێت کە پەروەردەکارەکان و مامۆستاکان دەیانەوێت! ڕەحمەتی خودا لەو ڕۆژانە بێت! کێ بۆم دەگەڕێنێتەوە؟ کێ متمانەبوونم بە خۆشەویستی و دڵنیابوونم بە کتێب و ئارامی بوونم بە خەڵکی بۆ دەگەڕێنێتەوە؟

وام دەبینی خۆشەویستی بنچینەی ژیانە، گەردوون لەسەری وەستاوە و بوون ((وجود)) بە هۆیەوە بەردەوام بووە، باوەڕم پێی بوو، ئێستا وام لێهاتووە تەنها بڕوام بە ڕق هەیە، وام لێهاتووە حەزدەکەم ڕقم لێببێتەوە و ڕقم لێدەبێتەوە گەر خۆشم بوێت! کێ ڕێنوێنیم دەکات بۆ کتێبێک کە شێوازەکانی ڕقی باس کردبێت هەتا لێی تێبگەم و پەیڕەوی بکەم، ڕقم لە هەموو خەڵکی بێت؟ بگەمە ئەو پەڕی وشکێتی لە زامدارکردن و بێ پیتی لە مێشکدا، بۆچی کتێبێک لەبارەی ڕقەوە نانوسرێت، لە کاتێکدا گێلەکان هەزار کتێبیان لە بارەی خۆشەویستیەوە نووسیووە؟!

نەخێر، کێ ڕێنوێنیم دەکات بۆ ڕاکردن لە پیشەی ئەدەب و ڕزگاربوون لە خۆشەویستی و ڕق و هەموو هەستەکان؟ کێ چاکەیەکم لەگەڵدا دەکات بەوەی لە پەنهانیدا نزام بۆ بکات، کە خودای گەورە نیەتم ڕاست بکات لەسەر ئەوەی واز لە ئەدەب بهێنم،

یان لە بەدبەختییەکەم کەم بکاتەوە؟ چەکی ئەدەبم پێبەخشراوە، بەڵام خەڵکی ئازارییان دام هەتا چەکەکەم فەرامۆش کرد و ژەنگی گرت و، ژەنگ خواردی، لەناوچوو بەبێ ئەوەی کەس بۆی بەداخ بێت! خەڵکی بۆی بەداخ نابێت چونکە خۆیان لەناویان بردووە. خۆشم بەداخ نیم بۆی چونکە خێرم لێی نەبینیووە.

خوێنەرانم بێزار نەبن گەر من ماڵئاواییم لە ئەدەب کرد بەباسکردنی خۆم، شیوەنی بۆ دەکەم پێش مردنی، شیوەن بۆ کارامەییە لە کارکەوتووەکانم دەکەم! مردم، لێم گەڕێن بە ڕەخنەی سارد ئازارم مەدەن، باسی باشییەکانی مردووەکانتان بکەن، گەر باشەیان نەبوو لە خراپەکانیان خۆش بن.



# نامەیەکی کراوە
# بۆ ئوستاز ئەحمەد ئەمین

له ساڵی ١٩٣٤دا بڵاو کراوەتەوە

شاعیرێک هەبوو خەڵکی نەیاندەناسی هەتا هێمنییەکانی پارشێوی پێ ناساندن؛ لەوکاتەی بە کوچەکانی گەڕەکەی سووڕی دەخوارد، بەسەر ڕەبابەکەیدا شیرینترین ئاوازەکانی و خەماویترین گۆرانیەکانی دەچڕی، بانگی شەوی ڕۆیشتووی دەکرد بە نەرمترین ئاوەکانی، شەو ئاوڕی بۆ دەدایەوە و ساتێک دەوەستا و گوێی بۆ ڕادەدێرا، بەرە بەیانیش هانی دەدا لەسەر ڕۆشتن، دڵی عاشقەکانیش بێدەنگ دەبوون بۆی، ئەگەر گۆرانی بڵێت بە((ئەی شەو...)) خەم و پەژارە دەیبزوێنێت، لەتاو ئازارەکەی دێتە گۆ و دەڵێت((ئاهـ))، مانگیش دەیناسێت چونکە ڕووناکیەکەی دەکردە ئاوازەکانییەوە، ڕووناکی لە ڕووی دەبڕا، پاشان لە نەرمییەکەی خۆی تێدەکرد و تێکەڵی دەکرد وەک تێکەڵ کردنی مەی بە ئاو، ئەهلی دڵان مەیەکی نورانیان دەنۆشی، مەستی خۆشەویستیەکی پاک و سۆزێکی چاک لە دەروونیاندا دەبزوا..........ویژدانی

بڕوادارەکانیش دەیانناسی، لەوکاتەی لەگەڵ بەرەبەیاندا سروودی بەرزی دەوت، ئەو شتەی لە دەروونیدا زیندوو دەکردەوە کە فریشتە گوێبیستی دەبن، کە فریشتەی تێدا هەستا شەیتان سەرشۆڕ و ڕسوا دەبێت، بە سروودەکەی چێژی ئیمانی پێ ناساندن، هیچ چێژێکیش نییە لەسەر زەویدا وەک چێژی ئیمان بێت....شاعیرێک بوو زیاتری نەدەزانی لە عەرووزی ئەوزان و پەیڕەی ئاوازەکان، بەڵام دەیزانی چۆن دڵی بگوشێت بەدەستی ئازار و چۆن دەروونی بتوێنێتەوە بە بڵێسەی یادگارییەکان، پاشان لەمە شیعرەکانی دەنووسی و دەیچڕی بەسەر ڕەبابەکەیدا، دڵەکان مەیلیان دەچوو بۆیی و بەسۆز دەبوون بۆی، لەلای ئەم شادوومانی و دڵنیاییان دەست دەکەوت.

گۆرانی بۆ ئیمان و نیشتیمان و خۆشەویستی وت، زۆر گۆرانی وت. بەڵام ئەو گۆرانییە ئاوازەیەی دەروونی دەبزوێنیت هێشتا زاری بۆی نەجوڵاندووە، هەتا ئەمڕۆ لەسەر ڕەبابەکەی بەکاری نەهێناوە. هەر لەبەر ئەمەبوو هەرکات دەتبینی دوو دڵ و پەشۆکا و چاوشوڕبوو، وەک ئەوەی بەدوای شتێکدا دەگەڕێت کە لێی ونبووە، لە پشت ئاسۆی زەمانەوە بەدوای شتێکدا دەگەڕێت تێیدا دەستی نەکەوتووە، تەماشای ڕابردوو دەکات و تێیدا دەگەڕێت بەڵکوو ونبووەکەی بدۆزێتەوە، ئەگەر نەیدۆزییەوە دەگەڕێتەوە بۆلای ئەوەی دێت، هەوڵدەدات بە چاوی هیواوە تەماشای ئەوشتە بکات کە



لەودیووی دەرگاکەوەیەتی، ...... سەبارەت بە ئێستا کاری پێی نییە و بەدەردی ئەم ناخوات.

خەڵکی کە ناسیان پێی سەرسام بوون و خۆشیان ویست، پاشان خوویان پێوەگرتن و ئارام دەبوون لەلای، پاشان لە بینین و گوێ گرتن لێی ڕاهاتن، خووپێوەگرتن هەستکردنی لاواز کردن، هەستیان پێی نەدەکرد کە ئامادەدەبوو، بەڵام بیریان دەکرد کە لەوێ نەدەبوو....پاشان وایان لێهات گوێیان نەدەدا بە نەبوونی و ئامادەبوونیشی گرنگ نەبوو لەلایان!

دواتر کۆمەڵێک شاعیر هاتن بۆ گەڕەکەکە، دەیاندا لە دەهۆڵێکی گەورە و هاواریان دەکرد بە گۆرانیەکی بەتاڵ، وەک دەهۆڵەکەیان، بانگەواز بۆ چاکە ناکات و هەست ناجوڵێنێت و لە دەروونیدا نادات لە شوێنی ئیمان، بەڵکوو بانگەواز دەکات بۆ هەوا و ئارەزوو، دەیانوروژێنێت، هێمنیەکانی پارشێو و دڵڕفێنیەکانی بەرەبەیان و تروسکەی مانگ ناینناسێت، بەڵکوو ڕووناکی کارەبا لە پەرستگای شەیتان و هەیکەلی شەهوەت و ئارەزوو دەیانناسێت، سفرەی مەی خواردن لە شوێنە خراپەکاندا دەیاناسێت، خەڵکیش لە دەووریان کۆبوونەوە و چەپڵەیان بۆ لێدان!

ئا لەم کاتەدا شاعیرەکە ڕەبابەکەی شکاند و بەبێ دەنگی لە گەڕەکەکە چووە دەرەوە، ڕوویکردە شاخەکان بۆ ئەوەی لە جادەی

شەشەمەوە پەناگەیەک بۆ دەروونی بدۆزێتەوە، بەرزییەکەی بپارێزێت لەوەی گوێ بیستی دەنگی ئەم دەهۆڵانە ببێت، وەک ئەو پیرەپیاوەی لێهات کە سێ ڕۆژەکەی بوو بە یەک ڕۆژ، شەوەکەی درێژبوویەوە هەتا ڕۆژەکەی گرتە خۆی و تاریکییەکەی درێژەی کێشا بۆ سبەینێ، ئیتر نەژیا بەڵکوو لە خەیاڵی ڕابردوودا دەژیا. وەک ئەو درەختەی گەرمای کانون هەڵیپرووسکاندووە، بە یادی (ئازار)ی گوزەشتە و گەشەکردنەکەی و تەموزی ڕابردوو و بەرهەمەکەیەوە دەژی!

چ کاتێک لە کانوندا گوڵی تەموز گەڕاوەتەوە؟

بەڵێ گەورەم، شاعیرەکە مرد و لە جبەی دادوەردا نێژرا، گەر فەرمانی تۆی بۆ هاتووە لە ((سەقافەدا)) بنوسێت لەکاتێکدا لە هەستەکانیدا ئەم سووتانە هەیە و لە دەمارەکانیدا ئەم ئاگرە هەیە، ڕۆژێک هەبوو واتاکانی لێوە دەردەچوو، وێنەی دەروونی دەبزواند و زوبانی بە ڕەوانبێژی دەجولا بەبێ ئەوەی بیجولێنێت، تەنانەت وەک کەسێکی زۆر بەخشندە وابوو کە لە کۆتەکان دەردەچێت، وەک ئەوەی پێنووسەکەی لەسەر کاغەزەکە پێش دەست و بیرکردنەوەکەی دەکەوێت، دەتبینی گوێڕایەڵت دەبوو خێراتر لە لافاوێک بۆ شوێنی خۆی، بەڵکوو خێراتر لە شادوومانی بۆ دڵی کەسێکی بەخشەر، خێراتر لە خۆشەویستی بۆ دڵی ئەدیب! ڕۆژێک کە لە دونیای خەڵکیدا دەژیا وەک ئەوەی دونیا بەس بۆ خۆیەتی؛ شتانێکی دەبینی کە ئەوان نەیاندەبینی، شتانێکی دەبیست کە ئەوان نەیان



دەبیست: لە هەموو دیمەنێکدا جوانی دەبینی، لە هەموو جوانیەکدا خەونێکی دڵڕفێنی ئەفسوناوی دەبینی و تێیدا ڕۆدەچوو، پەی بە چێژ و خۆشییەکانی دەبرد کە تەنها ئەوانە دەیزانن کە گوێیان لە باسی جوانی بووە و بە گوێی دڵ بیسەری بوون، شەوەکانی لەگەڵ خەونەکانیدا بەسەردەبرد، کە بەیانی لێ دەبوویەوە هیچی دەست نەدەکەوت گوزارشت بکات لەوەی لە دەروونیدایە ئیللا ئەم زمانە کورت بڕە نەبێت، کە بۆ گوزارشت کردنی خەڵکی لە پێداویستیەکانیان بەدیهێنراوە نەک بۆ پەسنی خەونەکانی ئاسمان! زمان چی بۆ بکات کە بۆ هەموو جوانییەکان-لەگەڵ ئەو وێنە و واتایەی تەواو نابێت-تەنها یەک وشەی هەیە ئەویش ((جوانییە))؟ چۆن دەتوانێت گوزارشت بکات لە جیهانێک کە هەمووی ژیان و هێز و سیحرە؟ چۆن قەناعەتی پێدەکات لەکاتێکدا لە چاویدا چەندین پەڕەی جوانی هەیە و هەموو ڕۆژێک شتی نوێ دەخوێنێتەوە؛ لە هەموو ڕوویەکدا جوانییەک هەیە ناپێوڕێت بەغەیری خۆی و لەهیچی تر ناچێت، هەموو چاو و گلێنەیەک جوانی هەیە، هەموو زەردەخەنەیەک و هەموو ئاوڕدانەوەیەک، هەموو دەنگێک و هەموو دەلاقەکەیەک، هەموو شیوێک و شاخێک، هەموو تەختاییەک و ڕووبارێک، هەموو پارچە شعرێک و هەموو وێنەیەک لە مۆزەخانەدا و هەموو گوڵێک لە باخچەیەکدا و هەموو بۆنێک و هەموو ئاوازێک....بۆنی یاسەمین و گوڵ و شلێر و ئامین، جوانی بەیات و ڕەست و حیجاز و

سەبا، عود و قانون و نەی و کەمانچە، جوانی چیرۆکێکی کاریگەر و حیکمەتێکی بەهێز، ئەوەی ویستت و نەتویست لە جوانیەکانی وجودد...... هەموو ئەمانە لە زمانەکانی مرۆڤایەتیدا تەنها یەک وشەی هەیە بەڵگە بێت بۆیی و ئاماژەیی پێ بکرێت بۆی...... ئای زمانی مرۆڤەکان چەندێ هەژارە!

جوانی دەچەشت و ئەدەب لە دەروونیدا دەبزوا، ئەدەبیش بڵاوکردنەوەیە، چێژەکەی بەدی نایەت و نیعمەتەکەی شیرین نابێت هەتا خەڵکی لە نیعمەتەکەیدا بەشدار نەبن. ئەدیبیش بەم شێوەیە، بەخشندەیی دەکات لەگەڵ خەڵکیدا بە بەنرخترین شتی خۆی: بە هەست و سۆزی، دەروونی واڵادەکات و نهێنیەکانی باس دەکات بۆیان، ئەوان لەگەڵیدان لە خۆشی و ناخۆشیەکانی، لە هیوا و بێ هیوایەکانیدا، باسی چیرۆکی خۆشەویستی و ڕق و جوڵە و بێدەنگیەکانیان بۆ دەکات، پاشان پێی دەڵێن: ئەم گێلە زۆربڵێیە چییە هەر باسی خۆی دەکات، شانازی پێوەدەکات وەک شانازی کردنی کەڵەشێر بە پەڕەکانییەوە، ڕۆژنامەکانی پڕکردووە لە باسی خۆی، وەک ئەوەی خەڵکی هیچ خەمێکیان نییە ئەوە نەبێت گوێ لە باسی ئەم بگرن!

ئەوەی هەستی پێی دەکرد لە واتایی هەتاهەتایی دەیگواستەوە بۆ زمانی لەناوچوون، تەنها کەمێکی کەمی دەمایەوە، پاشان ئامادەی دەکرد بۆ بڵاوکردنەوە، زۆربەی ئەو جوانیەشی کە مابووی لە



دەستی دەدا لە نێوان موراعات کردنی ئادابی کۆمەڵگا و یاسای بڵاوکردنەوە و حەزی بڵاوکەرەکان و خواستی خوێنەران، پاشان بڵاودەکرایەوە و خوێنەری ڕازی دەکرد، بەڵام خۆی پێی قایل نییە و سەرسام نییە پێی، چونکە دەزانێت باشترین شت ئەوەیە وشە گوزارشتی لێی نەکردووە و پێنووس نەینووسیووە، ئەمەش بۆ ئەوە نییە شانازی پێوە بکات، خۆی لە هەموو خەڵک زیاتر دەروون و نەنگیەکانی و ئەدەبی و کەموکورتیەکانی دەزانێت، لێ ئەمشەو دەرگایەکی یادەوەرییەکانیت کردەوە کە پێشتر داخراوبوو.

وذو الشوق القديم وإن تسلّى　　مشوق حين يلقى العاشقينا

یەکێکە لەو کەسانەی هەرچی هەبوو ئەم کۆمەڵگایە زیندە بە چاڵی کرد.... دەروونێکی هەبوو مرد، وازی لێناهێرێت شیوەن بکات بۆ دەروونی؟ سەروەتی کەسێک دەڕوات بۆی دەگری، ماڵەکەی دەسوتێت بەداخە بۆی، بازرگانیەکەی لەدەست دەدا ئەسرینی بۆ دەڕیژێت، خۆشەویستەکەی جێی دەهێڵێت شیوەنی لەدەستدانی دەکات....دەروونی دەمرێت و زوبانی وشک دەبێت، لێی ناگەڕێن بۆ دەروونی بگری و شیوەن بۆ زمانپاراوییەکەی بکات ؟

* * *

لە ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی پایزدا لە ساڵی ١٩٢٨دا لەلای پردی زەمالیک لە قاهیرە لاوێکی بیست ساڵان وەستا، لەو تەمەنەدا بوو

کە مرۆڤ دەڕژێ بۆ ئارەزو و خەونەکانی، جارێک تەماشی نیلی کرد و جارێکیش تەماشای گەردوونی فراوانی کرد، ئاسۆیەکی دوور کە پۆشتەبوو بە نووری ئاوابوون بە پۆشاکە چنراوەکەی لە دەزووی خۆر، شارێکی بە بیرهێنایەوە کە خۆشەویستە لە دەروونیدا، لە چاویدا پرشنگدارترە لەو ئاسۆیەی پەنهان بووە لە پشتییەوە، دایک و براکانی جوانی ئەو شارەبوون، شوێنی گەمەی منداڵی و گەورەبوونی، دیمەشقی بە بیرهاتەوە، لە هەموو شوێنێکی یادگارییەکی هەبوو کە بەشێکن لە ژیانی، ژیانی مرۆڤەکان تەنها یادگارییەکانیەتی! قەدپاڵی قاسیۆنی شادوومانی هێنەر و بەردە گەورەکانی، ڕەبوەی مەڵبەندی خۆشەویستی و هەوارگەی ئاواتەکان، غوتەی بەهەشتی دونیا و بێستانی سەرزەوی، میزان و شازریوان و میزە و کەیوانی هاتەوە یاد.... تامەزرۆیی لە دەروونیدا بزواو و تاسەکردن وروژاندی، شوێنی خۆی لە خوێندنی باڵا لەبیرکرد، چاپخانەی سەلەفیەی لەبیرکرد لە شەقامی ئیستیئناف کە تێیدا دەگەیشت بە خزمەتی زانا دیارەکانی میسر، هاوڕێی خاڵۆ موحیبودین: تەیمور پاشا و ڕافیعی و ئەحمەد ئەمین و عەزام و خدر تونسی و غەمراوی، دەستەی گەنجانی موسڵمانی لەبیرکرد، ڕووی وەچەرخان بەرەو وێستگەکە، چەند کاتژمێرێکی نەبرد ئەم گەنجە ماڵئاوایی لە قاهیرە کرد کە تێیدا ئاواتەکانی بۆ نزیک بووبووەوە. سواری پشتی تامەزرۆیی بوو بەرەو شارە خۆشەویستەکەی، نەیزانی ماڵئاوایی کرد -ئەو ڕۆژەی ماڵئاوایی لە میسر کرد- لە داهاتووی

ئەدەبی و شکۆمەندییەکەی، لە بلیمەتی و ئامادەکارییەکانی، زەوییەکی بە پیتی تێراوی بە جێهێشت و تۆوەکەی هەڵگرت بۆ ئەوەی لەسەر بەردێکی ڕەق بڵاوی بکاتەوە و بەو هیوایەی بێتە بەر! قاهیرەی بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ ئەو شارەی ئەدیبی تێدا دەمرێت، ئەمەش یەکەم دێڕبوو لە پەڕەی بەدبەختییەکانی!

ئەو لاوەی ژیانی لێوەهەڵدەقوڵا و لە چالاکبووندا بازیدەدا، ئەو گەنجەی لە هەموو گۆڕەپانێکدا گەڕی هەبوو، لە هەموو کێشمەکێشمێکدا سوارچاکی ناوی بوو، ئەو گەنجەی کاری بۆ ئەدەب و چاکسازی و سیاسەت و ڕۆژنامەوانی و، فێربوون و نووسین دەکرد، ئەو گەنجەی عێراقی ناسی و عێراقیش ناسیان، خۆشیویست و خوێندکارەکانی خۆشیان ویست، هێندە مایەوە کە بە وەفابن بۆی و باسی بکەن، ئەویش بە وەفا مایەوە بۆ عێراق و باسی دەکردن. پلەوپایەی لە لوبناندا بە هەمان شێوەی عێراق بوو، ئەو گەنجەی کە چوو بۆ حیجاز، لە هەموو شارێکدا کاریگەری هەبوو لەسەر دەروونی هاوڕێکانی و لە هەزارەها لە خوێندکارەکانی، ئەوانی لە دڵ و دەروونی جیانەدەکردەوە هەتا دەروون و دڵی نەما....لە دوای هەموو ئەمانەوە ڕۆژگار ئەم گەنجەی بە پیری گەڕاندەوە کە هێشتا نە گەیشتوە بە چل ساڵی تەمەنی، مردووە و کفن کراوە لە جبەیەکدا، فراوانی دەروونی تەسکرایەوە هەتا مادەکانی قانون دەووریاندا و پێنووسەکەی شکان، نانوسێت تەنها لە

بڕیارەکان و سیغەی سەرپێچییەکاندا نەبێت، دونیاکەی بچووک بوویەوە هەتا وای لێهاتووە چوار دیواری دادگا سنورداری دەکات..... لە دوای هەموو ئەمانەوە چی لێ چاوەڕوان دەکرێت؟

شارەکەی سزایدا، ئەو شارەی خۆشیویست و لەتاو خۆشەویستیەکەیدا میسری بەجێهێشت لەدوای ئەوەی تێیدا ئایندە بۆی پێدەکەنی. ئەگەر لە میسردا بمایەتەوە، میسر هەق و پلەی ئەدەب دەزانێت، ئەوا ئەمڕۆ شتێکی تردەبوو!

لە کاتێکدا میسر- ئەگەر ڕاستیم بوێت- تەنها ڕۆڵەکانی خۆی خۆشدەوێت و بۆیان پێدەکەنێت، یەک ئەدیبی میسری بە سەد دەبینێت و، سەدی غەیری خۆی بە یەکیش نابینێت. ئەگەر وانییە پێم بێژن: بۆچی ڕەخنەگرەکانی ئاهەنگ دەگێڕن بەهۆی دەرچوونی بچوکترین کتێبی و چەندین ڕۆژ سەرقاڵ دەبن بە قسەکردن لەبارەیەوە، بەڵام یەک وشەی ستایش کردن یان ڕەخنەگرتن ناڵێن لەسەر ئەو کتێبە بە پێزەی لە شام یان لە عێراق دەردەچێت؟

چی داوە لەسەرکۆنەکردنی میسر، ئەمە شارەکەی خۆیەتی کە تەرازووەکەی ترازاوە و ڕێبازەکانی بچڕاوە و بۆچوونەکانی سەری لێ تێکچووە، ڕاوچی تێکەڵ بووە بە مەردەکان و شیکەرەوەکان بەبێ ئیشەکان، تەنانەت ڕۆژنامەکان لەیەک کاتدا ستایشی کتێب



دەکەن و ڕەخنەی لێدەگرن، هەل هەلە بۆ شیعری نوێ لێدەدەن و چەپڵەبارانی دەکەن، هیچیش نییە تەنها قسەی خراپ نەبێت و کردوویانە بەقسەی باش، یان قورسێکی سارده خۆشەویستیان کردووە یان لاوازێکی جیاوازە بە بەهێز و پاراو بینویانە؛ وەک ئەوەی ئەدەب بوبێتە گاڵتە و گەپ، وەک ئەوەی عەرەبی گرێکەی کراوەتەوە و ئەم (کتێبەی) نەماوە دەستی پێوەبگرێت، یەکیەتیەکەی بپارێزێت و لەنێوان یەکەم و کۆتایدا هۆکاری گەیاندن و پەتی پتەو بێت، قسە کۆنەکانی هەمیشە تازەیە و لێی تێدەگەین و چێژی لێوەردەگرین، تازەکەشی کۆنە، ئەگەر خودا عەرەبە سەرەتاییەکان زیندوو بکاتەوە لێی تێدەگەن و چێژی لێوەردەگرن.....وەک ئەوەی کەسی ئەدیب ئەم پێستە لە جەستەی دەکاتەوە بۆ ئەوەی پێستێک بپۆشێت لەو کارگانەی (ئەوێ) دروستکراوە، کێ حەز دەکات سەری لێبکەنەوە بۆ ئەوەی سەرێکی بۆ دابنێن ئاوەزێکی تێدایە هی ئەوێیە، ئەوەی جیاوازی دەکات لە نێوان حەق و باتڵدا، ئەوەیە ئەوەی لەلای ڕۆژهەڵاتەوە هات باتڵە ئەگەرچی ئایین و ڕەوشت و شەرەفیش بێت، ئەوەشی لەلای ڕۆژئاوابوونەوە هات هەمووی هەقە گەرچی کوفر و تاوان و سەرپێچیش بێت! تەنانەت ئەم شارە نکوڵی دەکات لە شاعیرێکی ڕاشکاوی نەسەب جێگیریی، هەموو نوساوەیەکی ناتەواویش دەگرێتە خۆی.... لێ ئایا مرۆڤ سکاڵا لە شار و کەسی خۆی دەکات؟

بلادي و إن جارت عليّ عزيز
و أهلي و إن ضنوا علي كِرامُ
شارەکەم گەرچی ستەمیشم لێبکات خۆشەویستە
کەسەکانم گەرچی ڕەزیلیم لەگەڵ بکەن بەخشندەن

هیچ شتێکت لەسەر نییە ئەی دیمەشق لەوەی کردووتە بەو کەسەی کە هیچ کەسێک هێندەی ئەو خۆشی نەویستویت، هیچ نووسەرێک وەک ئەو تاریفی نەکردوویت و بەرهەڵستی ناوەکەت ناکەم وەک چۆن تۆ کردت، ئەم هاوڕێیانەشم ((ڕیسالە))خوشکی ((سەقافە)) شایەتن لەسەر ئەوەی دەیڵێم، منەت ناکات و کەس ئازار نادات بە منەت کردن، بەڵکوو سەرکۆنە و سکاڵا دەکات.

* * *

ئەگەر خودا بۆ ئەم ((مردووە)) لە دایکبوونێکی تری نووسی((مرۆڤ هەموو ڕۆژێک کەسێکی نوێی تێدا لە دایک دەبێت و کەسە کۆنەکەی تێدا دەمرێت)) و گەڕاندیەوە بۆ ژیان، ان شاءالله بە دوو باڵی کراوەوە بدات لە شەقەی باڵ لە ئاسمانی ئەدەبدا، بگات بە چەندین ئاسۆ کە پێشتر نەیبینیووە. باسی شتێک بکات بۆ خوێنەرانی سەقافە شیرینتر بێت لە موناجاتی دڵ و گفتی دەروون، ئەگەر ئەمەی بۆ نەنوسرابوو ڕەحمەتی خودای لێبێت، خەڵکی بە لە دەستدانی ((هیچ)) زەرەر ناکەن!



ئەمە پۆزش هێنانەوە بوو کە سکاڵای لە خۆگرتبوو، بە سوپاسەوە بڵاوی بکەرەوە، یان وازی لێبهێنە و سەرکۆنەشت ناکەم:

ولابد من شكوى إلى ذي مروءة    يواسيك أو يسليك أو يتوجع

السلام عليك ورحمة الله وبركاته

* * *

وەڵامی ئوستاز ئەحمەد ئەمین ڕەحمەتی خودای لێبێت:

سەقافە پەیامێکی ناردووە بۆ مامۆستای ئەدیبی دیمەشقی، تکای ئەوەی لێدەکەن لەم بێدەنگییە دەربچێت و بگەڕێتەوە بۆ ئاواز چرینی، وەک ئەدیبێکی بەڕێز و هونەرمەندێک ناسیومانە، ئەویش ئەم پەیامەی بۆ ناردووین و ڕێگای داوین بڵاویبکەینەوە. بەڵکوو ئەمە ببێتە هۆکارێک بۆ ئەوەی ئوستاز هەناسەیەک بە دەروونی بدات، پێنووسەکەی ئامادەبکاتەوە و بە نووسینەکانی چێژ ببەخشێت بە خوێنەرانی و، ڕزگاری بێت لەو دونیا تەنگەی کە تێیدا دەژی لە نێوان دۆسیە و کتێبی یاسا و بڕیارە زۆرەکاندا بەرەو دونیایەکی فراوان، دونیای هەست و سۆزەکان و دونیای خەڵکی و ناکۆکی و کێشەکانیان و چاکسازییان، ئەدیبەکان بۆ ئەوە بەدینەهێنراون کە لەو ژیانە تەنگەدا بوەستن.

ئوستاز سەرکۆنەی گۆڤارە میسرییەکان دەکات لەسەر ئەوەی گرنگی بە بەرهەمە هیچەکانی میسرییەکان دەدەن و گرنگی نادەن بە بەرهەمە باشەکانی شوێنەکانی تر وەک شام و عێراق، چەندین جار گومان لەم سکاڵایەبووە، بەشێک لە ڕاستی تێدایە. بەڵام زۆرترین گومانمان ئەوەیە کە فەرامۆش کردنێکی بێ مەبەستە. ئەوەیە نووسەرانی شام و عێراق زۆر بەدوای شتدا بچن. کتێبی نووسەرانی عێراق و شام لەنێوان خۆیاندا بڵاودەبێتەوە و خۆشیان لە هەموو کەس زیاتر لێی شارەزاترن بە پۆشاک و بە نرخەکەی. گەر لەسەری بنووسن و ڕەخنەیەکی بە نرخی لێبگرن و ناساندنێکی ڕاست بیناسێنن. گۆڤارەکانی میسر دواناکەون لە بڵاوکردنەوەی وتارەکانیان و بەشداریکردن لە ستایش کردنی شتە بە نرخەکان تێیدا. بەلایەنی کەمەوە سەقافە پەیوەست دەبێت بەمەوە و بەڵێن دەدات و، باوەڕی وایە بەمە کەموکورتییەکی دیار پڕدەکاتەوە لە خۆی و سەرجەم گۆڤارەکاندا، ئەویش گرنگی نەدانە بە بابەتی ڕەخنەگرتن بەپێی پێویست. جا یەکسانە نووسەر میسری بێت یان عێراقی یان شامی. لە چاوەڕێی نوسینەکانی ئوستازداین بەخێرهاتنی دەکەین و سوپاسی دەکەین.

# شیفا

لە ساڵی ١٩٣٦دا بڵاوکراوەتەوە

..............تووشی سیل بووبوو، بەڵام سیلێکی نامۆی بکوژ، لە سی و گەدەیدا نەبوو، بەڵکوو لە دەروونیدا بوو، لە بیرکردنەوەیدابوو، نەخۆشیەکە هەست و بیرکردنەوەی پەکدەخست و ژیانی دەخنکاند و بوونیەتی لەناودەبرد....تووشی ((دەردی خۆشەویستی)) بووبوو.

پشکۆی بەهرەکەی دامرکاندبووەوە، هەموو بەهرەکانی پەکخستبوو، زیرەکیەکەی لە دەستدابوو، زرنگیەکەشی وێران کردبوو، هەموو شتێک لە چاویدا تەسک کردبووەوە بە پوختی و کۆکراوەی تەنها ئەوی دەبینی: هەموو ڕێگاکان لە دیداری خۆشەویستەکەی، ئازارەکانیش لە دابڕانیدا، هەموو فەرمانەکانیش لە ڕازی بوونیدا، هەموو قەدەغەکراوەکانیش لە توڕەبونیدا پوخت بووبووەوە، کتێبی ژیانی کورت بووبووەوە ناو و ناونیشانی سڕیبووەوە، پەراوێزێکی بچووک بوو لە ژیانی ئەو کەسەی کە خۆشیدەویست، دونیای پان وبەرین پڕ لە باشە و سەربەرزی، پڕ لە جوانی و هەقیقەت و خێر، هەموو ئەمانە کورتبووبووەوە لەو ئافرەتەدا!



حەزی بە خواردن نەمابوو ڕقی لێیبوو، بەلایدا نەدەچوو ئارەزووی بۆی نەمابوو، گەر ناچاربوایە خواردنی دەخوارد وەک ئەو کەسەی دڵی تێکهەڵدێت و کیفایەت بە چەند تیکەیەک دەکات کە پشتی ڕابگرێت، وەک ئەوەی ئەم نەخۆشییە ڕازی نابێت بەوەی لە دەروونیدا خراپی کردووە هەتا جەستەشی تێک نەدات! تووشی خەوزڕان بووبوو، بە درێژایی شەو بێدار دەبوو نە دەخەوت، گەر خەواڵویی بیگرتایە و پێویستی جەستەی زاڵبوایە چەند ساتێک دەخەوت و پاشان بە ترسەوە ڕادەچەنی، بیری لەو مرۆڤە دەکردەوە، دەترسا لەگەڵ هەناسەکاندا بفڕێت، یان لەگەڵ ئەسرینێکدا بڕوات، یان لە دەریای چاویدا نقوم بێت!

جەستەی لاوازبووبوو، هێزەکەی خواردبوو، ئێسکەکانی پووکابوونەوە، ڕووی هەڵبزڕکابوو، توانای جوڵەی نەمابوو، لاواز و سیس بووبوودەوە، تەنها لە مەجازدا دەژیا؛ بە یادگاری ئەو ڕۆژانەوە دەژیا کە تووشی ئەم سیلە نەبووبوو، ئەو ڕۆژانەی خاوەنی جەستەیەکی بەهێز و ئەندێشەیەکی پتەو و دڵێکی شاعیرانەبوو... نە خۆی نە خەڵکی سوودیان لە دەروونیان نە دەبینی، چونکە بۆخۆی و خەڵکی و ژیان نەبوو، بەڵکوو بۆ کەسێک بوو کە خۆشیدەویست.

خۆشەویستی هەمیشە بەم شێوەیە: نەخۆشیە لە جەستەدا و، تەسکیە لە ئەندێشەدا و، ڕاکردنە لە گۆڕەپانی ژیان!





دوێنێ، ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی پاییزبوو لە بەغداد، گێژەڵوکەیەکی توندی تۆزاویی دەستی پێکردبوو، دارەکانی دەجولاندەوە و گەڵاکانی بڵاوەکردەوە و چڵەکانی دەشکاند، دەگەیشت بە هەموو شتێک لە سروشتدا و یاریی پێدەکرد، بەملاو لایدای دەبرد.....ئەم خۆڵ و تۆزە کەشەکەی پڕکردبوو کە تێکەڵی هەموو گەردیلەیەک دەبێت لە هەوادا، لە ئاسماندا وەک هەور بڵاودەبێتەوە.
بەری خۆر و شتەبەرچاوەکان دەگرێت، هیچ شتێک نابێتە ڕێگری، دەچێتە ژوورەکانەوە چەندێ بە باشی و قایمی دەرگا و پەنجەرەکان بگیرێن، دەچێتە چاو و لوت و گوێ و قژەوە، دەڕواتە ناوی سندووق و گەنجینەکان و دڵی کاتژمێرەکانەوە.....بەڵکوو- بەهۆی وردیی و سووکی و خێراییەکەیەوە- نزیکە بچێتە ناو دەروونیەوە!
لەسەر هاوڕێکەشمان پێویست بوو بچێتە دەرەوە بۆ کارەکەی، دەچووە دەووروپشتی بەغداد، هەندێ دوودڵ بوو بەڵام ناچاربوو، دەبوو هەر بچوایە، پشتوێنی پێچایەوە و خۆی داپۆشی و قاپوتە گەرمەکەی کردە بەری، فەردەنجیەکی کردە شانی کە خۆی پێ دەپاراست لە باران، لەلای ملیدا گرێیدا و دەستکێشەکانی کردە دەستی و، گۆچانەکەی هەڵگرت کە خۆی دەدا بەسەریدا، نەیدەتوانی ڕێ بکات، بەهۆی ئەو هەموو پۆشاکەی کردبوویە بەری، بەهۆی درێژی ڕێگا و بەهێزی با کەوە، بەهۆی لاوازیی و ماندوویەتییەوە.



بە تەنها خۆی بوو لە ڕێی ((سولەیخ))، هیچ ئۆتۆمبیلێکی نەبینی لەگەڵیدا بڕوات و هیچ هاوەڵێکی نەبوو هاوڕێیەتی بکات، بەپێ ڕۆیشت، ڕێگاکە درێژبوو لە هەردوو لایەوە دارخورما هەبوو، با کە یاریی پێدەکردن، قەدەکەی لاردەکردەوە و چڵەکانی پەرتەوازە دەکرد و پاشان کۆیدەکردەوە، وەک ئەوەی پانکەیەکی گەورە بێت و دەستێکی نەبینراو ڕوویکردۆتە ڕووی دونیا، سەرەتاکەی دیاربوو کۆتاییەکی نادیاربوو لەم هەورە خۆڵاوییەدا کە هەموو شتێکی داپۆشیووە و زەوی دەگەیەنێت بە ئاسمان، ڕێگاکەی دەبینی وەک ئەوەی پێیدا سەردەکەوێت، یان دەیبینی وەک ئەوەی پێیدا دێتە خوارەوە، (با)کە زۆر زۆر بەهێزبوو، دارەکانی لاردەکردەوە و چڵەکانی دەجوڵاند، هیچ شتێکی جێگیرنەبوو لە نێوان ئەم بایەدا تەنها هاوڕێکەمان نەبێت بەگۆچانەکەیەوە و بەلاوازی و بارەکەیەوە.... لە دەروونی خۆیدا هەستی بەمە کرد، پێی سەرسام بوو تێبینی بکات و بیری لێبکاتەوە، شتێکی لە ئامادەکردنی دەروون توشبوو، ئەمەش زیادبوو هەتا پڕبوو لە هەست کردن بە بەهێزییەکەی، بە پۆزەوە تەماشای قاپووتەکەی دەکرد، تێڕاما لە هەناوی و بیری لە دەروونی دەکردەوە: ئەم کێیە؟ ئەی ئەو ژیانە چییە تێیدا دەژی؟.....

(با)کە توندتر لێیدەدا، پاشان فیکەیەکی لێدا و گوێی پێنەدا، چونکە گەردەلولێکی بەهێزتر و سامناکتر داویەتی لە



دەروونی....شەڕەقۆچ لەگەڵ ئەم شاخەدا دەکات و دەیەوێت وێرانی بکات. وەستا و بیری کردەوە: بۆچی بە دەستی خۆی ژیانی تەنگ دەکات؟ بۆچی ئەندێشە و بەهرەکانی لە کاردەخات؟ ئەرە هەموو ئەمانە تەنها لەبەرئەوەیە مرۆڤێکی جوانی دیوەتەوە و گومانی وایە خۆشیدەوێت؟

جوانە یان ناشرین. چ داوە لێی؟ کێ وتویەتی بەبێ ئەو ناژی؟ ئەی پێش ئەوەی ئەو بناسێت چی دەکرد؟ نە دەژیا؟ ئایا ژیانی جوانتر و جەمتر نەبوو بە گەورەییەکان. پڕنەبوو لە باشییەکان؟ ئایا ئەم خۆشەویستییە تەنها نەخۆشییەک نەبوو جەستەی وێران کرد و کارامەییەکانی نەهێلا و تواناکانی کەرت کرد. لە نێوان ئەو و ژیاندا بەربەستێکی لە گۆشت و خوێن نە نافراند؟ ..

چ پووچییەکە! ئایا بڕیار دەدات بەسەر خۆیدا بە جەخارێکی هەمیشە و ڕاڕایەکی بەردەوام. بۆ ئەوەی خۆشی و دڵنیای ببەخشێتە کەسێکی تر؟ ئایا لەسەر خۆی پێویست دەکات ڕووی هەڵبزرکێ چونکە ئەو کوڵمەکانی سوورە؟ ئایا نەخۆشی و لاوازی هەڵدەبژێرێت تەنها لەبەر ئەوەی ئەو شل و ملە؟

چ شەرمەزارییەکە! ئایا دونیا نابینێت لە چاوی ئەو مرۆڤەوە نەبێت؟ ئایا بەختەوەری و شکۆمەندی و زانست و پاڵەوانی و ڕووناکی و ژیان دەگۆڕێتەوە بە یەک زەردەخەنە؟

خۆشەویستی وەک گەمژەترین شت هاتە پێش چاوی!

* * *

بارانێکی بەهێزی خێرا دەیدا بە دەموچاویدا....هەستی بە بەهێزی و چالاکی کرد، پڕ بە سینەی هەناسەیدا و چاوەکانی گەشایەوە بە گەشانەوەی وەرزی، پاشان گۆچان و قاپوتەکەی فڕێدا و ئەم بارە پۆشاکەی لە خۆی کردەوە..... هاوارێکی کرد هاواری خۆشی:

تەواوووووو چاکبوومەوە!

پاشان بەڕێ کەوت بەرەو دونیایەکی فراوان.... ئیتر ژیانی لێ یاساخ نەبوو، چونکە ئیتر خۆشی نەدەویست!

* * *

What?





## ٧ تەنیایی

((.....هەموو ماندووییەک لە ژیاندا سەرچاوەکەی ئەوییە
بە تەنیا دەژین، هەموو ئەو هەوڵانەشی دەیدەین
تەنها بۆ ڕاکردنە لەم تەنیاییە)).
گی دی مۆپاسان

لەساڵی ١٩٣٧دا بڵاوکراوەتەوە

هیچ شتێک لە ژیاندا بە ئەندازەی تەنیایی ئازاری نەداوم، هەستم بە-هەرکات تەنها دەبووم- بۆشاییەکی سامناك دەکرد، هەستم دەکرد ئامۆیە بە من و قورسە لەسەرم توانای تەنیابونەوەم نییە لەگەڵیدا، کە لەگەڵیدا تەنیا دەبوومەوە هەستم دەکرد لە نێوان من و ژیاندا سارایەکی وشک و وێرانی بێ کۆتا بوونی هەیە، بەڵکوو زۆربەی جار جیهانم وەک وەحشێکی گەورە دەبینی، کە دەمی کردۆتەوە قووتم بدات، هەوڵی ڕاکردنم دەدا، بەڵام چۆن ڕابکەم لە دەروونم کە لە جەستەمدایە، چۆن لەو دونیایە ڕابکەم کە تێیدا دەژیم؟

دەروونم قوڵ و فراوانە، یان خۆم بەقوڵ و فراوانی دەیبینم بەهۆی زۆری ئەوشتانەی لێ ورددەبمەوە و تێیرادەمێنم لە پەنایدا، بەفراوانی و قوڵییەکەی دەمترسێنێت و ئەخۆشم دەخات کە هیچ شتێک پڕی ناکات چەندێ گەورەبێت...ئەم جیهانە تەنگەش، یان بە تەنگی دەیبینم بە هۆی سەرقاڵیم لێوەی بە دەروون و هەستم بە فراوانێکەیەوە، دەبینم بە تەنگیەکەی دەمخنکێنێت.

من هەموو جیهان لە یەک ئەندێشەدا کۆدەکەمەوە و فڕێی دەدەمە سوچێک لە سوچەکانی دەروونمەوە، لە نوکتەیەکی بچوکی ئەم فەزا فراوانە، پاشان لە تەنیاییەکی مەترسیداردا دەژیم و تەماشا دەکەم چ شتێک ئەم فەزایە پڕدەکاتەوە.

هەرکاتێک تەنیا دەبمەوە لەگەڵ دەروونمدا، بوێری دەکەم لە لێکۆڵینەوە لێی و ڕۆچوون لە قوڵاییەکانیدا، فراوانتر و سەرسوڕهێنەرتر دەبێت. ئەم بوونەوەرە چییە کە جەستەیەکی بچووک لە خۆیی گرتووە، لە گەردووندا تەنها بۆشاییەکی تەنگی داگیرکردووە وەک چۆن کورسی یان سندووقێک داگیری کردووە، لێ هەموو ((شوێنەکان))ی لەخۆگرتووە، ((زەمان))ەشی لەخۆگرتووە، لەساتێکدا لە ئەزەلەوە دەچێت بۆ ئەبەد، لە یەک بیرکردنەوە هەموو وجودد ڕێکدەخات، نزیکە خودی ژیانیش لە ناخیدا ونبێت؟

مەحاڵە لەم بونەوەرە تێبگەین کە پێی دەڵێن((دەروون))، هەربۆیە لە تەنیایی دەترسین و لێی ڕادەکەین. ئێمە لە دەروونی خۆمان دەترسین و ناتوانین لەگەڵیدا تەنیا ببینەوە، حەز دەکەین خۆمانی لێ سەقاڵ بکەین بە هاوڕێیەتی کردنی هاوڕێکانمان یان خۆشویستنی خۆشەویستێکمان یان کارێک لەکارەکان. لە ژیانیش دەترسین، حەزدەکەین بە قسەی هیچ یان کتێبێکی پووچ تێیپەڕێنین، یان ئەو شتانەی تر کە ڕۆژە بەتاڵەکانمانی پێ پڕدەکەینەوە. گەر جارێک ناچاربووین ڕووبەڕووی ژیان و کات ببینەوە بەبێ ئەوەی خۆمان بە هیچ شتێکەوە سەرقاڵ بکەین - وەک ساتی چاوەڕوانی- بێزار دەبین و جاڕس دەبین لە ژیان و هەست دەکەین گەردوون لەسەر شانی ئێمە دەسوڕێتەوە. ئایا ئەمە نهێنیەکی سەیر نییە لە نهێنیەکانی ژیان: مرۆڤ ڕقی لە دەروونی خۆیەتی و لێی دەترسێت، خۆشەویسترین شتیشە لەلای. لێی ڕادەکات....ژیانی تەنگ دەکات کە بە شکۆترین شتە لەلای، هەوڵیش بۆ لەناوبردن و لەناوچوونی دەدات؟!



دەستەوسان بووم لە هەڵگرتنی ئەم تەنیاییە و ئەم بۆشاییەی کە لە دەروونمدا هەستی پێدەکەم، زۆر قورسبوو لەسەرم، هەربۆیە تێکەڵی خەڵکی بووم و هاوڕێی زۆرم گرت.

لەمەدا شادوومانی بۆ دەروونم و کۆکردنەوەم بۆ پەرتەوازەییەکەم دۆزییەوە، گفتوگۆم دەکرد و شۆخی و سۆعبەتم دەکرد، پێدەکەنیم و دەمهێنانە پێکەنین، هەتا ئەوەی بیبینیمایە وایدەزانی بەختەوەرترین کەس و ئاسوودەترینم، لە کاتێکدا هەر ئەوەندەی لە هاوڕێکانم دادەبڕام و تەنیا دەبوومەوە لەگەڵ دەروونمدا، بۆشاییە مەترسیدارەکە و تەنیاییە سامناکە دەگەڕایەوە.

لە ژیاندا نقوم بووم بۆ ئەوەی دەروونم پڕبکەم لە سەرقاڵییەکانی ژیان و تەنیاییەکەم لە دەریای کۆمەڵگادا نقوم بکەم، پەیوەندییم بە سیاسەتەوە کرد و فریوم تێیدا خوارد و نووسیم و وتارمدا، لەو دەمەی لەسەر دوانگە بووم هەستم دەکرد من تەنیانیم بەڵکوو تێکەڵم لەگەڵ ئەو کۆمەڵەی چەپڵەم بۆ لێدەدەن و هوتاف دەکێشن.....بەڵام هێشتا لە شوێنەکە دەرنەچووبووم و خەڵکی هەریەکەو بەلایەکا ڕۆشتون و لە ژوورەکمدا تەنیا دەبوومەوە دووبارە بۆشاییەکە دەهاتەوە، بەڵام زۆر مەترسیدارتر لە جاران، تەنیاییەکەش بە قورستر دەگەڕایەوە؛ وەک ئەوەی لێرە کەمی نەکردووە تەنها بۆ ئەوەی لەوێ زیادبکات، وەک ئەو ئاوەی دەرچەکەی دەگریت ئیتر نایەت، بەڵام هەر هێندەی دەست لادا هەمرو ئەوەی کۆبۆتەوە دێتە دەرەوە...چ سودێکم پێدەگەیەنێت ئەگەر لە سەد دانیشتندا باس بکرێم یان ناوەکەم لەسەر هەزاران زاربێت، خەڵکی موناقەشەم



لەسەربکەن و دژایەتی یەکتری بکەن. ئەگەر من لەوساتەدا لە تەنیاییەکی سامناکدا بم و ئازار بچێژم؟

ناوبانگ تەنها سوودی بۆ ناوەکەم هەیە. بەڵام ناوەکەم لە من نییە و منیش نییە. خوازیاربووم شادوومانیم لە خۆشەویستیدا دەست بکەوێت و ڕزگارم بکات لە تەنیاییەکەم. هیچم دەستەکەوت تەنها ناوێک نەبێت کە بۆ ئەوشتە نییە. لە وجوددا بوونی نییە. بەڵکوو نزیکبوونەوەی تارماییەکانی تێدایە.......

بەڵام چۆن ڕۆحەکان دەگەن بە یەک؟ ئەی ئەو خۆشەویستییە لەناوبەرە بەهێزە لە کوێیە کە هەردوو خۆشەویستەکە دەخوات وەک چۆن ئاگر کانزایەک دەخوات پاشان گەوهەرێکی پاک و بێگەردی لێدەهێنێتە دەرەوە. ((من))و((تۆ))ی تێدا نییە، بەڵکوو((ئێمە))ی تێدایە؟

دەستم لە خۆشەویستی شۆرد و بێئومێد بووم لەوەی لەلای خەڵکی کۆبوونەوەی ڕەها ببینم. بە زۆر گەڕامەوە بۆ لای تەنیاییە ڕەهاکەی خۆم.

***

وەهام لێهات ڕقم لەوەبوو بگەمەوە خەڵکی و، لە کۆبوونەوەکان ڕامدەکرد، چونکە لە هەموو ئەمانەدا تەنها کۆبوونەوەیەکی دیجم بینی: دوو خۆشەویست یەکتری لە ئامێز دەگرن، گەر دەروونیانت بۆ ئاشکرا بکرایە دەتبینی بە ئەندازەی ئەزەل و ئەبەد نێوانیان هەیە. دوو هاوڕێ گفتوگۆدەکەن و دەستەواژەی خۆشەویستی و برایەتی بەکاردەهێنن، ئەگەر ئاخیانت بۆ ئاشکرا بکرایە دەتبینی ئەفرەت لە یەکتری دەکەن، دەستەی نیشتیمانی یان حیزبی میللی دەبینیت، تەنها گوێت لە قوربانیدان و دڵسۆزی دەبێت، تەنها کۆبوونەوە و یەک دەنگی ئەندامەکان دەبینیت، ئەگەر بچیتە دڵیانەوە تەنها دڵسۆزی بۆ خۆیان و خۆشویستنی دەروون و قوربانیدان بە هەموو شتێک لە پێناوی خۆیدا یان سودێکیدا دەبینی!

لە نێوان خەڵکیدا نامۆ بووم، وازم لە خەڵکی هێناو و ڕوومکردە دەروونی خۆم جیهانەکانیم ئاشکراکرد و ڕووبارەکانیم بڕی و لە تاریکییەکانیم کۆڵییەوە. لە ئەندێشە و هەستوسۆزەکانم هاوڕێ و دوژمنم بۆ پەیدابوون، بە خۆشەویستی هاوڕێکانم و دژایەتی کردنی دوژمنەکانمەوە ژیام!

* * *

ئەو کەسەی هەوڵدەدات دەروونی خۆی بناسێت چەندین سزا دێتە ڕێی وەک دەرد و ناڕەحەتییە گەورەکان، ئەگەر خۆڕاگربێت



لەسەری دەگات بە ئامانجەکەی، چ ئامانجێکە کە دەروون بە تەنیایی ئارام و دڵنیا دەبێت، بە ژیان شادوومان دەبێت، هەست بە چێژە گەورەکە دەگات؟ ئەو ئامانجەش تەنها ناسینی خودایە.

بەردەوام خەڵکی لە ژێر قورسایی تەنیاییەکی مەترسیداردا دەبن هەتا پەیوەندی دەکەن بە خوداوە، ئیتر لێرەوە بەردەوام بیر لەوە دەکەنەوە کە خودا لەگەڵیانە و بینەر و بیسەریانە؛ ئا لێرەدا ئازارەکان بۆ خودا دەبن بە چێژ، برسێتییەکان دەبن بە تێری، نەخۆشییەکان دەبن بە ساغی، مردن دەبێتە ژیانێکی هەتاهەتایی نەبڕاوە. ئا لێرەدا مرۆڤ گوێ ناداتە ئەوەی کەسی لەگەڵدا نییە، چونکە لەگەڵ خودادایە.

***





# یاداشتەکان

لە ساڵی ١٩٣٧دا بڵاوکراوەتەوە

دوو ڕووداون بەردەوام لە یادمن، هەتا ئەو دەمەی مردووشۆرەکە چاوەکانم لێکدەنێت:

یەکەمیان لەلای ڕووباری بەرەدایە، لە بیست و هەشتی ئەیلولی ١٩٢٦ز.

دووەمیان لە کەناری دیجلەدایە، لە پێنجی ئایاری ز١٩٣٧.

* * *

بەرەدا بەهێواشی و بە ڕوویەکی گەشەوە دەڕۆیشت، وەڵامی یەکەم سڵاوی خۆری بەرەبەیانی دەدایەوە، منیش لە ئۆتۆمبێلێکی گەورەدا بووم، تەماشای ئەو کۆمەڵە خەڵکەم دەکرد لە دۆست و هاوڕێیانم، بەم بەرەبایەنە هاتوون ماڵئاوایم لێبکەن پێش ئەوەی بچم بۆ عێراق، تەماشایانم دەکرد سوپاسگوزارانە بۆ چاکەیان و دڵگران بۆ دابڕانیان، پاشان تیڕامام لە بەرەدا هاوڕێی منداڵی و ئەربابی

تەنیایی و ڕزگارکەری دەروونم، لە ڕێیەوە سێبەری جوانی و شۆڕەبی دەبینم کە بەناز و لووتبەرزییەوە لێی دەدات، سێبەری منارە دوورە بەرزەکان دەبینم کە دەدات لە ناوەکە، تێیدا یادگارییە زیندووەکانم دەبینم و لەگەڵمدا دەدوێن، چیرۆکی ژیانم دەداتەوە بە گوێدا و مێژووەکەم بۆ دەخوێنێتەوە، هەست بە سوتاوی دابڕان دەکەم و لەم ساتەدا هەست دەکەم دیمەشقم خۆشدەوێت.....دیمەشق شوێنی یادگارییەکانم، دونیای دونیاکەم، ئەوپەڕی ئاواتەکانی ژیانم...پاشان هەموو ئەم وێنانە دەشێوێت و لە چاومدا تەنها وێنەی براکانم دەمێنێتەوە، لێی ڕادەمێنم بە چاوێکی پڕ ئەسرین و دڵێکی لەرزۆکی ترساو لە دابڕان، پاشان هەمووی لە یەک ڕوودا کۆدەبێتەوە، ئەویش خۆشەویسترین ڕووە لەلام و نزیکترین لە دڵمەوە.. لە ئاوەکەدا دیمەنێک دەبینم کاتێکی زۆری بە سەردا تێپەڕیوە و زەمانە چاڵی کردووە، دەبینم تۆزی دە ساڵی لێدەبێتەوە و دووبارە ژیانی بۆ دەگەڕێتەوە.

.......لە وێستگەی حیجاز نموونەی هونەری نوێم بینی لە دیمەشق، وێستگەکە شەپۆلی دەدا لە خەڵکی وەک چۆن دەریا شەپۆل دەدات؛ لە گەشتیاری شپرزە و، لە ماڵئاوایی کار بە گریانەوە، لە فرۆشیارێک هاواردەکات.... لە هاتوو و ڕۆیشتوو، سەرکەتوو و دابەزیوو. منیش کەنارگیربووم لە سوچێک لە سوچەکانی شەمەندەفەری حیفا. لە تەنیشتیشمدا خوشکە

بچووکەکەم دانیشتبوو.....دەمڕوانییە دوور، لە کۆتایی خەڵکەکەدا ئافرەتێکم دەبینی دەستی دوو منداڵی گرتبوو، خۆی داپۆشی بوو بە پۆشاکێک هیچ شوێنێکی دیار نەبوو، بەڵام لە پشتی ئەو ڕووبەندییە ڕەشەوە دووچاو هەن ئەسرین دەڕێژێت و پەیوەستە بە شوێنی ئێمەوە لە شەمەندەفەرەکەدا، لە نێوان ئەو پەرسوانەدا دڵێکی تێدایە بە تامەزرۆییەوە لێدەدات و ئەسرینی لێدەچۆڕێت، لە پشتی ئەو وەستانە هێمنەوە ئاگرێک هەیە کە گەرووی دەسوتێنێت و بومەلەرزەیەک کە وێران وێرانی دەکات.........

فیکەی ئەو شەمەندەفەرە لێدرا کە دەمانبات بۆ میسر، دڵ لێدانی زیادیکرد، پاشان کەشەکەی پڕ کرد لە دووکەڵەکەی وەک ئەوەی کەسێکی زیندوو بێت و ماڵئاوایی بکات، هەناسەیەکیدا وەک هەناسەی خەمێکی لە گۆڕنراو و ئازارێکی زیندانی کراو، پاشان کەوتە ڕێ و ڕۆیشت پەیتا پەیتا وێستگەکە لێمان دووردەکەوتەوە و چاوەکانم پەیوەست بوون بە دەستی ئەو ئافرەتەی بە دەسرێکی سپی ماڵئاوایی لێدەکردین، هەتا هەموو شتێکم لێ ئاوابوو.

لێرەدا ئاورم دایەوە خۆم بەتەنیایی بینیەوە، بینیم شەمەندەفەرەکە خێرا دەڕوات بۆ ئەوەی لە خێزان و شارەکەم دوورم بخاتەوە، بە خەیاڵمدا هات لە پەنجەرەی شەمەندەفەرەکەوە خۆم فڕێدەمە

خوارەوە...گەر خوشکە بچووکەکەم لەگەڵدا نەبوایە هەرچەندە بچووکە بەڵام لە من گەورەترە، هەرچەندە نافرەتە، لە من بەهێزتر و پتەوترە!

ویستم خۆم فڕێدەمە خواراوە چونکە هەرگیز بە خەیاڵمدا نەهاتووە بتوانم ڕۆژێک بەبێ دایکم بژیم، ئەو دایکەی هۆگربوو پێمانەوە و هۆگربووین پێوەی لە هیچ دایک و کوڕێکی تر نەدەچووین، دایکم وابوو.....ئاه، وابوو چ سودێکی هەیە. ئەوەی بوو بوو؟

ئەوا چەندین ساڵ بەسەر ڕۆشتنیدا تیپەڕیووە، لێ هەستدەکەم دوێنێ ڕووداوەکە ڕوویداوە، دەروونم غەمبار دەبێت و ناتوانم یەک وشەی لەسەر بنووسم.

لە دوای مردنی باوکم، دایک و باوک بوو بۆم، خۆشەویست و مامۆستا و دونیا و دوارۆژم بوو....دایکم بوو.

ئەو دایکەی لە ناکاودا بەڵا داباریی بەسەریدا وەک چۆن ئەو دارە پڕ چڵەی لە بەهاری گەشەکردنیدایە و گەردەلولێک لێی دەدات و بە شکاوی و وشکی جێی دەهێڵێت.

ئەو دایکەی کە هەرگیز لەبیرم نەکردووە، هەرگیزیش یادم نەکردووە! دەروونمی پڕکردووە بەڵام یادی نایەتە سەر زارم. لە

خەونەکانمدا دەیبینم زیندووە هەستەکەم دووبارە گەڕاوەمەتەوە بۆ ژیان و دەمەوێت لە ئامێزی بگرم، چاوم دەکەمەوە هەست بە گەرمی زللەی زەمانە دەکەم، بەڵام بەرگەی زللەکە دەگرم، بە هیچ شێوەیەک بە براکانم ناڵێم نەبادا ئەو شتەیان بیربخەمەوە کە لە بیریان چووە یان بەڵاکەیان بۆ تازە بکەمەوە، یادی دایکم فەرامۆش دەکەم و فەرامۆشی دەکەن، لەوەیە هەریەکەیان هەست بەوە بکات کە هەستی پێدەکەم و دەیشارێتەوە وەک چۆن من دەیشارمەوە!

لەو کاتەدا ساتی ماڵئاوایی کردنم بیرکەوتەوە چونکە غەمباربووم، هەموو ئازارەکانم تەنها یەک مانایان هەیە ئەویش ئەوەیە من بیری مردنی دایکم دەکەوێتەوە، ئەوە تاکە ئازاری منە و هیچ ئازارێکی ترم نییە.

کە بەئاگا هاتمەوە تەماشای دەموچاوی ماڵئاوایکارەکانم کرد دووبارە وێنەی دایکم بینیەوە، بەڵام وێنەیەکی زیندوو لە دەموچاوی براکانمدا. ماڵئاوایم لێی کرد بە فرمێسکێک لە چاودا و زەردەخەنەیەک لە دەمدا و ئاماژەکردنێک بە دەست، پاشان ئۆتۆمبێلەکە دەستیکرد بە ڕۆیشتن و ڕوویکردە سارا....

ئەمە ڕووداوی یەکەم بوو!

* * *



ڕووداوی دووەم لە کەناری دیجلەدا بوو لە بەشی یەکەمی شەودا، وێستگەی خۆرئاوای بەغداد پڕبوو لە دەیان باشترین لاوی بەغداد و جوانترین کچەکانی، وانە و تاقیکردنەوە تزیکەکەیان وازلێهێناوە و بەمشەوە لە ماڵ هاتوونەتەدەر بۆ ئەوەی ماڵئاوایی لە هاوڕێیەکیان بکەن، خۆشیویستن و خۆشیان ویست. دڵسۆزبوو بۆیان و ئەوانیش بۆی دڵسۆزبوون، ئەو هاوڕێیە منم. ئەوانیش خوێندکارەکانمن، بەڵکوو براکانمن، هاتوون ماڵئاواییم لێبکەن نەک وەک ئەنجامدانی ئەرکێکی فەرمی نەک بە هیوای پاداشت و لە ترسی سزا، بەڵکوو بە وەفا و خۆشەویستییەوە.... خۆشەویستی جوانترین شتە لە وجوددا، وەفاش پیرۆزترین شتە تێیدا لە دوای ئیمانەوە، منیش پاڵمدابووە بە پەنجەرەی شەمەندەفەرەکەوە کە دەمبات بۆ بەسرە، گوێم گرتووە بۆ وتار و شیعرەکانیان کە هەستوسۆزییانی تێکەڵ بووە و بە یارمەتی دڵیان نوسیوویانە، ڕادەمێنم تەنها بەرەدا و دیمەشق و براکانم دەبینم.

لێم ئاوابوون لە شێوەی واق وڕماندا، کاتێک بە ئاگا هاتمەوە بە تەنیابووم لە شەمەندەفەرەکەدا. ئەو دیارییە دەگرمە دڵم کە خوێندکارەکانم پێشکەشیان کردووم. لە پەنجەرەکەوە تەماشام کرد هیچم نەبینی تاریکی نەبێت...

* * *

یەکەمجار کە چوومە پۆلەوە تامەزرۆی شارەکەم بووم ڕقم لە غەریبییەکەم بوو ئازاری دەدام و دەیسوتاندم، لە پۆلەکەدا تەنها چاوانێکی وەستاو و دڵانێکی پشت هەڵکردو لەگەڵ دەمانێکی داخراوم بینی، لەلایەن منەوە عەدەم بوون چونکە لە یادگەمدا بوونیان نەبوو. بەڵام من نەوەستام و دڵم خستە بەردەستیان، خۆشم ویستن وەک چۆن برایەک براکەی خۆشدەوێت( هەموویانم خۆشویست نەک یەک دانەیان) دڵسۆزبووم بۆیان و سووربووم لەسەر ڕازی کردنیان، هەستم دەکرد خۆشی دەروونم داگیردەکات لەوکاتەی چاکەیەک پێشکەشی یەکێکیان دەکەم یان خراپەیەکی لێدووردەخەمەوە، دڵم شەق دەبات گەر یەکێکیان ببینم خەفەت دەخوات، نەدەڕۆیشتم هەتا خەفەتەکەی کەم نەکەمەوە و جەخارەکەی لێدوورنەخەمەوە، بۆیان دەژیام و بەوان دەژیام و لەگەڵیان دەژیام.

سەوم لەبەردەستیاندا دانا و هەموو ئەو شتانەم نیشاندان کە چەندین ساڵە تێمکردووە؛ لاوازترین بۆنەم دەقۆستەوە بۆ ئەوەی ئاشنایان بکەم بە جوانی ئەدەبی عەرەبی و گەورەیی کەلەپووری ئیسلامی، بەنرخی بیرکردنەوەی تازە، و ئاراستەی ڕەخنەی نوێ، فێری سەربەخۆیی بیرکردنەوەم دەکردن، هانمدەدان بۆ موناقەشە کردن، دەسەڵاتی مامۆستایم بەکارنەدەهێنا بۆ قەناعەت پێهێنانیان، چونکە ئەمە لاوازییە، بەڵکوو هێزی کەسی ڕاست و زمانپاراوی



موناقەشەزانم بەکاردەهێنا. دانم دەنا بەڕاستیدا گەر لە لای ئەوانەوە بەدەربکەوتایە، دانم بەوەدا دەنا کە من نایزانم.

بەهرە فەرامۆشکراوەکانیانم زیندوو دەکردەوە، هانمدەدان بۆ بڵاوکردنەوە و بەرهەم هێنان.

مامۆستاکانی هاوڕێم ئاگاداریان دەکردمەوە لە دەرئەنجامە خراپەکانی ئەمکارە، چونکە خوێندکارەکان((بە بۆچوونی ئەوان)) نرخی ئازادی و نەرمونیانی نازانن و بە بێدەسەڵاتی و لاوازی دەزانن و دەیکەنە هۆکاری گێرەشێوێنی، لێ من بینیم نرخی دەزانن و ڕێزی مامۆستایەکی زانایی نەرمونیان دەگرن زیاتر لەو ڕێزەی لە مامۆستایەکی توند و تیژی دەگرن، بینیم ئەم ڕێگایە زۆر زۆر سوودی هەبووە، خوێندکارەکان ڕوویان کردە وانەی ئەدەب لە کاتێکدا پێشتر پشتیان تێکردبوو، وانەی ئەدەب بووبە دڵخوازترین وانەیان کە پێشتر ڕقیان لێیبوو، تێیاندا نووسەر و شاعیر و ڕەخنەگر دەرکەوت، ئومێد دەکرێت لە چەند ساڵی داهاتوودا ژیانی ئەدەبی لە عێراقدا زیندوو بکەنەوە.

سەر و دڵم لەبەردەمیاندا دانا، ئەوکاتەی بەرهەمەکەی هاتە بەر و، لەوەدەمەی ئەم چاوانە بە دڵسۆزییەوە جوڵان و ئەم دڵانە بە خۆشەویستیەوە پێشوازییان کرد و ئەم دەمانە بە جوانترین گفتی زانستی و ئەدەبی و خۆشەویستیەوە کرانەوە....لەو دەمەی هەموو

ئەو جیاوازییانە سڕانەوە و زۆرلەخۆکردن لە نێوان مامۆستا و خوێندکاردا نەما، هیچ نەمایەوە جگە لە کۆمەڵێ برا نەبێت یەکێکیان بۆ هەمویان دەژی و هەموویان کار بۆ یەکێکیان دەکەن.....فەرمان هات بە گواستنەوەم بۆ بەسرە!

• • •

ئەوەتا ئێستا لە بەسرەم لەم ژووورە بچووکەدا، یادی دانیشتنەکانمان دەکەوێتەوە لەسەر کەناری دیجلە و دڵم بەخێرایی لێدەدات، وێنەی برا شاعیرەکەمان دەهێنمە پێش چاوی خۆم کە شیرینترین شیعرەکانیمان بۆ دەڵێت، کە لە نەرمیدا وەک شەونمی نەرم و خاوە، لەولایەوە دیجلەیە کە خۆرئاوابوون پۆشاکێکی لەبەرداکەنیووە کە چنراوە لە پەتی نوور و سەد ڕەنگی تێدایە....یادی ((شەوی باران))ەکە دەکەمەوە؛ ئەو شەوەی لەو باخچەیە بووین کە دەکەوێتە پشتی فرۆکەخانەی مەدەنی لە بەغداد و لەبەردەماندا ئەم فەزا گەورەیە هەیە کە درێژ دەبێتەوە بۆ...دیمەشق، هیچ شتێک بەری ناگرێت، ڕووناکی گڵۆپە سوورە بەهێزەکانی فرۆکەخانەکە دەیدا لە باخچەکە و ئەوانەی تێیدابوون وەک ئەوەی بەشێک بن لە جیهانێکی ئەفسوناوی، سرووشت لەبەردەماندا وەک نیگارێک دەردەکەوت کە پەڕی ناوازەترین وێنەکێش کێشاویەتی، ئەم سوورییە سەرسوڕهێنەرە و شینی ئەم ئاسمانە سافە و ڕەشی شەو لەلای ئاسۆوە و، ئافرەتانیش بە پۆشاکە فرە ڕەنگەکانیانەوە، پێش




خزمەتەکان بە کراسە سپیەکانیانەوە، بەسەر گیاکاندا ڕێیان دەکرد و هیچ دەنگێکیان لێوە نە دەهات، بە چرپە قسەیان دەکرد....

شنە بایەکی نەرمی ژێنەرەوە بوو، دەیدا لە گوڵەکان و ئەو ئاوەی بۆندار کردبوو، ڕووناکیەکان دووربوون وەک ئەوەی وێڵ بێت لە تاریکییدا و بلەرزێت لە ترسدا، ئەو شەوە سرووشت هەموو جادوویەکانی کۆکردبویەوە: سافی ئاسمان و هێمنی شەو و، ئەو بەهارەی ئەم باخچەیەی ڕازاندبۆوە و بە گوڵ و گوڵزار هۆنیوەتەوە و پوختەی هونەرەکانی و بەرهەمی بەهرەدارییەکەی تێدا داناوە.

هەموو شتێک عاشقبوو، مەستبووبوو بە مەی جوانی و خەونیان دەبینی؛ سارای فراوان مەست بووبوو ڕۆچووبوو لە تاریکییدا و خەونی بە سێبەر و ئاودوە دەبینی، تەختایەکەی ئەولامان خەونی بە بەهارێکی بەردەوامەوە دەبینی، دوێنێ گەڕابویەوە خەونی بە نەمرییەوە دەبینی. سبەینێش خەونی بە شەوێک بە هاوشێوەی ئەم شەوانەوە دەبینی.

منیش خەونم دەبینی....موڕاعاتی نەکردم و لە ئاسمانی خەونەکانمەوە هێنامیە خوارەوە تەنها پێکەنینێکی شیرینی نەرم نەبێت کە لە دەنگی ئاڵتون دەچوو، بە گوێیەکانم گوێبیستی نەبووم بەڵکوو بە چاوەکانم بینیم دەچووە سەر شەونمی سوور هەتا نقووم بوو

لە تاریکیەکی هێمندا، بێدەنگی گەڕایەوە...پێکەنینی عاشقەکان وجوددی لەبیربردبووەوە و بە زیندوویی لە خەوندا ونبووبوون! هاوڕێ شاعیرەکەم بزواو و، چەمایەوە بۆم و یەکێک لە گۆرانییە ((نوێیەکانی)) چرپان بە گوێمدا:

باخی لێوم بە ماچ ڕواند گوڵ و گوڵزاری گرت.
لێ کەس نەبوو لێی بکاتەوە وشکبوو.
جێگای خۆشەویستم لە دڵمدا ڕاخست و بۆنخۆشم کرد.
بەڵام کەس لەسەری نەخەووت و تۆز سەری گرت.

وەک ئەوەی خەڵکی کە ئافرێنران بە نیوەی ئافرێنراون، پاشان لە ژیاندا بڵاوکرانەوە، ئەوەی نیوەکەی خۆی دۆزییەوە بوو بە مرۆڤ، ئەوەی جگە لەوەی دۆزییەوە شێواوە، ئەوەی هیچی نەدۆزییەوە هەر بە نیوە مرۆڤی دەمێنێتەوە.

لە کوێی ئەی نیوەکەی ترم؟

ئەو نیوەیەم لە دەستدا کە دڵمی تێدابوو، ئەوە کێیە دڵم لە سنگیدا لێدەدات؟
ئەوە کێیە بە چاوی من دەبینێت و بە گوێی من گوێ بیست دەبێت؟

ئەوە کێیە کە هەرگیز نەمبینیووە، هەرگیز جگە لەویش نابینم؟

هەستم کرد ئەم گۆرانییە بەرزی کردمەوە بۆ جیهانێک کە هەمووی باشی و جوانییە، هەستم بە هەستییەکی سەرسوڕهێنەر کرد، زانیم ئەوەی منی تێدام ئەوبەری ئاسوودەیی و کۆتایی بەرزتییە، ئا لەم کاتەدا گوێم لە ئاوازێکی دڵڕفێن بوو دووبارە بەرزی کردمەوە، هەتا ئەوەم بینی من تێیدا زەوی بووم و ئەویش ئاسمان، وشەکەی فاگنەرم بیرکەوتەوە:

((مۆسیقا ئەوکاتە دەسپێدەکات کە شیعر کۆتایی دێت)).

جوانییەکانی تێکەڵ بوو لێمان، بوون بە یەک وزە چرپەی خۆشەویستی و ئاوازی مۆسیقا بە بۆنی گوڵ، بۆنی عەتر بە پەتی پرشنگدار و ئاوازەی ڕەنگەکانی تێدا کۆبووبوووەوە، وامان لێهات گوێمان لەوە دەبوو کە دەبینرێت، بۆنی ئەوەمان دەکرد کە دەبیسترێت، هەستەکان بوون بە یەک هەست، ئەویش هەستی جوانی بوو!

* * *

ئەوەتا ئێستا یادی سەدەها یادگاریی دەکەمەوە، وا وێنادەکەم هەموو خوێندکارەکانم لە بەرانبەر منن تەنانەت دەستم درێژدەکەم بۆ ئەوەی تەوقەیان لەگەڵدا بکەم، وەلێ تەنها هەوا دەستم دەگرێت، بەبێ ئومێدی دادەنیشم. ئەو لاوانە بوون بە بەشێک لە من چونکە لە

دەروونمدا یادگارییان ژیاندەوە، وەک چۆن لە دەروونیاندا یادگارییم ژیاندەوە، ئێمە پێکەوەین گەرچی لێکەوە دوورین!

ئەوەتا هۆگری ئەم شارە بووم کە ڕقم لێی بووی. خۆڕاگردەبم لەسەر نارەحەتییەکانی ژیان لە پێناو ئەو خوێندکارانەدا کە خۆشیان دەوێنم، منیش خۆشمدەوێن و هۆگرییانم، تەنها بۆ ئەوە دێن بۆ قوتابخانە هەتا گوێبیستی وانەکانم ببن، ئەگەر وانەم نەبێت لە ماڵەوە دەمێننەوە و هەوڵدەدەن و ئامادەکاریی دەکەن بۆ تاقیکردنەوە. هەموو هەوڵیان بۆ یارمەتیدان و دوورخستنەوەی ئازارە لێم..........................سوورن لەسەر هێمنیم زیاتر لە سووربوونیان لە سەرکەوتن لە تاقیکردنەوەکانیاندا، وتەیەکی منیان پێ باشترە لەوەی یاسا دەیڵێت.

لە پێناوی ئەمانەدا خۆڕاگر دەبم کە خۆشەویستی خۆیان لە دڵمدا چاندووە بۆ ئەوەی سبەینێ لێی بکەنەوە و بە برینداری لێی بگەڕێن، ئەمە ژیانی مامۆستایە؟

چ دەمێنێتەوە لە دڵێک کە هەر پارچەیەکی لە قوتابخانەیەکە؟

مژدەبێت لەو مامۆستایەی دڵی نییە...

بەدبەختی بۆ مامۆستایەک گەر مرۆڤ بێت!

* * *



# لەوەی بەسەرم هاتووە

لە ساڵی ١٩٤٥دا ...

من کەسێکم کە خوێنەرانم لە دوورەوە لە هەقیقەتی خۆم زیاتر گەورەم دەکەن، بۆچی ئابڕووی خۆم ببەم لەلایان؟ باسی چیان بۆ بکەم، ڕووداوەکان زۆرن، ئەوانەی بەسەرمدا هاتووە کتێبێک پڕ دەکات؟

پاشان وتم: بۆچی باسی ئەمەیان بۆ نەکەم...باسی هەقیقەتی خۆم و وێنەم لەلای خوێنەران؟ لەم ڕووەوە چەندین باسی خۆشم هەیە، ماوەی بیست ساڵە لە ڕۆژنامەکانی شام و گۆڤارەکانی میسر و لوبنان بابەت دەنووسم وەک نووسینی پیرەمێردێک، خوێنەرەکان وایاندەزانی پیرەمێردێکی سەرسپی پشت چەماوەم و بە هێواشی ڕێدەکەم، لە ڕوومدا نووسینی ڕۆژەکان و ئەزموونی دێرەکان بە دیارکەوتوون. پێم خۆشنەبوو ئەم ڕووداوە خۆشانە بڵاوبکەمەوە چونکە سوودی نییە بۆ گوێگرەکان ئەگەرچی بە چێژە بۆیان، بەڵام ئێستگەکە ویستیان باسی شتێک بۆ گوێگرەکان بکەم کە بەسەرمدا هاتووە، پێکەنیناوی بێت یان نا. پێکەنینیش

کێشەی نییە و سوودی هەیە بۆ جەستە و جوڵەی خوێن خێراتر دەکات و حەز زیاد دەکات، بەڵام موسیبەتەکە ئەوەیە نوکتەیەکی سارد بڵێیت و پێیبکەنن، یان کەسێکی ڕەزا قورس بم و خۆم ناسک بکەمەوە. ڕەزا قورسیش خۆی ناسک بکاتەوە دەبێتە بە تاعون.....پەنا دەگرم بە خودا.

خوشک و برا بەڕێزەکانم.... لەوەی بەسەرمدا هاتووە:

جارێکیان (ئەو دەمە لە هەرەتی لاوێتیدابووم سەرەتای نوسینم بوو لە ڕیسالەدا ساڵی ١٩٣٣) سێ کەسی بێگانە هاتن بۆلام، شێوە و قسەیاتم بە دڵنەبوو، لە بەردەرگا وەستام و تەماشای شێوەیانم دەکرد. شێوەیان بەڵگەبوو بۆ ئەوەی ڕەزاقورسن، تەماشای منیان دەکرد وەک منداڵێک دەیانبینیم. وتیان: ئەمە ماڵی بەڕێز شێخ تەنتاوییە؟ بەبێزاییەوە وتم: بەڵێ. وتیان: باوکت لە ماڵە؟ وتم: نەخێر. وتیان لە کوێ بگەینە خزمەتی؟ وتم لە گۆڕستانی دەحداح، لەلای ڕێگای ڕووبارەکە بە ڕووی باشوردا. وتیان: سەردانی مردووەکانی دەکات؟ وتم: نەخێر. وتیان: کەواتە؟ وتم:ئەو سەردان دەکرێت....یەکێکیان قیژەیەکی کرد بەسەرمدا ترساندمی، وتی: مرد؟ چۆن مرد؟ وتم: ئەجەلی هات و مرد. وتیان: خودا پاداشتان بداتەوە، إنا لله وإنا إليه راجعون، ئەدەب چ زیانێکی کرد! وتم: یەکێک بوو لە گەورە فێرخوازەکان بەڵام ئەدیب نەبوو. وتیان: داماو، تۆ باوکت ناناسیت!

ڕۆیشتن و دەرگام داخست، بە تەنها لە پێکەنیندا قرتابووم وەک شێتەکان. وامدانا شتەکە تەواوبووە، نە گەشتە نێوارە خەلکی کۆمەڵ بە کۆمەڵ دەهاتن بۆلام، گەر نەیانناسیمایە بەبێ دەنگی دادەنیشتن، ئەوەشی دەیناسیم پێدەکەنی و دەیوت: ئەم نوکتە پووچە چییە؟ دەموت: چ نوکتەیەک؟ یەکێکیان ڕۆژنامەیەکی دەرکرد و وتی: ئەمە، ئاگات لێی نییە؟ لێم سەند تێیدا نوسرابوو(( مردنی نووسەری .......وا و وا، عەلی تەنتاوی ))!

ئەمە یەک

لەوەی بەسەرمدا هاتووە:

لەو کاتەی لە عێراق بووم لە ساڵی ١٩٢٦ نەقڵ کرام لە بەغدادەوە بۆ بەسرە بەهۆی دژایەتی کردنێکەوە لە نێوان من و موشریفێکدا، هاتە پۆلەوە و گوێی لە وانەکەم گرت، کە هاتینە دەرەوە(دووڕوویی کرد) وتی سەرسامم بە نووسین و فەزڵەکانت، (دووڕوویم کرد) وتم شانازی بە گەورەیی و ئەدەبەکەتەوە دەکەم( پێشتر ناویشیم نەبیستبوو). پاشان دەستیکرد بە ڕەخنە گرتن لە وانەکەم، وتم: تۆ خۆت بەچی دەزانیت؟

پێی وتم و پێم وت....دیمەنێکی جوانبوو لەبەردەم خوێندکارەکاندا و نموونەیەکی باڵایان بینی لە لێک تێگەشتنی دووبرا و وینەیەکی

چاکی و ڕەوشت بەرزی. پاشان وتارێکم لەسەر نووسی پشتیم شکاند، دەستی لە کارکێشایەوە و گەڕایەوە بۆ شارەکەی، منیش نەقڵ کرام- وەک سزایەک- بۆ بەسرە.

گەشتمە بەسرە و چوومە قوتابخانەکە، پرسیارم کرد کامە پۆلی ((بەکالۆرییایە)) لە دوای ئەوەی تەماشای خشتەی وانەکانیانم کرد و کاتی وانەی ئەدەب بوو، بەرەو پۆلەکە ڕۆیشتم بەبێ ئەوەی قسە لەگەڵ کەسدا بکەم یان خۆم بناسێنم.

کە نزیکبوومەوە لە پۆلەکە مامۆستایەکم بینی، بە تەمەنێکی بەغدادی بوو نزیکبوو لەوەی خانەنشین بکرێت، قسەی بۆ خوێندکارەکان دەکرد و ئامۆژگاریی دەکردن، گوێم لێبوو وەسیەتی بۆ دەکردن باش بن (لە بەڕێزی خۆیەوە) بۆ ئەوکەسەی دێتە شوێنم ئوستاز تەنتاوی، ئەمەو ئەوەی دەوت و ستایشی دەکردم....وتم: کاتێکی گونجاوە بۆ ئەوەی منیش بە شانیدا هەڵبدەم و ستایشی بکەم، بیرم چوو سەرم ڕووتە و لەتاو گەرمادا قاپووتەکەم بە دەستمەوە گرتووە و کراسی قۆڵ کورتم لەبەردایە، بەهێواشی دام لە دەرگا و ویستم بچمە ژوورەوە. ڕووی تێکردم و هاواری کرد: ئێ کەرە زل بۆ کوێ؟ تەماشای خۆمم کرد: ئایا گوێکانم درێژن؟ کلکم هەیە؟وتی: چییە؟ تێناگەیت؟. لەبەر خۆیەوە دەستی کرد بە

قسە کردن جۆرەها جوێنی تێدابوو کە نەمدەزانی واتای چییە و بە پێکەنینەوە گوێم گرتبوو.

پاشان وتی: وەرە با خوێندکاری ئاخر زەمان ببینین، بوەستە و باسی بەختەریمان بۆ بکە، هەتا بزانین تۆ کەریت یان نا؟

وەستام و دەستم کرد بە قسەکردنێکی هێمن و ڕێکخراو، بەشێوازێکی شیرین و زمانێکی ڕەوان. گەڕام و شیمکردەوە و نموونەم هێنایەوە و شرۆڤەم کرد، بەراوردم کرد لەگەڵ ئەبوتەمامدا. بە کورتی وانەیەکم وتەوە کە هاوشێوەی من دەیڵێتەوە.....خوێندکارەکان واقیان وڕمابوو، ملیان درێژکردبوو هەناسەیان سواربووبوو، مامۆستاکەش لە کورسییەکەی دابەزیبوو هاتبووە بەرانبەرم و لە شۆکبوونیدا خەریکبوو چاوەکانی بێنە دەرەوە و نەیدەتوانی قسە بکات، منیش تەماشام نەدەکرد وەک ئەوەی هەر نایبینم، هەتا جەڕەس لێیدا.

وتی: تۆ کێیت؟ ناوت چییە؟

وتم: عەلی تەنتاوی.

ئەوی تری بۆ گوێگرەکان جێدەهێڵم وێنای بکەن!

بەسرە ڤێنسای عەرەبە، لە هەموو شەقامێکدا جۆگە هەیە، ئەگەر بتەوێت بە ڕێگای ئاویدا دەڕۆیت، ئەگەر بتەوێت بە ڕێگای وشکانیدا دەڕۆیت، شەتولعەرەبی تێدایە، هیچ جوانیەکی ئەم دونیایە هاوتای نابێت لەوکاتەی بەو گەمییە جوانانە پێدا تێپەڕ دەبیت. بەسرە خانەی ئەدەب و شوێنی شیعر و سەرچاوەی عەرەبی بووە، مێژووەکەی مێژووی ڕەوانبێژی عەرەبییە. لێ ڕۆژەکانم لە بەسرە هەمووی بەدبەختی بوو، بێزارییەکی بەردەوام بوو. تێیدا ڕووداوی پێکەنیناوی و ڕووداوی گریاناویم هەیە، ئەگەر ئەو خولەکانەی ئێستگەکە بۆی دیاریکردووم تەواو نەبوایە باسیانم دەکرد.

بەڵام نەخێر، سوپاسم بۆ ئێستگەکە هەیە کە کاتی بۆ دیاری کردووم، لێمگەڕا بە تەنیا سەرقاڵی یادگارییەکانی دوێنێ ببم، بە ئارەزووی خۆم لە ڕابردوودا بژیم، گوێگرەکان چاودێریم ناکەن و هیچ کەسێک بەشداری ناکات لەگەڵمدا لە چێژی یادکردنەوەدا.

***



# پێشەکی دیوان

ئەمە پێشەکی دیوانی شاعیرێکە کە [illegible] دوری [illegible] بڕام بوو. بڵاویدەکەمەوە وەک چۆن لە ساڵی ١٩٤٨، بەبێ ئەوەی هیچ وشەیەکی بگۆڕم. گەرچی [illegible] هەرچیەکی بگۆڕیت [illegible] دەیلێت.

پێش بیست و پێنج ساڵ بەڵێنم بە ئوستاز ئەنوەر عەتاردا ئەم پێشەکییەی بۆ بنووسم، لەو ڕۆژەی گوێبیستی یەکەمین پارچە شیعری بووم، پێم وت: ئەنوەر تۆ دەبیت بە شاعیرێکی مەزن، منیش دەبم بە نووسەر و پێشەکی دیوانەکەت بۆ دەنووسم.

ئەنوەر بوو بە شاعیر ئایا من بووم بە نووسەر؟ هەتا ئەمڕۆ پێنج هەزار لاپەڕە زیاترم نووسیوە، بە دارشتنەوە دامرشتۆتەوە و کۆمنەکردۆتەوە، لە دڵمەوە نەقڵم کردووە و لە کتێبەوە نەقڵم نەکردووە، بەڵام نەبووم بە نووسەر، چونکە ئەمشەو دەستەوسانم لە نووسینی خۆشەویسترین بابەت لەلام و پێویسترینیان لەسەرم: ئەو پێشەکییەی پێش بیست و پێنج ساڵ بەڵێنمدا بە ئەنوەر بۆی بنووسم!

دانیشتم پێشەکییەکە بنووسم، هەستم کرد گەڕامەتەوە بۆ ڕۆژەکانی ڕابردوو کە لە دەستمداوە و دڵنیابووم ناگەڕێتەوە، پەردە لەسەر جیهانێک لاچوو هەمووی خۆشەویستی و پاکی و جوانی بوو، جیهانێک من و ئەنوەر زۆر تێیدا ژیاین، پاشان لە دەستمان چوو، ڕێگاکەمان ونکرد. جیهانێک کە هەقیقەتێک بوو، بەداخەوە ئێستا بۆتە یادگاری، واقعبوو، بوو بە خەیاڵ، ئێمە تێیدا بووین ئێستا نامۆیین پێی، تەنها بە دڵ دەیبینین لە ڕێی تەم و مژی ڕابردووەوە.

دەرگای یادگارییەکان بە ڕوومدا کرایەوە، ڕابردوو بۆم دووبارەکرایەوە وەک ئەوەی فیلمێک بێت و پڕ بێت لە جوانی و مەردایەتی، فیلمێکی درێژ لە چەند ساتێکدا پێشانم درا، کە نووسین و دەرهێنانەکەی سی ساڵی پێچووە، فیلمێک خۆمان پاڵەوان و ئەکتەری بووین، وامان لێهات لە دوورەوە وەرزەکانیمان پێشان درا.

وەرزی یەکەمی ئەم فیلمەم بینی، لە تاکە قوتابخانەی ناوەندی دیمەشق بوو، ((مەکتەبی عەنبەر))، لە کۆتاییەکانی جەنگی جیهانی یەکەمدا، ئەو کاتەی بۆ یەکەمین جار ئەنوەر عەتارم بینی. خوێندکارێکی نەرم و نیانم بینی، ڕووخۆش و قۆز،



پۆشاکێکی جوانی پۆشیبوو بەبێ ئەوەی شوێنەواری زەنگینی پێوە دیاربێت، تەماشاکردنەکەی وڵلیی پێوە دیاربوو، بە سێبەری دیوارەکاندا بە هێواشی و بە هێمنییەوە ڕێی دەکرد، وەک ئەوەی شەبەنگ بێت و بە خەیاڵی کەسێکی خەوتودا بڕوات، دووره پەرێزبوو لە خوێندکارەکان و یارییەکانی ئەوانی ئەنجام نەدەدا، پرسیارم کرد لەوانەی دەیناسن، وتیان: ئەمە خوێندکارێکی شاعیرە ناوی ئەنوەر عەتارە، ئەو کاتە تەنها بڕوام بە شاعیرانی سەردەمی نەفامی و ئیسلامی هەبوو، ڕازی نەدەبووم شیعری موتەنەبی بخوێنمەوە و مامۆستاکانیشم بەمە ڕازی نەدەبوون بەمە بۆ ئەوەی بەهرەکانم تێک نەچێت، گوێبیستی ناوی شەوقی و مەنفلوتیش نەبووبووم، هەربۆیە ئەم شاعیرەم بە گەورە نەزانی کە ناوی ئەنوەر عەتارە نە داوای هاوڕێیەتییم لێ کرد، گومانیشم وانەبوو لە نێوان من و ئەودا پەیوەندیی ڕوودەدات، هەتا ئەو ڕێکەوتە بەختەوەرهێنەرە ڕوویدا، که لە ژیانی من و ئەودا گەورەترین کاریگەری هەبوو:

ئەم ڕێکەوتە لەبەر دەرگای ((قوتابخانەی بادرائییە))بوو لە شەوێک لە شەوەکانی ڕەمەزاندا، ئەو ڕۆژانەی بەڕاستی ڕەمەزان سەردانی دیمەشقی دەکرد و دیمەشقیش دەیزانی بە سەردانی کردنەکەی و ئاهەنگی دەگێڕا بەهۆی دیدارییەوە، من لە دەرەوەی بووم و ئەنوەرم لە ناوەوە بینی، سڵاومان لە یەکتری کرد و پێکەوە گفتوگۆمان کرد، قسەکردنمان درێژەی کێشا و لە ژێر ڕووناکی

شەقامەکەدا وەستا بووین هەتا باسی شەوقی هات، شیعرێکی ئەوی بۆ خوێندینەوە، بە دەنگێکی شیرین و بەسۆزەوە خوێندییەوە، هەستم دەکرد بە هەر وشەیەکی شیعرەکە دەدات لە دانەیەکی دڵم. خۆشەویستی، یەکەمجار دەگەیت بە کەسێک هەست دەکەیت خۆشتەوێت یان ڕقت لێیەتی، هۆکاری خۆشویستن و ڕق لێبوونەوەکەت نازانیت.... نهێنییەکە خودای گەورە کردویەتییە دەروونی مرۆڤەکانەوە.

بە قسەکانیدا تێگەیشتمماڵیان لە سەمانەیە، منیش لە دیمەجیە نیشتەجێ بووم، بووین بە هاوڕێ. باسی مردنی باوکمم بۆی کرد لەو ڕۆژانەدا، ئەویش باسی مردنی باوکی بۆ کردم کە منداڵ بووە، بە بازاڕی عیمارەدا تێپەڕین( عیمارە لە دیمەشقدا وەک گەڕەکی حوسەین و ئەزهەر وایە لە میسردا، گەر ڕەمەزانت لێ ونبوو بە گەورەیی و جوانییەکەیەوە لە حوسەین و عیمارە دەیدۆزیتەوە، گەر باشییەکانیت لێ دیارنەما لە هەموو شوێنێک لە عیمارە یان حوسەیندا دەیدۆزیتەوە). بەڵام ئەو شەوە هەستم بە هیچ شتێک لەو گەورەییە نەکرد. ئەوەی لە ئەنوەرەوە گوێبیستی دەبووم گەورەتربوو لەلام لەوەی دەمبینی. ڕێمان کەوتە دەحداح. ئا لێرە، لەسەر گۆڕی باوکی و گۆڕی باوکم، ئەم هاوڕێیەتییە لە دایکبوو کە شیعر و بەخشان و خۆشەویستی و دڵسۆزی لێهاتە بەرهەم، جوانترین و ئاسوودەترین هاوڕێیەتیی بوو. لێرە، لە شاری مردووەکان، ئەم

خۆشەویستیە ژیا کە مردنیش ناتوانێت لەناوی ببات، چونکە ئەدەب ئەمری پێ بەخشیووە.

وەرزی فیلمەکە بەردەوام بوو، بینم بووم بە هاوڕێی و بوو بە هاوڕێم، باسی خەمەکانی خۆمم بۆی دەکرد و باسی خەمەکانی خۆیی بۆ دەکردم، لە ژیانییدا ژیانی خۆمم دەبینی، لە ژیانمدا ژیانی خۆیی دەبینیەوە، ئەدەب و سێویی بوون هۆگری یەکتری کردین، دۆخی ژیانمان مام ناوەندبوو، یەک پلە لە سەرووی هەژارییەوە نە دەگەشتە دەوڵەمەندییش.....هەتا وای لێهاتبوو من ئەو بووم و ئەویش من بوو.

شیعرەکانی خۆیی بۆ دەوتم، تۆبەرەی شاعیرێکی بە توانام دەبینی نەک هەوڵی خوێندکارێکی سەرەتا، لەم تۆبەرەدا بەهێزی گوزارشت کردن و بەرزی بیرکردنەوەم دەبینی، لەبارەی ئەسرینەوە دەڵێت:

عجبي من لغة غامضة تطرب الناس على شتى لُغاها

ئەمە پارچە شیعرێکی بەرزە لە داڕشتنەوە و واتاکەیدا. لە پەسنی تەمەندا دەڵێت:

والعمر يَحكي مستغيثا عَلا أنينه ثم تولَى صداه

ئەنوەر پارچە شیعری دەوت، شیعری دڵ، بە دوای یەکدا. لە کانیەکی پاکەوە هەڵیدەگۆزی کە وشک ناکات، زارەکان دەیانگواستەوە و ڕۆژنامەکان بڵاویانکردەوە، عەرەبی پێشوازی لە شاعیرێکی نوێی ئیلهام بەخش کرد، مامۆستامان موحەممەد کەرد

عەلی دەرگای بۆ کردەوە، بۆ ئەو و سێ براکەی[٢٣] ئاهەنگێکی ڕێزلێنانی سازکرد، تێیدا ئەنوەر شیعرێکی نوێ گوت بە ناونیشانی (شاعیر)، بە جوانی بابەت و وشە و واتاکانی هەڵبژاردبوو، ئەم پارچە شیعرە ڕێگای گۆڤاری ((زەهرای)) بۆ کردەوە کە خاڵۆم موحیبوودینی خەتیب لە میسر دەریدەکرد، جوانترین گۆڤاری ئەدەبی بوو لەو دەمەدا. حەزمدەکرد شاعیر لە دیوانەکەیدا بڵاوی بکاتەوە(کە بەشێکی کەمی شیعرەکانی لەخۆ گرتووە)، بۆ ئەوەی خوێنەران بزانن ئەنوەر پێش بیست ساڵ چۆن شیعری هۆنیوەتەوە. حەزم دەکرد-ئەگەر لە دیوانەکەدا بوونی نەبوایە- هەموویم لێرە دابنایە، بەڵام زۆر درێژە و لاپەڕەکانی ئەم پێشەکییە پڕ دەکات.
شیعری ئەنوەر لەو ماوەدا ئاهات بوو، هونەر کردبووی بە وێنە، فرمێسک بوو ڕەوانبێژی کردبووی بە شیعر، پارچە پارچەی شیرین بوون، نازانم بۆچی شاعیر لەم دیوانەدا داینەناوە تەنها پارچەی ((حەمامە)) نەبێت.

* * *

دەمبینی وەرزی فیلمەکە بەردەوامە.....هەموو ورد و گەورەیەکی ژیانی براکەمم بینی لە منداڵی و گەورەییدا، هاوڕێم لە شار و لە گەشتدا، هۆکاری شادوومانیم لە خۆشی و ناخۆشیدا: ئەنوەر.

---

[٢٣] جەمیل سوڵتان، زەکی مەحاسینی، ئەبوسەلما عەبدولکەریم کەرمی.

ڕۆژانی قوتابخانەم بینی ئەوکاتەی پێکەوە خوێندکاربووین، دەگەڵ ئەدەبدا لە ژیانی خەیاڵدا دەژیان، چونکە دەستەوسان بووین لە دونیای واقعدا ئەوە بەدەست بهێنین و ئاواتە خوازی بووین، وەڕەس دەبووین هەتا ڕۆژ تەواو دەبوو بۆ ئەوەی ڕزگارمان بێت لە وڕینەی دەستەی بیرکاری و تەلیسمی هاوڕێیانی کیمیا هەتا ڕابکەین بەرەو ئەدەب، بۆ ئەوەی هەموو قسەیەکی ئاوازە بخوێنینەوە و لێکۆڵینەوە لە هەموو ئاوازەییەکی ڕەوانبێژی بکەین.

ئەنوەرم بینی لە هەموو ئەدیبەکانی بردبووەوە لە ((زانست))ی بیرکاریدا، تا ئەوەی نیوەتیرەی بازنە و لایەکانی سێگۆشەش فێربووبوو، زۆری نەمابوو بگاتە کۆتایی زانست گەر (خاڵی هاوبەشەیی) بزانیایە کە - امرؤ القیس - یش نەیبیستووە، بینیم مێشکی کۆدەکردۆتەوە و ئارەقی دەسڕی، دەیویست لە نهێنی ئەو ((کێشە گەورەیە)) بگات کە لە هیچ نهێنییەکانی ناگەی، ئەو کێشەیە چارەسەر بکات کە هیچ چارەسەرێکی نییە.(ڕەگی دووجا)، شایەدی ئەوە دەدەم من چل سالێم تێپەڕاند، ڕۆژە ڕەشەکان و ناخۆشییە قورسەکانم بینی، ڕێگا سەختەکانم بڕی، لە شەپۆلە سەختەکانی دەریا ڕزگاربووم، چوومە سەرووی هەورەکان، لە وشکانی و دەریا و ئاسماندا هیچ شتێکم نەبینی قورستر و ناخۆشتر بێت لەو ڕەگە دووجایانە..!

بینیم ڕۆژگار نێوانی من و ئەوی دوورخستوەتەوە، من سەرقاڵ بووم بە ڕۆژنامەوانی و لە سیاسەتدا ڕۆچووم، ئەنوەریش فێرکردنی پێشخست، بەڕێوەبەری قوتابخانەی منین بوو، لەو گوندەدا لە دامێنی بەردەکانی قەلەموونی خوارووی، گرۆی خەونەکان دەبینی لە جوانترین (کانی) و ئەفسوناوی ترین و دڵڕفێنترینیان: کانی منین. هەرکەسێک کانی منینی نەبینیبێت جادووی کانیەکانی نەناسیوە، جوانی هەڵقوڵانی نەبینیوە، مەی جوانی نۆش نەکردووە لەسەر سفرەی سرووشت....ناوە ناوە سەردانم دەکرد شەوێک بۆ دووشەوم لە بەهەشتێکی پڕ نیعمەتدا بەسەر دەبرد، دووجار مەست دەبووم: مەستی جوانی و مەستی زمانپاراوی، ملکەچ دەبووم بۆ دوو سیحر: سیحری سرووشت و سیحری شیعر، لە ڕابردووی گەشاوەدا یادەوەرییە شیرینەکانم کۆدەکردەوە و، لەگەڵ داهاتوی بە چێژیشیدا ئاواتێکی خوازراو، لە ئێستایەکیش کە ونبووە لە مەستی چێژدا هەتا تێیدا ئێستایەك نەماوە هەست و پەی پێ ببەین، لە بەرەبەیاندا گوێم ڕادەدێرا بۆ ئەو جۆگەلانەی لە کانیەکانەوە هەڵدەقوڵا و بیسەری شیعرەکانی ئەنوەر دەبووم، شەوانیشمان لەلای بەردەڵانەکان بەسەر دەبرد کە لە دڵی خۆمانمان ڕژاند بەسەریدا هەتا وای لێهات بەسۆزبوو بۆمان و خۆشەویستی پێ بەخشین، ڕەوانبێژییمان ڕژاند بەسەریدا هەتا هاتە گۆ بۆمان، باسی ڕۆیشتووەکان و چیرۆکی پێشینەکانی غەسانی بۆ دەکردین خاوەنی شکۆمەندی و شەرەفمەندی، هەستمان دەکرد کە ڕابردوو گەڕاوەتەوە

و کۆشکەکانی بەلَخ ئاوەدان بونەتەوە و شکۆمەندی زیندووبۆتەوە و خۆشەویستی ژیاوەتەوە. تەنانەت وەها هەستمان دەکرد کە گوێمان لە چرپەی عاشقەکان و ئاهاتی مەستی و وەسوەسەی ماچەکانیانە. خەیالَی لە ئامێزگرتنەکانمان دەبینی لە پشتی پەردەکانەوە!
ڕۆژانێک کە تێیدا ئاسوودەبووین، بە بەرد و ئاوەکەی ئاسوودە نەبووین بەلَکوو بە خەونەکانی گەنجێتیەوە. ڕەحمەتی خودا لە گەنجێتیمان و ئەو ڕۆژانە بێت.

خۆمانم بینی و من بووبوومە مامۆستا لە شاخی دیمەشق(لە موهاجیرین)، ئەویش مامۆستا بوو لە قەدپاڵی شاخ(لە ساڵحییە)، بە تەساوە چاوەڕوانی شەومان دەکرد، هەر کە شەو دەهات من لێرەوە دەهاتمە خوارەوە و ئەویش لەوێوە دەهاتە خوارەوە، هەتا لە عەفیف دەگەشتین بەیەک، دڵخۆش دەبووین بە بەیەک گەشتنمان وەک چۆن دوو خۆشەویست دڵخۆش دەبن بە دیدەنی یەکتری لە دوای ئەوەی زۆر دەمێکە لێک دابڕاون.

ڕۆژەکانی عێراقم بینی، گوڵی ڕۆژەکانی من و ئەنوەر و جوانیەکانی، ڕۆژەکانی بەغداد....سلاوی خۆشەویستی و وەفا لە بەغداد بێت، سلاو لەسەر خەلکەکەی بێت، سلاو لە ئەسەری و جەوادی و ڕووحی ڕاوی و براکانم و خوێندکارەکانمان لەوێ.

ئای ڕۆژەکانی بەغداد چەندێ خۆشبوو، ئای شەوەکانی چەندێ قەشەنگ بوو، ئای چەندێ یادگاریی شیرینمان تێیدا تۆمارکرد! سڵاوی بەردا لەسەر دیجلەکەی بێت، سڵاوی حور لەسەر دار خورماکانی بێت، سڵاوی عیتابا لە ئەبوزییەکەی بێت، سڵاوی ڕەبوە و میزە و شازریوان لە ئەعزەمییە و کەڕادە و ڕۆستەمییەکەی بێت....

لەوێ هەمیشە پێکەوە بووین، ئەنوەر لە پۆلێک وانەی دەوتەوە و منیش لە پۆلێکی تر، هەندێ جار دەچووم لە جێی ئەو وانەم دەوتەوە و دادەنیشت و گوێی دەگرت، هەندێ جار دەهاتە شوێنی من و لە جێی من وانەی دەوتەوە و دادەنیشتم و گوێم لێی دەگرت. پێکەوە بەسەر جیسرەکەدا ڕێمان دەکرد. هیچ شوێنێک لەسەر زەویدا نییە پڕبێت لە یادگاری سەربەرزی و شیعر و خۆشەویستی هێندەی پردی بەغداد. دەچووینە کەناری دیجلە و دەگەیشتینە ڕیاز و، سەردانی کۆشکی خەلیفەکان و شوێنی شاعیرەکان و خەڵوەی خۆشەویستانمان دەکرد، دەچووینە خانوو و تەلار و گۆڕستان، لە نەریتی باب و باپیران نزیک دەبووینەوە و بەبۆنی ڕابردوو ئاسوودە دەبووین، دیجلەمان دەهێنایە گۆ و هەواڵمان دەدا بە شوێنەوارەکان و پرسیارمان لە دارخورماکان دەکرد، گوێبیستی ڕابردووی مەزن دەبووین لە زەوی و لە خەڵکیەوە و هەواڵی باپیرە بەهرەدارەکان، گوێبیستی چیرۆکەکانی شکۆمەندی دەبووین کە چاوی زەمانە



هاوشێوەیانەی نەیبینیبووە و پشتی زەوی شکۆمەندیەکی هەڵنەگرتووە باشتر و گەورەتر و چەسپاوتر و بڵندتر بوبێت لەوان. خەڵکی نەیاندەبینین بەیەکەوە نەبێت، دەیانووت ئەنوەر و عەلی، عەلی و ئەنوەر، هەندێ جاریش تێکەڵیان دەکرد دەیانووت عەلی عەتار و ئەنوەر تەنتاوی!

ڕۆژەکانی بەغداد باشترین ڕۆژەکانی ئەنوەربوو، تێیدا جوانترین وێنەی سرووشتی لە دەروونیدا خەزن کرد، تێیدا ناوازەترین شیعرەکانی هۆنیەوە، تێیدا لە ژیانی شاعیردا سەردەمێکی نوێ دەستی پێکرد ئەویش سەردەمی شیعری قەومی بوو: شیعری حەماسەتی نەتەوەیی. بەمەش تاڵێکی بۆ گیتارە سیحراوییەکەی زیادکرد و شیرینترین ئاوەزەکانی پێ دەرکرد.

هەموو ئەمانەم بینی هەستم کرد دونیا دەمسوڕێنێتەوە، وێنەکانم لێ تێکەڵ بوو و دیمەکان چوون بە یەکدا، نەمدەتوانی هیچ جیابکەمەوە و نەمدەتوانی هیچ بنووسم.

دەمبینی فیلمەکە بەردەوامە، لە ساڵی ١٩٣٠دا بووین من بێکاربووم(لە دوای گەڕانەوەی دووەمم لە میسر)، ئەنوەر بردمی بۆ بەڕێوەبەرایەتی لاوانی عەرەبی بۆ لای مەعروف ئەرنائوت بۆ ئەوەی لەگەڵیدا کاربکەم لە ڕۆژنامەدا، چەند مانگێک لەلای کارم

کرد، بوو بووبە شوێنی دیدەنی من و ئەنوەر، قوتابخانەی دووهەممان بوو، لە دەروون و ئەدەبی مەعروفمان وەردەگرت. لە ئەدەبیەکاندا ئەمانبینیەوە گفت شیرینتر و پڕتر لە ئەدەبی هەق بێت لە ڕەگیەوە هەتا چڵەکانی لە مەعروف زیاتر، کە لەگەڵیدا بیت هەست دەکەیت بەرزت دەکاتەوە لە جیهانی مادده و تەماحەکان، بە گفت و زەردەخەنە و ئەرمونیانیەکەی دەتگەیەنێت بە جیهانێک کە هەمووی خۆشەویستی و هەست و سۆز و تەجەڕووده، هەستم بە شتێکی تر دەکرد بەڵام ناتوانم دەریببڕم، وەک ئەو هەستەی بۆت درووست دەبێت لەوکاتەی ڕۆمانی(( عومەری کوڕی خەتاب))دەخوێنیتەوە، وەک ئەو هەستەی بۆت درووست دەبێت ئەو کاتەی ئەنوەر لە ستایش و پیاهەڵدانە شیعرییەکانییەتی.....

خۆمانم بینی لە سەرەتای ساڵی١٩٣٢دا بووین و گەیشتم بە ئەنوەر، پێی وتم: سوپرایزێکم هەیە بۆت دڵخۆشت دەکات، وتم: چییە؟ وتی: پێت ناڵێم هەتا نانێکم لەلا نەخۆیت. لەگەڵیدا ڕۆیشتم، بەڕاستی سوپرایزەکەش دڵی خۆش کردم: ژمارەی یەکی گۆڤاری ڕیساله دەرچووبوو.

لەو ڕۆژەوە هاوڕێی سێیەم هاتە نێوانمانەوە خۆشمانویست و خۆشی ویستین، ئەویش زەیات و ڕیسالەکەی بوو، ڕیساله بوو بەشوێنی قسەکانمان و لەنگەری ئەدەبمان، زەیات بوو بە براگەورە و هاوڕێی



خۆشەویستمان، گەرچی سیانزە ساڵ دوای ئەمە بینیم و ئەنوەریش هەتا ئێستا نەیبینیووە.

ڕۆژانی پەڕجوو ئاسام بینی کە لەسەر دەستی سدیق مونیر عەجلانی دەرکەوت، کە خودی خۆی بە مەحاڵی دەزانی؛ ڕۆژانی کۆبوونەوەی ئەدەبی، لەو دەمەی پیاواتێکی کرد بە هاوڕێ و خۆشەویستی یەکتری بە خەیاڵماندا نەدەهات ڕۆژگار بیانکاتە هاوڕێ و خۆشەویستی یەکتری، ڕۆژانی خۆشەویستی و چالاکی و هیوابوو، بە دوایدا ڕۆژانی دابڕان و تەمەڵی و بێهیوایی هات..... بریا ئەوەی مونیری پارێزەر دەستی پێیکرد مونیری وەزیر تەواوی بکردایە!



هەموو ئەمانەم بینی، دۆش دامام نەمزانی پەسنی چ بکەم و لەبارەی چییەوە بدوێم. چۆن دەتوانم لە وشەکاندا دونیایەک هەستوسۆز و جیهانێک لە یادگاریی و هەزارەها هەست کۆبکەمەوە، لە زەمانەدا جێگیر بوو چونکە مایەوە و زەمانەش ڕۆشت، لە تەمەن جوانتربوو چونکە جوانی تەمەن بوو؟

هەموو ئەمانەم بینی، هەموو ئەمانە تەنها پوختەی ژیانی ئەنوەرە، ئەو شاعیرەی هەموو ژیانی وەک شاعیرە دڵسۆزەکان ژیا، شاعیری

دڵ و ڕووح و زار نەک تەنها شاعیری وشە و دەرخستن، شاعیرێک دڵی هەمیشە بە ڕووی جوانی و خێردا کراوەتەوە، پڕە لە خۆشەویستی، بەردەوام لە زارییەوە زمانپاراوی و دەرخستن دێتە دەرەوە و هەناسەی سیحراوی حەڵاڵ دەدات.

لەم پوختەدا شیکردنەوەی شاعیربوونی ئەنوەر هەیە، ئەگەر ڕەخنەتان لێی گرت لەوەی هاوپەیمانی خەمە و هاوڕێی پەژارەیە، شیعرەکانی وەستاوە لەسەر پیرۆزدانانی خەمی عەبقەریی، خەونە لەدەستچووەکانی هێناوەتە گریان وەک چۆن گەڵا وەریوەکانی پایزی هێنایە گریان، ئەمری بەخشیە ڕووکەشەکانی پەژارە لە دەروون و لە سروشتدا، باش بزانن توانای جگە لەمەی نەبووە، کەسی شاعیر خۆی ناگونجێنێت وەک خۆی دەیەوێت بەڵکوو خودا بە تەبیعەتی ژینگە و کاتەکەی دەیگونجێنێت، لە منداڵیدا هەستەکانی پێکدەهێنێت پێش ئەوەی خۆی هەست بکات و هەستەکانی پێکبهێنێت، ئەگەر بتوانێت دەمی بچووک بکاتەوە یان لوتی جوان بکات ئەوا ناتوانێت دڵ و هەستەکانی بگۆڕێت!

ئەنوەر وەکوو من گەشەی کردووە، چاوی بەڕووی دونیادا کردەوە و جەنگی جیهانی یەکەم دەستی پێکردبوو، دیمەشق لە ناڕەحەترین ڕۆژەکانیدابوو، شوێنەواری خەم و پەژارە لە هەموو شوێنێکبوو، هەموو بەیانیەک ئەو قەرەباڵخیەی دەبینی لەبەردەم

هەویرکاریەکەدا(تەنها کونێکی بچووکی لێدەکرایەوە، لەوێوە نانەواکە سەری دەردەهێنا بۆ ئەوەی پارچەیەکی ڕەش بدات بە بەختەوەرترین کەس، کە نازانێت ئەم شتەی وەریگرت چییە، گەرچی دەزانێت ناوی ((کولێرەیە)))

برسییەکان سەرگوێلانکەکان دەگەڕان و توێکڵی شووتیان دەخوارد، ئافرەتەکان کاریان دەکرد، چونکە جەنگ پیاوەکانی دیمەشقی لەناوبردبوو، ناوە تۆقێنەرەکە، جەمال پاشا، دڵەکانی پڕکردبوو لە ترس و بیم. پاشان ختکاندن و ماتەمینی بینی، دەروونی پڕبوو لەم وێنە تاریکانە هەتا شوێن نەمایەوە بۆ شتی تر، گەر دیمەنی شایی و خۆشی بینی بێت لە ڕۆژەکانی شەرەفمەندیدا، ئەم ڕۆژانە دەستی پێنەکرد هەتا کۆتایی هات، چێژمان لە خۆشییەکانی سەربەخۆیی نەبینی هەتا ئازاری داگیرکاریمان نەچەشت لە ماتەمینی میسلۆندا.

سەرکۆنەی نەنوەر مەکەن ئەگەر خەم سرووشتی شیعرەکانیەتی، خۆشی تێیدا وەک فەجری یەکەم وایە سپیایەتیەکەی لە ئاسۆدا دەرناکەوێت هەتا دووبارە شەو قوتی دەدات، ئەمە هۆکارەکەیەتی، لۆمەی مەکەن گەر قسەی کرد و لەبارەی خەون و خولیاکانەوە دووا، نەنوەر وازی لە هەقیقەتەکان هێناوە و بەرزبۆتەوە بۆ ئاسمانی خەیاڵ و دانەبەزیووە بۆ ئەرزی واقع، گشتاندێتی و تایبەتی نەکردووە و ڕاشکاو نەبووە، ئەو ژینگەی نەنوەر تێدا گەشەی

کردووە خۆشەویستیان بە تاوان دەزانی و پێویستبوو خاوەنەکەی داوای لێخۆشبوون لە خودا بکات لێی، جەخت لەوە دەکەمەوە ئەنوەر وەک بەشی شاعیرەکان کە کەوانەکەی ناوناوە لەیلا و بۆ ئەوەی شیعری بەسەردا بڵێت. ئەنوەر پەیوەندی لەگەڵ هیچ کچێکدا نەبووە وەک گەنجەکانی ئەمڕۆ، زۆر لەوە بێگەردتر و بەشەرمەتر بوو بیر لەوەبکاتەوە یان هەوڵی بۆ بدات.

ڕەخنە لە ئەنوەر مەگرن کە دەروونی زیندانی کردووە لەم بازنە تەسکەدا و شیعرەکانی کورتکردۆتەوە تێیدا و دەرنەچووە بەرەو فەزای فراوان، لەو دونیا فراوانەدا نە ژیاوە کە زۆربەی شاعیرەکان و خەڵکی تێدا دەژین، ئەنوەر منداڵییەکەی وەک منداڵییەکەی من بەسەربردووە لە جیهانێکی تەنگدا سنورەکانی ئەو ڕێگا پێچاو پێچانەبوو کە دەگەیشت بە مەکتەبی عەنبەر، و ئەو کارێزە بچووکەی کە بە گۆڕستانی دەحداحدا تێدەپەڕی، و ئەو ڕێگا سامناکەی کە ئاوەدانی لێوەی کۆتایی دەهات و جیهانی تاریکی و ترسان و دزی دەست پێدەکات، ناوی ((قەفا دەور))بوو ئێستا پێی دەڵێن ((شەقامی بەغداد))، گەورەترین شەقامی دیمەشقی نوێ.

ئەنوەر ئەمڕۆ دەترسێت دابڕێت لە جیهانی شیعر یان سنورەکانی تێپەڕێنێت، وەک چۆن پێشتر دەترسا سنورەکانی قەفا دەوور و مەکتەبی عەنبەر تێپەڕێنێت. لێ جیهانی شیعری ئەنوەر لەگەڵ تەنگیەکەیدا جیهانێکی فراوانە چونکە جیهانی دڵە، چونکە

پەیوەندی لەگەڵ پەروەردگاریدا هەیە؛ هەموو جیهانت لێ تەنگ دەبێت گەر کەمتەرخەم بیت تێیدا و بستێکت لێ تەنگ نابێت گەر پەیوەندی بکەیت بە ئاسمانەوە.

ئەنوەر لە سەردەمی جدیات و بەئاگایی و ڕووکردنە زانست و کاردا ژیا، دەیان هۆنراوەی شاعیرە کۆنەکانی عەرەبەکانی ئەزبەرکرد، هەربۆیە شێوازەکەی وەک ئاوێکی ڕوون وابوو، شیرینی و نەرمی، بەهێزی و تێپەڕبوونی تێدابوو، لە شیعرەکانیدا شوێنەواری جدیات و ئامادەکارییەکانی ئەمری تێدابوو، نەک وەک شیعری جەمەعاتی بۆنەکان و داواکەرەکانی ڕازیکردنی نەزانەکان. چنینەکەی وەک ئاوریشمێکی پتەوی ڕازاوەی ئاوازەبوو، نەک وەک چنینێکی هەرزان کە بە دەست لێدان دەدڕێت و بە تیشکی خۆر ڕەنگەکەی نامێنێت!

ئەنوەر بەو ڕێگایەدا نەڕۆیی کە ئەوانەی پێش خۆی کردوویانەتەوە، بەڵکوو بە ڕێگایەکدا ڕۆیی و کردیەوە بۆ ئەوانەی دوای خۆی، ئەنوەر پێشەوای گرۆی لاوان بووە و هەرگیز شوێنکەوتوو نەبووە، ئەگەر هەناسەی شیعری شەوقی لە شیعرەکانیدا نەبوایە وەک پارچە شیعری ((الليل الحزين)) لە نۆبەرەکەیدا و ڕووحی ئەدەبی فەرەنسی لە هەندێکیدا، دەموت ئەنوەر لە شێوازەکەیدا لاسایی کەسی نەکردۆتەوە. ئایا شاعیر هەیە وەک ئەنوەر بێت لە پەسنی

سروشتدا، لە تاریفی شارەکاندا لە وەسفی خەون و خولیاکاندا، هەتا ئەنوەر لاسایی بکاتەوە؟

***

لەدوای هەموو ئەمانەوە، ئەم دیوانە وەفایەکە بۆ عەرەبی: وشەکان گەڕاوە و پاکترینیانی هەڵبژاردووە، تەماشای شێوازەکانی کردووە و جوانترینیانی هەڵبژاردووە. دیوانی وەفایە بۆ شوێنەکان: لە ئەزەلەوە بەرەدا لەبەری دەروات و، لوبنان هەیە، ئایا هیچ شاعیرێک هەیە وەک ئەنوەر پەسنی بەرەدا بکات؟ کێ بۆ لوبنانی هۆنیوەتەوە وەک ئەوەی ئەو؟ ئایا خوێنەری شیعری نوێ هیچ هۆنراوەیەک پێ دەزانێت لە پەسنی سرووشتدا نوسرابێت مەزنتر بێت لە هۆنراوەی ((لوبنان)) کە ئەم دیوانە لە خۆی گرتووە؟ زیادەڕەوی ناکەم و سەنگینی ناکەم، شیعری سەردەم لەبەردەستی خەڵکیدایە، کێ مەزنتری لەلایە بابفەرمووێت.....بەڵام سەردەم هۆکاری بێبەشبوونە، بێ پێویست ترین کەس لە زاناکان خێزان و دراوسێکانیەتی، ساڵەکان ئەم شیعر و پەخشانە پاڵفتە دەکەن، شووشە لە گەوهەر و مس لە ئاڵتون جیادەبێتەوە، تا لێرەدا -دوای ئەوەی پیاوەکان دەڕۆن و هاوڕێیەتی و دوژمنایەتی نامێنێت و تەنها ئەو ئەدەبە دەمێنێتەوە کە شایەنی ئەمرییە-نرخی هۆنراوەی ((لوبنان))و((بەرەدا))دەزانرێت، لێرەدا -لە دوای ئەوەی زۆرێک لە ناوەکان لە بیرچوونەتەوە کە



ئەمڕۆ گوێیەکانیان پڕکردووە و خەڵکی پێوەیان قاڵە- ناوی ئەنوەر عەتار شوێنی خۆی دەگرێت لەگەڵ ناوی شاعیرە ئەمرەکاندا!

***



# جوندیی مامۆستامان

له ساڵی ۱۹۵۵ له چلەی حوسێن جوندییدا پێشکەش کراوە

له قورسترینی قورسترینه‌کان ئەوەیه هەستم باسی پیاوێک بکەم که هیچ شتێک له بارەیەوە نازانم، لەوەش قورستر ئەوەیه باسی پیاوێک بکەم هەموو شتێک لەبارەیەوە دەزانم! ۳۳ ساڵ کورت بکەمەوە له دە خولەکدا، دەریایەک له دڵۆپێکدا و باخێکیش له گوڵێکدا و یادەوەرییەکانی مامۆستا جوندییش له وتەی ناساندندا.

خولەک به خولەکیم هەڵگرتووە، هەموو ڕۆژێک کۆمدەکردەوە و دەمبژارد وەک چۆن کەسی پیسکه فلس به فلسی پارەکانی کۆدەکاتەوە و دەیبژێرێت، هەتا سێ یەکی سەدەیەک هاوڕێیەتیم کۆکردەوە، وادەبینن ڕۆچووم تێیدا؟ شاردوومەتەوە وەک نهێنیەک له دڵمدا و چرپەیەک له دەروونمدا و توێشوویەک بۆم له سەرکەوتنەکانی تەمەندا، ئایا ئەمڕۆ ئاشکرای بکەم و ڕایبگەیەنم و، به هەموو گوێگرێکی بڵێم؟



ئەوانە یاداشتی منن، ژیان چییە گەر یاداشتەکان نەبونایە؟ گەر باسم کرد لە کوێوە دەست پێ بکەم؟ لە کوێوە؟.....هیچ وتەیەکم بۆ ئەم شوێنە ئامادە نەکردووە چونکە هەرگیز پێش بینی ئەوەم نەکردبوو ڕۆژێک هەستم و باسی مامۆستا سەلیم جوندیی بکەم. گومانم وابوو هەرگیز پەتەکەم لێی ناپچڕێت، ئەو پەتەی دەزوەکانی لە ڕێبازی ساتەکان و لە ڕێگای زەمانەدا چنرابوو، هەموو پەتێکی بەسۆزیی بەرەو بچڕان دەچێت، هەموو زیندوویەک بەرەو مردن دەچێت، بەڵام ئاواتی دەروونە...... هەتا چل ڕۆژ پێش ئێستا هاوڕێی بەڕێزم مامۆستا نەورەس جوندی هات بۆلام، بەڕوویەکی خەمبار و دەنگێکی لەرزۆکەوە پێی وتم: خوای گەورە پاداشتان بداتەوە لە مامۆستا سەلیمدا! هەموو سەلیمەکان بە خەیاڵمدا هاتن جگە لە مامۆستا جوندی، وتم: کێ؟ وتی: مامۆستاکەتان سەلیم جوندی. شۆکبووم و چەند خولەکێک تێنەدەگەیشتم چ دەڵێت، چونکە ئەم جامە زۆر لەوە گەورەترە بە یەک قوم بخورێتەوە، بە هێواشی خواردمەوە هەتا لێی تێگەیشتم.

تێگەیشتم ئەو پیاوە ڕۆیشت کە لەژێر سایەی ئاسماندا کەس نەبوو زاناتربێت لە ئەو لە زمانی عەرەبیدا لەڕووی: زمان و پێکهاتە و نەحو و ڕەوانبێژی و هونراوەزانی و ڕیوایەت و سەروژێر کردندا، کەس لەو بە وەفاتر و بەغیرەتر نەبوو بۆی. ئیتر لە شامدا ئەو کەسە نەما من و ئەفغانی و عەتار بچین بۆلای هەرکات کێشە

گەورەکانی عەرەبی دەهاتە ڕێمان، دەمانبرد بۆلای بۆ ئەوەی گرێکەیمان بۆ بکاتەوە. لە هەموو دونیادا ئەو کەسە نەما کە لە زمانی عەرەبیدا پێی بڵێین:((مامۆستاکەمان))، لە ئەمڕۆوە دەبێت پشت بە خۆمان ببەستین وەک چۆن سەربازێک پشت بەخۆی دەبەستێت لەو کاتەی لە گەرمەی جەنگدا سەرکردە بەهرەدارەکەی لە دەست دەدات، مەحاڵە کەسێک شوێنی سەرکردەی جەنگی نێوان عەرەبی و عەجەمی پڕبکاتەوە، حوجەی عەرەب، سەلیم جوندی!
ئیتر ناتوانم بە براکانم بڵێم، زەرکەلی و جەیروودی، هەرکات گومانەکانی دونیا گومانی بۆ درووست کردین و هیچیەتی خۆشەویستی و نەمانی جوامێری دڵگرانی کردین: با بڕۆین بۆ لای جوندی، لای ئەو دەستماندەکەوێت، وەک چۆن کەسێک، دەستی نقووم بوو ڕادەکێشێت بەرەو سەرەوە.

تەواو پشت ڕاستبویەوە سەلیم جوندی مردووە، هەستم کرد بینایم ڕۆیشتووە و بومەلەرزە داوێتی لە دەمارەکانم و لە گوێچکەمەوە ڕووباری ڕووخاوی ڕۆیشتووە. واگومان مەبەن زیادەڕەوی دەکەم یان خەیاڵی شاعیرانە دەکەم؛ نەخێر، شاعیر نیم و پیشەی من ڕستنی ڕەنگاو ڕەنگ نییە. تەنها فۆتۆگرافەرێکم و بە کامێراکەمەوە دەگەڕێم، وێنەی دیمەنەکانی ژیان و ڕازەکانی دەروون دەچرکێنم، فۆتۆگرافەرێکی هەژارم تەنها وێنەکان دەگوازمەوە، فۆتۆگرافەرێکی هونەرمەندی داهێنەرنیم کە

تابلۆکانی ئەوەی بووە و نابێت لەخۆدەگرێت.....بەدیهێنراوێکم لەسەر زەوی واقع ڕێدەکەم لە کاتێکدا شاعیرەکان بەباڵی بازەکان دەدەن لە شەپۆلەکانی کەش.

ئەمە یەکەمین سەدمەم نییە؛ چەندین جار نموونەی ئەمە هاتووەتە ڕێم. هاتە ڕێم ئەو ڕۆژەی مردن گەیشت بە باوکم، باوک و مامۆستا بوو بۆم، وەک چۆن باوک و مامۆستا بوو بۆ دەیان گەورە پیاوانی ئیمڕۆ. ستایشی باوکم ناکەم، ئایا ئەمە دەچێتە شانازی کردنەوە؟ بەڵکوو باسی یەکێک لە ڕاستیەکان دەکەم. هاتە ڕێم ئەو ڕۆژەی شێخی شام وەفاتی کرد، مامۆستای هەموو کەسێکی چل ساڵ بەرەو سەری ئەمڕۆ، شێخ عید سیفەرجەلانی. هاتە ڕێم ئەو ڕۆژەی زیرەکترین کەس مرد کە ناسی بێتم، هیچ کەسێکی لێ جیاناکەمەوە، مامۆستامان موسلیم عینایە. ئەو ڕۆژەی هەردوو مامۆستای خۆشەویستمان قادر موبارەک و عەبدوڕەحمان سەلام کۆچی دواییان کرد.

بە ئەسرینی دڵم بۆ ئەمانە گریام، وەک چۆن گریام بۆ مامۆستا جوندیی.

بە زۆری دەزانن لەسەرم بە ئەسرین ئاوپەرژێنی گۆڕی ئەو پیاوانە بکەم کە دڵیان پڕکردم لە هەست و سۆزێک کە ئەسرینی لێوە

هەڵدەقوڵێت؟ ئەوان درەختی خۆشەویستیان لە دڵمدا چاندووە کە بەرەکەی وەفایە؟

ئایا ئەو منداڵانەی لە پشتی خۆیانن لە پێشتر لە من بۆی بگرین؟ هاوڕێیەتی شێخ عەبدولقادر موبارەکم کردووە، شتانێکی عەبدوڕەحمان سەلام دەزانم کە خێزان و منداڵەکەی نایزانن، لە خوێندکارێک زیاتربووم بۆیان، بەڵکوو ڕێم پێدەن بڵێم لە کوڕ زیاتربووم بۆیان.

خوێندکار خوێندکارە هەتا مامۆستا لەسەر مینبەرەکەی بێت، کە مامۆستا لەسەر مینبەر هاتە خوارەوە و خوێندکار لە قوتابخانە هاتە دەرەوە و هەرکەسەو بەڕێی خۆیدا ڕۆیشت، هیچ شتێک لە نێوانیاندا نامێنیت تەنها یادگاریی و ئەو ڕۆژانە نەبێت گوزەراوە و نایەتەوە. منداڵ لە باوکە بەهرەدارەکەیدا ئەو خاسیەتە مرۆڤایەتیانە دەبینێت کە هەموو کەسێک تێیدا بەشدارە، تێکەڵ دەبێت لەو خاسیەتە بەهرەدارییانەی کە پێی لە خەڵکی جیادەکرێتەوە، ئا لێرەوە وتویانە: بێ پێویسترین خەڵکی لە زاناکان خێزان و دراوسێکانیەتی، موریدیش تەنها لایەنە بەرز و نەمرەکەی دەبینێت، هەربۆیە پەیوەندیەکەیان بە نەمری دەمێنێتەوە و بەرزدەبێتەوە. منداڵ بەشداری دەکات لەگەڵ باوکیدا لە خواردن و خواردنەوەدا، موریدیش بەشداردەبێت لە بیرکردنەوە و هەستەکانیدا. منداڵ لە باوکیەوە

سامانی بە میراتی بۆ دەمێنێتەوە، موریدیش زانستەکەی بە میراتی بۆ دەمێنێتەوە.

مەبەستم منداڵەکانی جوندی نییە، هەموویان لە بلیمەت و زرنگەکانن، بەڵام ئایا وادەزانن ئەوان لە پێشترن لە من بۆ ئەوەی بۆی خەمباربن؟ ئایا پەیوەندی نێوان شێخی ئەدیبەکان و نەوە چاکەکانی پتەوترە لە پەیوەندی هزری نێوان خۆی و خوێندکارە ئەدیبەکەی؟

ببوورن بەڕێزان، ببوورن. وازم لە بابەتەکەم هێنا چونکە باخی یادەوەرییەکانم بینی لە ڕاست و چەپەوە نیگایان بۆ دەکردم، خۆمم بۆ نەگیرا و لە ڕێکەم لامدا بۆ ئەوەی گوڵێکی لێبکەمەوە یان بەبۆن کردنی بۆنەکەی بگەڕێمەوە، لەم وتارەمدا چەندین جار دەگەڕێمەوە بۆ ئەم تاوانە!

ئایا قسەکانم بابەتی هەیە؟ بابەتەکەی یادەوەرییەکانە، چ کاتێک ژمارەی حیساب و نەخشەی ئەندازیاری یادگارییەکانیان سنووردارکردووە؟ یادگارییەکان، ئایا چ شتێک هەیە لە ژیاندا بەچێژتربێت لە نۆشینی گڵاسی یادەوەرییەکان و مەست بوون بە مەی ئاواتەکان؟من دەزانم-بەڕێزان- قورسترین وشە لە تەرازووی حەزەکاندا وشەی (من)ە، لێ ئەمشەو ناچارم؛ چونکە پێویستە

کەسێک یادەوەرییەکان باس بکات، چۆن پێچراوەی یادەوەرییەکانم بڵاوبکەمەوە لە کاتێکدا خۆم دامخستبێت؟ لێم گەڕێن بگەڕێمەوە بۆ ڕۆژانی گوزەشتەم، بۆ سەردەمی خوێندنی سەرەتاییم، ئەو ڕۆژەی پیاوە سامناکەکە حوکمی دیمەشقی دەکرد، جەمال پاشا و ئیتیحادییە مولحیدەکان، کۆمەڵێ ناوی تورکیمان ئەزبەربوو وەک توتی دەمان وتەوە بەبێ زانست و تێگەیشتن، وانەی نەحوی عەرەبیمان دەخوێند بە زمانی تورکی لەلایەن مامۆستایەکی تورکەوە، زمانی تورکی زمانی فەرمی بوو لە وڵاتدا، حاکمەکان بەوە قسەیان دەکرد و گۆرانییەکان بەو زمانە دەوتران. ئیتیحادییەکان گومانیان وابوو بەمکارەیان کۆتایی بە عەرەبی دەهێنن و شکۆکەی وەردەگرن و بەرێزییەکەی دەبەن بۆ خۆیان. ئەرە منداڵێکی لاوازتان بینیووە پۆشاکی گەورەکان دەپۆشێت؟ ئەرە ئەو گەمژەیەتان بینیوە کە بە زەمەق ناوی خۆی دەلکێنێت بە ئەبو هوولەوە، بۆ ئەوەی هەڵەیەکی مێژوویی ڕاستبکاتەوە و بیسەلمێنێت کە ئەم ئەبوهوولی هەڵکۆڵیووە؟! ئەمە نموونەی ئیتیحادییەکانە کە گومانیان وابوو بە - زمانێکی لاوازی تازەوە، بە سەد هۆنراوە و چیرۆکەوە، بە هەڵکێشانی شمشێر بۆ سەر ملی خەڵکی- دەتوانن ئەو زمانە لەناوبەرن کە موعجیزەیەکی عەبقەرییانەی مرۆڤایەتییە؛ چونکە وەک زمانەکانی تر گەشەی نەکردووە، مێژوو منداڵی و لاوێتی و ڕێگای بەرەو کامڵبوونی هەموو زمانێک دەزانێت، لێ عەرەبی مێژوو هەر بە کامڵی تەواوەوە ناسیویەتی، چونکە لە مێژوو بە

تەمەنترە! بەڵام چیم داوە لەم وردەکارییانە؟ بەسە بۆتان بزانن ئێمە لە کۆتایی ئەو شەوە تاریکەی عەرەبیدا بووین، هەنگاوی دەنا بەبێ ئەوەی بزانێت بەرەو کوێ دەڕوات ئەگەر ئەم کەسە دیارانە لە بوژانەوەی نوێدا چرایان بۆ هەڵنەکردایە لەنێو ئەو تاریکییەدا.

لە ژێر ڕووناکی ئەم چرایانەدا ڕێگاکە بۆ خەڵکی ڕووناک بویەوە، سوارییەکان ڕۆیشتن و بەرەبەیان هاتبوو، بەڵام هەوری ئیتیحادیەکان لە چاویان دەشاردەوە(دەڵێم ئیتیحادیەکان نەک تورکەکان)، کە هەورەکان لاچوون هەموو ئاسۆ پڕبوو لە ڕووناکی بەرەبەیان، پەیام و کتێب بڵاوکرایەوە، وتار و سیمینار پێشکەش کرا، یانەی عەرەبی....یانەی عەرەبی لەبەردەم هۆتێل ڤیکتۆریا دامەزرا، جوانییەکی پاک دادەباری! بۆیەکەمجار زانیمان لە دونیادا ئەدەبی عەرەبی و شیعری عەرەبی هەیە، وتاربێژەکان لە شوێنەکانی جگە لە مزگەوتیش وتاریان دەدا، جگە لە دیوانی (ابن نبا) کە بە پێی مانگ و هەفتە ڕێکخرابوو، کە نوێژخوێنەکان ئەزبەریانبوو وەک چۆن وتاربێژەکە ئەزبەریبوو! ڕۆژەکان تێپەڕین، سەربەخۆیی لە دۆڵی میسلۆندا لە گۆڕنرا، لێ بووژانەوە هەر بە زیندووی مایەوە، ڕێی دەکرد هەتا گۆڤاری ((ڕابیتەی ئەدەبی))بەرهەم هێنا کە یەکەمین ژمارەی لە یەکی ئەیلولی **١٩٢١** دەرچوو. باوکم یەکێک بوو لە بەشداربوانی و منیش دەمخوێندەوە. گەرچی پێشتر چەندین کتێبی ئەدەبی کۆنم خوێندبویەوە، وەلێ بەم گۆڤارە لارییەکانم

ڕاستکردەوە و زمانم چاککرد، یەکەمین شت کە لەتەدەمی ئوندا خوێندوومەتەوە گۆڤاری ڕابیتەبووە.

لەو تەمەنەمدا بۆم دەرکەوت لە نێوان نووسەرەکانیدا نووسەرێکیان بە نووسینەکانیدا دیاربوو لەوانی دی جیاوازترە، سەرکەوتووتر و بەویقارترە، هەر خۆی کلیلی فەرهەنگی بە دەستبوو، خاوەنی گەنجینەکانی زمان بوو، هەڵەچنی وتارەکانیان دەکرد، هەڵەچنی نووسینەکانی دەکرد، وێنامکرد وەک مامۆستایەک بێت لە نێوان کۆمەڵێ خوێندکاری ناوازەدا، پاشان وێنەکەیم بینی، وێناکردن و بۆچوونەکەم ڕاست دەرچوو، چونکە ئەوانم بە گەنجی بینی و ئەمیشم وەک پیرەمێردێک بینی لە ناویاندا، بە کەچەڵی و هەیبەت و ڕیشەکەی.....یان خەیاڵم کرد پیرەمێردێک بێت، ئەمە یەکەمین جاربوو ناوی جوندی ببیستم.

بەهۆی باسەکانی جوندی لە گۆڤاری ڕابیتەدا سەبارەت بە پاککردنەوەی وشەکان، زانیم لە دونیادا شتێک هەیە بەناوی زانستی زمان و وردبینی زمانەوانی.

قوتابخانەی سوڵتانییەی دووەم هەڵوەشێنرایەوە کە لە سەردەمی شەریفدا لەوێ خوێندکار بووین، چووین بۆ قوتابخانەی عەنبەر،

تاکە ناوەندی لە دیمەشقدا، لێرە مامۆستا سەلیمان ناسی وەک مامۆستایەک و وەک خوێندکار لە خزمەتیدا دانیشتین.

بەڵام ئایا یەکسەری بازبدەم بۆ باسکردنی مامۆستا؟ ئەی پێتان نەڵێم کێ پێش ئەو فێری کردین؟ لەبارەی عەبدوڕەحمان سەلامەوە؟ لەبارەی شیخ عەبدولقادر موبارەکەوە؟ شاعیرەکانی عەرەب لەسەر چاڵێک دەوەستن کە با پڕی کردۆتەوە، لەسەر بەردێک کە ئاگر ڕەشی کردوە، دەگرین بەدیار شوێنەواری دەوارێکەوە، لە باسی دووکەسدا نەوەستم کە ئەگەر ئەوان و جوندی نەبوایە، من و عەتار و موبارەک و مەحاسینی و کەرەمی و ئەفغانی و جەیروودی و سوڵتان و جەمال فەرا و وەجیهـ سەمان، نەماندەزانی هیچ وشەیەک بنووسین؟

چەند خولەکێکم پێبدەن یادی کەسێک زیندووبکەمەوە کە هەموو ئەم ژیانەی بەخشییوە بە عەرەبی، ئەو کەسەی ئەم کەسانەی بەخشییە شام لە شاعیر و نووسەر و وتاربێژان، کە شام شانازیان پێوەدەکات.

ئەو دەمەی چووینە قوتابخانەی عەنبەر-بەڕێزەکانم- لەوانەی عەرەبیدا دوو سوپرایزمان بینی: دوو پیاو لە پیاوە دانسقەکان. جارێکیان وتم پیاوە باشە کۆمەڵایەتیەکان وەک کۆپی کتێبێکن،

هەزارەها دانەی لەو جۆرە هەیە، بەڵام هاوشێوەکانی وەک موبارەک و سەلام وەک دەستنوس وان؛ لەوەیە ترازان یان ناڕوونیەکی تێدا بێت وەلێ لە هەموو چاپکراوەکان بەنرختڕن چونکە تاکن و هاوشێوەیان نییە.

سەبارەت بە شێخ عەبدوڕەحمان سەلام نەمبینووە( گومانم وایە ناشی بینم) کەس وەک ئەو زبان پاراو و گفت شیرین بێت، شتێک بوو لە سەرسوڕهێنەرەکان، گەر بیویستایە لەبارەی بابەتێکەوە بدوێ تەنها ئەوەی لەسەر بوو دەمی بکاتەوە و زاری بجوڵێنێت، واتاکان لە هزریدا و وشەکان لەسەر لێوی، زمانپاراوی لە دەووریدابوون، چاوەکانی وابەستەبوون پێوەی، و گوێیەکان ڕادێربوون بۆی، دڵەکان پەیوەست بوون بە جوڵەی دەستیەوە! شیعری دەهۆنیەوە وەک چۆن وتاربێژ قسەدەکات، کتێبەکەی لادەدا و گوێی پێنەدەدا، لەسەرەتای کاتەوە هەتا کۆتایی باسی زمان و ئەدەب و هەموو شتێکی دەکرد.....دەیویست پەروەردەمان بکات لەسەر سەلیقەی عەرەبی بە پتەوی و نەرمی لە سحرەکەی خۆیی ببەخشێت پێمان و پێش کاتی خۆی بمان کات بە ئەدیب.

سەبارەت بە شێخ موبارەک هیچ مامۆستایەکم نەمبینووە( گومانم وایە ناشی بینم) هاوشێوەی ئەو بێت لە شێوازی ڕوونکردنەوە و دەرخستندا، لەجێ گرتن لە دڵی خوێندکارەکاندا، لە نەخشاندنی

هەقیقەتەکان لە پەڕەکانی دەرووندا بەم شێوازە ڕێکخراوە پتەوە سەرسوڕهێنەرە، لە یەک ڕستەدا پوختەی یەک توێژینەوەی باس دەکرد. فیقهی فێردەکردین، چیم وت؟ فیقه؟ ئەمە ناوی وانەکەیە لە نەریتی قوتابخانەدا، لێ وانەکە - لەهەقیقەتدا- فیقهـ و تەفسیر و فەرموودە و لۆغە و شیعر و چیرۆک بوو، ئەوەی خۆت ویستت لە شتی بەسوود و هەموو ناوازەیەکی تازە.

یەکەمین کەس بوو بوێری ئەوەی پێبەخشیم، دووهەمین کەس بوو کە دەستی گرتم و چاوی کردەوە بەڕووی سەقافەی عەرەبیدا، تەبیعەتی ئەو لەدەروونمدا چەسپا، هەتا لە وانەوتنەوەدا ڕۆدەچم بە زار و شێوازی موبارەک قسەدەکەم بە هەمان جوڵەکانی ئەو دەجوڵێمەوە و خوێندکارەکان بە سەرسامیەوە لێم دەڕوانن.

لە ڕۆژێکی ١٩٢٣دا شێخ عەبدوڕەحمان سەلام هاتە لامان، بەڵام وەک ڕۆژانی پێشوو نەبوو، وتارێکی پێشکەش کرد، لێ وەک جاران نەبوو؛ بە خەمبارییەوە هاتە ژوورەوە و وتاری ماڵئاوایی پێشکەش کرد، ڕۆیشت و دڵمان لەگەڵیدا ڕۆیشت.
مامۆستایەکی تازە هات و لەسەر کورسیەکە دانیشت، شێخ هەرگیز لەسەری دادەنەنیشت، کتێبەکەی کردەوە و وانەکەی وتەوە بە دەنگێکی نزمەوە و بە قسەکردنێک کە نزیک بوو نەدەبیسترا. ئەفغانی لە پەنامدا بوو پێم وت: ئەمە کێیە؟ بەخەمبارییەوە وتی:

ئەمە باوکی ئەوە. ئاماژەی کرد بۆ نەجمەدین، وتم: ئوستاز سەلیم جوندی؟ وتی: بەڵێ.

ئەمە ئوستاز سەلیم جوندییە؟ ئەمە ئەوەیە کە پێی سەرسام بووم ئەوەدەمەی بابەتەکانیم دەخوێندەوە لە گۆڤاری ڕابیتەدا؟ ئای لە پووچی ئاواتەکاتم! داخی گرانم بۆ ئەو مامۆستایەی لە دەستماندا، داخی گرانم بۆ شێخ سەلام!

سڵاو لە سەلام. بەڵکوو سەلام لەسەر عەرەبی؛ لێی بێ پێویست بووم و وازملێیهێنا، نیەتم هێنا گرنگی بدەم بە وانەیەکی تری قوتابخانە. چیم داوە لە عەرەبی کە ئەمە مامۆستاکەیەتی؟ مامۆستایەک وتارنادات، شیعر ناڵێت، یاری بە خوێندکارەکانی ناکات؟! هاتە سەرەی من، مامۆستا هەڵیساندم بۆ سەر تەختە و دوو پارچە شیعری مەعری پێ نووسیم، گوتی: بیخوێنەوە و شرۆڤە و ئیعرابی کە.

دەستم کرد بە قسەکردن وەک چۆن سەلام فێری کردبووین، دەستم کردە وتاردان لەو دوو پارچە شیعرەدا وتارێکی حەماسیانە، مامۆستا بەبزەوە پێدەکەنی هەستم کرد چەقۆ دەدات لە دڵم، وەک ئەوەبوو ئاوێک بکات بە پشکۆی حەماسەتمدا، پێی وتم: دواتر دواتر، سەرەتا واتای وشە عەرەبیەکان باس بکە.

وەستام وەک چۆن کەری شێخ لە عوقبە وەستاوە! پرسیاری نیعرابەکەی لێکردم، وەستانێکی تر وەستام. وتی: بینیت؟ خانوو بونیاد دەنێیت پێش ئامادەکردنی بەرد بۆی؟

لە ڕاستیشدا بەهەمان شێوە منی بینی....خانووم لە هەوادا درووست دەکرد!

بە ئەندازەی گەورەبوونی مامۆستا لە دەروونمدا خۆمم لەلا بچووک بویەوە. دووبارە دەستم کرد بە خوێندنەوەی نەحو و صەرف. ئەو کتێبەی دەمانخوێند کتێبی((قواعد اللغة العربية)) بوو(بەرگی چوارەمی لە وانەکانی نەحو، هی حەفنی ناسیف و هاوەڵەکانی)، کتێبێکە ئەوکەسە دەوڵەمەند دەکات کە لە ئەدەبدا دەخوێنێتەوە، بەڵکوو ئەدیبەکانیش، لە چاو کتێبەکانی تردا، شتێکی سەرسوڕهێنەرە لە کۆکردنەوە و ڕێکخستن و کورتی دەستەواژەکانی و دیاریکردنی ڕاستیەکانی ڕێزمانی عەرەبی، ڕاستر و فراوانترە لە شزور زەهەب و لە ئیبنوعەقیل کە لەلای دوو مامۆستای گەورە دەمخوێند، شێخ ئەبو خەیر مەیدانی و شێخ ساڵح تونسیی.

لەسەری ماینەوە و لا سپیەکانیمان ڕەش کردەوە، پاشان لە نێوان پەرەکانیدا پەڕەمان بۆی زیادکرد و پڕمان کرد لە سوود و نموونە و زیادەکانی مامۆستا. زانیمان - ڕۆژ لە دوای ڕۆژ- خودا! چ

نیعمەتێکی پێبەخشیوین کە کردوونی بە خوێندکاری ئوستاز سەلیم جوندی. شانازیمان دەکرد بەسەر ئەو هاوڕێیانەماندا کە لەلای شێخ داودی وانەکەیان دەخوێند، هاوکێشە و قورسەکانمان لە کتێبە ئەدەبیەکانی و زاری زاناکانەوە دەهێنا و لەمەمان دەپرسی، هەموو وەڵامەکانیمان وەردەگرت بەبێ ئەوەی پێیداچوونەوە بکات یان بگەڕێتەوە بۆ کتێبەکان، هاوڕێکانیشمان بەبێ وەڵام دەگەڕانەوە.

شێخ داودی بەکەم نازانم، مامۆستایەکی بەڕێزبوو، ڕەوشتێکی هەبوو بۆنخۆشتر لە باخ و پاکتر لە بەفر، دڵێکی ئاڵتونی هەبوو، بەڵام لە بابەتی جوندی نەبوو. ئاڵتون ئاڵتونە، بەڵام ئەگەر بیکەیتە بەرانبەر گەوهەرێکی دانسقە لە شەرمدا ڕووناکیەکەی ون دەبێت.

مامۆستا جوندیم خۆشویست وێنەی خۆشەویستی منداڵ بۆ باوکی، قەدریم زانی، وازم لە پرسیارکردن لێی نەدەهێنا، لە پۆلدا پرسیارم لێی دەکرد و لە فورسەکاندا لەگەڵیدا دەچوومە ژووری مامۆستایانەوە، لە کانی زانستەکەی ئاوم دەخواردەوە و تێرنەدەبووم، توێشووم وەردەگرت لەم کارێزە شیرینە بۆ گەشتە درێژخایەنەکەم لە سارای ژیاندا، پرسیاری نامۆکانم دەکرد هیچ وشەیەکی لێ ون نەدەبوو، پرسیارم لێدەکرد لە تەسریف و ئیشتیقاق یەکسەری وەڵامی دەدایەوە کە وەڵامی ئەو پرسیارانە زاناکان ماندوو دەکات لە دوای توێژینەوە و گەڕان بە دوایدا، پرسیارم سەبارەت بە نەحو لێدەکرد

پیشەوا و حوجەی بوو، پارچە شیعرێکی سێیەم پێی دەوت کە لە کتێبێکدا دۆزیبوومەوە، ئەویش پارچە شیعرەکەی تەواودەکرد و ناوی شاعیرەکەشی دەزانی.

مامۆستای عەرەبی بوو، بەڵام زیاتر بوو لە مامۆستایەک. یەکێک بوو لە زاناکانی شارەکە، بەڵام زیاتربوو لە زانایەک. هەندێ مامۆستا زانا نین، هەندێ زاناش تەنها لە شار و نێوان هاوڕێکانیدا زانایە، هەندێ زاناش تەنها بەپێی سەردەمەکەی زانایە. لێ جوندی لە سەردەمی خۆیدا زاناترین زانابوو لە عەرەبیدا، یەکێک بوو لە زانا لە پێشینەکانی عەرەبی، بەڵام لە زەمانەدا ڕێی ونکردبوو، لە سەدەی چواردەی کۆچیدا هات نەک سەدەی چوار!

ئەمە دەڵێم لە دوای ئەوەی شاران گەڕاوم و لەگەڵ زاناکاندا دانیشتووم، هیچ زانایەکی بەناوبانگ نەبووە لە عەرەبیدا لە میسر و شام و حیجاز و مالیۆ و ئەندەنوسیا ئیللا ناسیوومە. لە میسر مامۆستاکانی زانکۆی میسر و زاناکانی زانکۆی ئەزهەر و ئەدیبەکان و نووسەرەکانم ناسی، جەختی دەکەمەوە کەسم نەبینی سەربکەوێت- لە ئەزبەرکردن و ئەمانەت و بەهرەیدا- بەسەر مامۆستا جوندیدا.

ڕۆژێک دەریایەکی تری زانستم تێیدا دۆزییەوە کە پێشتر نەمدەزانی؛ پرسیارێکی ئایینیم لێی کرد بینیم فەقیهێکی ئوسوڵییە و فەرموودە دەگێڕێتەوە و وتارەکان دەزانێت. لێرەوە، لێرەوە بەڕێزان، توانیویەتی پارێزگاری بکات لە زمان و بەهاکەی زانیووە و غیرەی لێیکردووە. جارێکیان وتم ئینگلیزی سەدەی بیستەم ئەگەر ئەدەبی ئینگلیزی سەدەی شانزەهەم بخوێنێتەوە لێی تێناگات بە وەرگێڕان نەبێت، ئێمەش شیعری عەرەبی هەزار و چوارسەدساڵ پێش ئێستا دەخوێنینەوە لێی تێدەگەین وەک چۆن لە شیعری ئەمڕۆ تێدەگەین! عەرەبی ئەم هەموو تایبەتمەندییەی لە کوێ بوو؟ چۆن توانی خۆڕاگریێت لەگەڵ هەموو ئەو مەینەتیانەی هاتۆتە ڕێی؟ چۆن دەوڵەتی تورکیا و فارس دەستەوسان بوون لە لەناوبردنیدا؟ بەڵکوو چۆن توانیوویەتی زمانەکەیان لەناوببات و بیانخاتە ژێر ئاڵەکەیەوە؟ نهێنی هێزی عەرەبی و خۆڕاگرییەکی چییە؟

ئەو نهێنییەی ئەم قەڵا پتەوە پاراستووە: قورئانە بەڕێزەکانم، قورئان.

ئەمەش هۆکاری بلیمەتی جوندییە، پێشەوای عەرەبی بوو، ئەو کوڕی ڕۆژگارێکە کە تورکەکان دەیانویست هەموو شتێک بتورکێنن. عەرەبی زمانی قورئانە، هەرکەسێکیش دەیەوێت ببێت بە پێشەوا تێیدا با خزمەتکاری قورئان بێت. من ئەمە ناڵێم لەبارەیەوە، بەڵکوو بەزاری خۆی ئەمەی وتووە؛ لە ژمارەی یەکەمی گۆڤاری

رابیتەی ئەدەبیدا وتویەتی، لە پێشەکی بابەتی پاککردنەوەی ڕشەکاندا دەڵێت: " زمانی عەرەبی تووشی چەندەها مەینەتی بووە، گەر دابەزیبایە سەر شاخێکی چەسپاو دەڕووخا، گەر دە یەکی ئەوەی توشی زمانی عەرەبی بووە توشی زمانەکانی تر ببوایە ڕێنەکانی دەسڕانەوە و شوێنەواری نەدەما، بەڵام فەزڵی سەلامەت بوونی ئەم زمانە بەڕێزە و ڕزگاربوونی لە چەپۆکی لەناوچوون و مردن، دەگەڕێتەوە بۆ قورئانی پیرۆز". دوای کەمێک دەڵێت: " ئامانجمان ڕێنوێنی زار و پێنووسەکانە بۆ شوێنی ڕەوانبێژی و ڕاستی وتن، لابردنیشی لە شوێنی هەڵە و لاوازی. گومانمان وانیە هەموو نووسینەکانمان لە هەڵە و کەموکورتی بەدووره چونکە تەنها خودا هەڵەناکات".

بیسەری ئەم سێ ڕستەیە بوون؟ جوندی هەموو پەیڕەوی خۆی تێیدا پوخت کردۆتەوە؛ ئەو پەیڕەوەی ئایین و زانست و ڕەوشتی لە خۆ گرتووە، لەگەڵ عەرەبیدا فێری دینی کردین، بە خزمەتکردنی زمانی قورئان خۆی لە خودا نزیک کردەوە، هەر لە یەکەم ڕۆژەوە بە دووری گرتین لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان و ئەدەبی نوێ، تەنها ئەو شیعرانانەی بۆ ئیعراب دەکردین کە عەرەبیەکەی حوجەیە لە شیعری جاهلی و ئیسلامیدا، وشەکانی دەردەهێنا وەک فەرموودەناسەکان، وشە ڕاستی لە هەڵە و، پاراوی لە ڕیزپەڕی بۆ جیادەکردینەوە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کەسێکی خاکی بوو، لەسەرخۆ و دەنگ نزمبوو، نوکتەی ئامادەبوو، دڵپاک بوو، هاوڕێیەتی خۆشبوو، ڕەوشت بەرزبوو، ڕاوەستاوبوو سەرنج ڕاکێشیەکانی دونیا نەیاندەتوانی لەسەر ڕێی لابدەن.

هەموو ژیانی لەسەر ئەم پەیڕەوەبوو، بەڵام لەم ڕێیەدا تووشی چەندین ناڕەحەتی بویەوە. هەر پرۆگرامێکی عەرەبی دابنرایە بۆ قوتابخانەکان یان بگۆڕدرایە یان کتێبێک بنوسرایە یان چاک بکرایە ئیللا جوندیان بانگ دەکرد، کە دەهات دەیبینی دوژمنەکانی عەرەبی و خزمەتکارەکانی ئیستعمار چاوەڕوانین، گەرەکیانە منداڵە عەرەبەکان عەرەبی نەزانن هەتا دووریان بخەنەوە لە قورئان، بەهێزترین چەکی لێبسەننەوە کە دژایەتی ئیستعماری پێدەکەن، وردترین ڕێگایان دەگرتە بەر و نادیارترین فێڵیان بەکاردەهێنا، دەبوو ئەمیش بە تەنها لە دژیان بجەنگێت، فێڵەکەیان ڕەتبکاتەوە بە لەوەی خۆیان نادیارتر، بۆ ئەمەش وردتر لە ڕێبازەکەی خۆیانی دەگرتە بەر، ئەمەش ماندووی دەکرد و زیانی لە تەندروستی دەدا، لێ بە تێکۆشان بۆ خودای هەژمار دەکرد.

إن شاءالله پاداشتی تێکۆشەرانی هەیە.
جوندی جوندییەک بوو پارێزگاری لە عەرەبی دەکرد لەوەی دزەکان بێنە ناویەوە لە دەرگای پرۆگرام دانان و کتێب و تاقیکردنەوەی

گشتییەوە، یان لە دەرگای دیاریکردنی نەزانەکانەوە بۆ وانە وتنەوە، هیچ ڕۆژێک بێئاگا نەبوو جێگاکەی بەجێنەهێشت، ئەو دەمەی بە شەهیدی کەوت دەردەکە بڵاوبویەوە و دزەکان هاتن، لە هەموو ئەو دەرگایانەوە هاتنە ژوورەوە. پرۆگرام و کتێبەکان گۆڕان و لە زەویدا خراپە بڵاوبویەوە، هەندێ لە مامۆستای عەرەبی ئەمڕۆ زۆر لاوازترە لە هەندێ خوێندکاری بەکالۆریای ئەو ڕۆژانە.

پارێزگارەکان یەک بەدوای یەکدا کەوتن، موبارەک و بەزم و جوندی.... بێشەکە شێری تیانەما، ئەرێ شێرکۆلە نییە پارێزگاری لێبکات؟

بەڵێ، بەڵێ هەیە مامۆستاگیان!

ئەمە خوێندکارەکانتن، لەسەر گۆڕە سەوزەکەت سوێند دەخۆن کە لەسەر ڕێبازەکەت بەردەوام دەبن، پارێزگاری لە پەیمانەکەت دەکەن، پارێزگاری لە زبانی قورئان دەکەن کە هەموو ژیانت لەوەدا خەرج کرد و پارێزگارەکانت بۆی پەروەردەکرد، ئەمە بە توانا و هێزی ئێمە نییە، بەڵکوو بە توانا و هێزی خودا و متمانەبوونە بە پەیمانەکەی: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ ⑨﴾؛ هەرکات دەرگایەکی شەڕیان کردەوە( لە ئاسانکردنی ڕێزمانی عەرەبی یان خوێندنی شێوازە گشتیەکان) خۆی دایدەخست، هەرکات ئاگری

جەنگیان هەڵدەگیرساند خودا دەیکوژاندەوە و قورئانی زاڵ دەکرد، هەرچەندە ئاگری ئەوان کوژاوەیە و (پرشنگدار نییە).

بەڕێزەکان، لەگەڵ جوندیدا بووم وەک خوێندکار و هاوڕێ لە کۆلێژی شەریعە، چەندین شەو لەگەڵیدا ماومەتەوە، لە شار و گەشتدا لەگەڵیدابووم، لە دەروونمدا چەندین یادگاریم هەیە لەگەڵیدا، تەنها سوچێکی سوچێکم بۆ دەرخستوون.

لەگەڵ گەورەیی و پایە بەرزیەکەیدا خەیاڵی هەبوو، ئایا خەیاڵ تەنها لە دڵی گەورەکاندا ناژی؟ لە خەیاڵەکانی ئەوەبوو نەیدەتوانی سەردانی نەخۆش بکات یان دڵنەوایی کەسێک بکات، لە ترسی ئەوەی گوێی لە ناوی مردن ببێت. ئەوەتا مردن دابەزیوەتە سەری!

مردن، ئەگەر کەسێک لە مردن ڕزگاری ببوایە باشترینی مرۆڤایەتی موحەممەد فرستادەی خودا ڕزگاری دەبوو لێی.

بەڵام ئایا جوندی مردووە؟ ئایا ئەو کەسە مردووە کە شوێن پێی مێژوونووسەکان کەوت بە نووسینی ((تاريخ المعرة))؟ ئەوکەسەی لەگەڵ پێشەوایانی لوغەدابوو بە((إصلاح الفاسد))؟ لەگەڵ زانایانی نەحودا بوو بە((كتاب النحو))؟ لەگەڵ مێژووناسی ئەدەبیدابوو بە((تاريخ أبي العلاء))؟

مامۆستاگیان، مردن هەقە، بەڵام تۆ دووجار دەژیت: جارێک لەم دونیایەدا بەناو و زانستەکەت هەتا لە دونیادا مابیت، جارێکیش لە لای خودا بە ئیمان و ڕەوشت و پارێزگاری کردنت لە زیانی قورئان، بەڕاستی هەر ئەوەش ژیانی نەمرییە.

پەروەردگارا خوایەتی ناکەم بەسەرتەوە، لێ پێغەمبەرەکەت فەرمویەتی: (( کاتێک یەکێک لە نەوەکانی ئادەم دەمرێت کردەوەکانی دەپچڕێت جگە لە سێ دانە، خێرێکی نەبڕاوە، زانستێکی بەسوود، منداڵێکی باش دوعای خێری بۆ بکات)). پەروەردگارا ئەمە زانستە بەسوودە بەردەوامەکەیەتی، ئەوەش منداڵەکانێتی، ئێمە هەموومان منداڵی ئەوین، لە پیاوچاکان نین بەڵام داوات لێدەکەن بەدوعای پیاوچاکان: پەروەردگارا ڕەحمی پێبکە لێی خۆشببە و بیخە بەهەشتەکەتەوە، پەروەردگارا جێگاکەی پڕبکەیتەوە بۆ عەرەبی، پەروەردگارا لە پاداشتەکەی بێ بەشمان نەکەیت و لە دوای ئەوەوە توشی فیتنەمان نەکەیت و لەو و لە ئێمەش خۆشبیت، اللهم آمین.

* * *



# یەکەمین وتار کە بڵاومکردەوە و یەکەمین وانە پێشکەشم کرد

لە ساڵی ١٩٤١دا بڵاوکراوەتەوە

سەرباسی ئەم بابەتە دەنووسم و گاڵتە بە دەروونم دەکەم، کە باسی وتارەکانم بۆ خەڵکی دەکەم، خەڵکیش سەرقاڵن بەم مەترسیە گەورەیە، بەم بەڵا داباریوەوە، بەم گرانیە سەرتاسەرییە، پەنا دەگرین بە خودا لەمە توندتر و گەورەتر.

بە تەمەنی خوێنەرەکانم زۆر باسی خۆم ناکەم بۆ پۆز و خۆبەگەورەزانین و غرور، بەڵام پیشەی ئەدەب شتانێکی تێدا درووستە کە لە شتەکانی تردا درووست نییە. ئەگەر ئەو قسانە نەبوایە کە سەرنج یان ستایشن لەسەر نووسینەکانم، یان پەیامێکی لەو شێوەم پێدەگات، یان بڕگەیەک لە ڕۆژنامەدا دەیخوێنمەوە و بە باشە باسم دەکات...ئەگەر ئەوە نەبوایە و ((ئەمە نەبوایە؟!)) گومانم دەبرد کە هیچ کەسێک وتارەکانم ناخوێننەوە!

مەبەستم لە نووسینی ئەم بابەتە نەبوو، وەلێ بەدوای کاغەزێکدا دەگەڕام، ژمارەیەک لە موقتەبیسی کۆن هات بەدەستمدا، مێژووەکەی ساڵی ١٩٢٤بوو، کردمەوە و تەماشایم کرد دونیایەک لە بیرەوەری بە چێژ بەڕوومدا کرایەوە، خوێندمەوە مێژووی خۆمم تێیدا خوێندەوە: خۆمم بینییەوە لە سەرەتای خوێندنی ناوەندیدا بووم و کۆمەڵێ هاوڕێ لە چواردەوورم بوون، لە دوای ئەوان کەسم نەبینی وەک ئەمان ڕووبکەنە وانەکان و هەوڵی بۆ بدەن، لە چەسپاوی بەهرەی ئەدەبیان و بەهێزی سروشتی ئەدەبیان و سەلیقەیان لە لۆغەدا، لە پێشبڕکێ کردنیاندا بۆ خوێندنەوەی کتێبە بەهاکان و زانینی سەرچاوە سەرەکیەکان. وەک ئەو گەنجانە نەبوون کە هەوڵی نووسین دەدەن پێش خوێندنەوە، دەخەڵەتێن بە بڵاوکردنەوە و وادەزانن هاوشان و هاوڕێی هەموو ئەوانەن کە لەو ڕۆژنامەدا بابەتی بڵاودەبێتەوە، یەکێک لەوانە دەڵێت ئەم کتێبە بڵاودەکەمەوە و هێشتا دە لاپەڕەی لێ نەنوسیووە، ڕەخنە لە نووسەرێکی گەورە دەگرێت لە کاتێکدا نازانێت بە جوانی نووسینێکی ئەو نووسەرە بخوێنێتەوە، بە ئەدەبەکەی گۆڤارەکە هەڵدەخەڵەتێنێت، ئەو سیفەتانەشی باسم نەکردووە بە ئازارتر و خراپترە.

کۆمەڵێک کتێبم خوێندبووەوە، لە وانەی کە بیرماوە ((حیاة الحیوان))ی دەمیری، یەکەمین کتێبە کە خوێندوومەتەوە، دەریای زانیارییە(وەک چۆن ئەمڕۆ وای پێدەڵێن) یان فێرکارییەکە فیقهـ و

لوغە و ئەدەب و چیرۆک و مێژوو و ئەفسانە و زانست و ڕاستییەکانی لەخۆگرتووە، زۆر سوودم لێی بینی. کتێبی ((الصاحبي)) ئەحمەد فارس، گەورەیی عەرەبی و باوەڕبوون بەفراوانی و شکۆمەندی عەرەبی کردە دەروونمەوە، هەتا ئەمڕۆ سەرسامم بە پەیامەکەی ئیبنوفارس بۆ ئەوانەی نکوڵی فەزڵی تازەکان دەکەن لەبەرئەوەی تازەیە، مەیلیان بەلای پیرۆزکردنی کۆنەکاندا دەچێت چونکە کۆنە و، بە شتە گرانبەهاکان هەژماری دەکەن، ئەم پەیامەی لە پێشەکی کتێبەکەدا نووسیووە. کتێبی ((بلوغ الادب)) ی ئالووسی، دەمارگیریمی بۆ عەرەب زیادکرد، دواتر بۆم دەرکەوت شتی پووچی زۆر تێدایە وەک چۆن ڕاستیشی زۆر تێدایە، ئێستاش ڕستەکانیم ئەزبەرە لە ڕاست و بەتاڵی. کتێبی (الأغاني) هەموویم خوێندەوە، مەبەستم هەواڵ و چیرۆکەکانیەتی بەبێ سەنەد و دەنگ و شیعر و ڕەچەڵەکان، ئەم کتێبە سەرمایەی منە لە ئەدەبدا، (الكشكول)و(المخلاة)م خوێندەوە، (مراقي الفلاح)م لە فیقهی حەنەفیدا خوێندەوە، باوکم پێویستی کرد لەسەرم بیخوێنمەوە، خودای گەورە ڕەحمەت دابارێنێت بەسەریدا. شەرحی ڕیسالەی ئیبنو زەیدوونم خوێندەوە کە چاپکراوە لەسەر پەراوێزی (الغيث المنسجم)...

شێوازی خوێندنەوەم بەو شێوەیە بوو هەرکات لە وانەکانی قوتابخانە تەواودەبووم دەچوومە کتێبخانەکەمان و کتێبێکم هەڵدەبژارد، ئەگەر

پێی سەرسام بومایە وازم لێی نەدەهێنا هەتا تەواوم دەکرد، ئەگەر وانەبوایە وازم لێی دەهێنا. پەنام بۆ کەس نەدەبرد و بە ڕێنوێنی کەس نەدەڕۆشتم، جگە لەو کتێبانەی مامۆستای لوغە شێخ عەبدولقادر موبارەک دەیووت بیخوێننەوە و، ڕێنوێنی دەکردین بۆی. ئەدەبمان وەردەگرت لە زانای لێهاتوو و کارامە مامۆستا سەلیم جوندیی، ئاگاداری دەکردینەوە-خودا پاداشتی بداتەوە- لەوەی ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێبەکانی سەردەم بخوێنینەوە، نەبادا خراپ هەڵبژێرین و تووشی پەتای لاوازی ببین، ئەمەش لە پەتای کۆلیرا و گولی خراپترە! چوومە زانکۆ و لەکەسانی سەردەمدا تەنها مەنفلوتیم دەناسی ڕەحمەتی خودای لێبێت، وامدەزانی باشترین نووسەری سەردەمەوە و هیچ کەس نییە لەو باشتربێت، هەتا کتێبی ((رفائیل))ی زەیات کەوتە بەردەستم، گەنجینەیەک بوو لە گەنجینە بە بەهاکان لە پەخشاندا، لە تەکیدا((عبارات))ی مەنفلوتی بچووک بویەوە هەتا وەک هیچی لێهات، پاشان ڕافعیم ناسی کتێبی((تحت راية القرآن))ی دەرکردبوو خودا پلەی بەهەشتی پێ بەرزکاتەوە، زانیم خودا لە مەنفلوتی ڕەوانبێژتری بەدی هێناوە، ئێ وەڵڵا، لە عەبدولحەمید و ئیبنول موقنیع و ئیبنولعەمید، لەوانەی کە ئێمە بە پێشەوای ڕەوانبێژی و زبانمان دەزانین. لەگەڵ ئەوەشدا مەنفلوتیم لە بیرنەکردووە و سوپاسی خۆمم بۆ دەربڕیووە لەگەڵ مامۆستا جوندی و موبارەک بە پێشکەش کردنی سێ کتێبم ((هەیسەمیات))، ئەوەش یەکەمین کتێب بوو کە نووسیم.

دەڵێم: دوای خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی باسم کرد هەستم بەشتێک کرد دەروونمی دەبزواند، هەناسەم پێییدا بە هەوڵدانی نووسینم، وتارێکم نووسی کە ئێستا بابەتەکەیم بیرچۆتەوە، بۆ هاوڕێی خۆشەویستم ئەنوەر عەتارم خوێندەوە (ئەو دەمە ئەزموونی شیعری دەکرد)، پێی وتم بڵاوی بکەمەوە، ئەمەم بە گەورە زانی. هێندە بۆی ڕازاندمەوە هەتا شل بووم بۆی، بەرەو شوێنی موقتەبیس کەوتمە ڕێ، لە شەقامی سەنجقدار بوو کە ئێستا بۆتە کەلاوە و وێرانە. سڵاوم لە ئەبوبەسام کرد مامۆستا ئەحمەد کورد عەلی، ڕەحمەتی خودا لە خۆی و ڕۆژنامەکەی بێت... وتارەکەمم پێدا.

هیچ کەس لە هاوڕێکانم ڕێگای ڕۆژنامەیان نەدەزانی یان بوێری ئەوەیان هەبێت بابەتی تێدا بڵاوبکەنەوە. ئەو دەمە تاوانباربووین بە تاوانی شەرمکردن کە ئەمڕۆ گەنجەکان وازیان لێی هێناوە، تەماشای نوسینەکەی کرد نوسینێکی پێگەشتووی پیرانەی بینی، تەماشای ڕوومی کرد لاوێکی بینی، سەری سوڕما بوو ئەوە لەمە بێت، وەک ئەوەی بەڕاستی نەزانیبێتم هەتا تاقیکردمەوە بە نووسینی بابەتێک بۆی، گومانی وابوو چاپخانە پێویستی پێیەتی و نابێت دوابخرێت، بۆم داڕشتەوە وەک ئەو کەسەی پێنووسەکەی پێش هزری دەکەوێت، زیاتر پێم سەرسام بوو بەڵێنیدا سبەینێ وتارەکە بڵاوبکاتەوە، لە لای جەنابیان ڕۆیشتم و دەستم دەدا لەملا و لام هەتا بزانم باڵم لێنەڕواوە و لە خۆشیاندا پێی بفڕم. ئەگەر بەیعەتم

بدایە بە پێشەوای بڕواداران هێندەی ئەو بەڵێنە دڵخۆشی نەدەکردم. بەناو خەڵکیدا ڕێم دەکرد وەک ئەوەی بەسەر سەریاندا ڕێ دەکەم. وابزانم ئەو شەوە یەک کاتژمێر خەوم لێنەکەوت، بەڵکوو لەسەر جێگاکە هەر ئەمدیوو و دیووم بوو، بیرمدەکردەوە سبەینێ دەچمە چ بەهەشتێکی ئامادەکراوەوە، چ گەنجینەیەک دەدۆزمەوە. چاوەڕێی بەیانیم دەکرد، هەتا بەیانی هات و ڕۆژ هەڵهات و ڕۆژنامەکەم وەرگرت، وتارەکەی تێدا بوو لەگەڵ ستایش کردنێکدا ئەگەر بە جاحیز بوترایە بەزۆری دەزانی!



پاشان تەماشای ڕۆژنامە کۆنە زەردەکانم دەکرد لە نێوان پەڕەکانمدا کەوتبوو، بیرم لەو ئەدەبە دەکردەوە چی لێوەرگرتووم و چیم لێوەرگرتووە. لەدوای ئەو وتارەوە ڕێگای بڵاوکردنەوەم گرتە بەر، لە ڕۆژنامەکانی شامدا بابەتم بڵاوکردەوە پاشان چوومە لای خاڵۆم مامۆستا موحیبوودین خەتیب لە میسر، دەستی گرتم و هەنگاوەکانی ڕاستکردمەوە باشترین هاوکار و ڕێنوێنی کارم بوو، سوودم لە ڕەوشت و زانست و ساماناکەی وەرگرت. پاشان گەڕامەوە بۆ دیمەشق، پاشان پەیوەندیم بە ڕیسالەوە کرد، هاوڕێی ڕووحم و ئەربابی تەنیاییم، باشترین قوتابخانەبوو بۆمن، مامۆستا زەیاتی لێبوو باشترین مامۆستا.

ئەو دەمە ئەگەر سەیری کتێبم بکردایە، یان بیسەری قسەیەک بومایە، یان لە کوڕێکدا بوومایە، یان بەتەنیا بومایە، یان ڕاکشامایە بۆ خەوتن، یان لە خەو هەستامایە، یان ڕابردوو بکەوتایەتەوە یادم، یان بیرم لە داهاتوو بکردایەتەوە، یان چاوم دابخستایە و تێڕامایەم، یان بمکردایەتەوە بە ڕووی دیمەنێک لە دیمەنەکانی ئاسمان و زەمیندا...لە هەموو ئەمانەدا بابەتی وتارێک هەبوو بینوسم یان بابەتێک دایبڕێژمەوە، هیمەت ئامادەبوو هزریش چالاک بوو. پاشان ڕۆژ تێپەڕی و زەمانە ئاوابوو، وەهام لێهات نەمدەتوانی دێڕێک بنووسم، هەر دەمێکیش دەمنووسی نەمدەزانی چۆن بنووسم بۆ چ بنووسم. ئەوەی دەمنووسی بە مێشکێکی پەشۆکاوەوە دەمنارد بۆ ڕیسالە، ئەگەر دوامبخستایە تووڕەدەبوون، گەر بە تایپ بمنوسیایە و هەڵەم بکردایە و هەڵەچنەکە پێی نەزانیایە خەمباردەبووم، ئەگەر بمبینیایە شتێک دراوەتە پاڵ من کە هیی من نییە و وتارەکە چەندین هەڵەی تێدایە کە ئاماژەیە بۆ نەزانی نوسەرەکەی و ئەوە لە منەوە نییە و من خاوەنی نیم، بڕیارم دەدا واز لە نوسین بهێنم و کارەکەم زۆر بەگەورە دەزانی. پاشان ئەگەر وتارەکە بڵاوبکرایەتەوە، جارێک دەمخوێندەوە بۆ ئەوەی لێی دڵنیابم، جارێکی تر دەمخوێندەوە بۆ ئەوەی وەک کەسێکی ڕەخنەگر ڕەخنەی لێبگرم، پاشان فڕێم دەدا توانای سەیرکردنیم نەدەبوو، کەسم دەست نەدەکەوت لەبارەیەوە بۆم بدوێت، وەک ئەوەی بۆ بەردەڵانەکانی شاخ دەنووسم نەک مرۆڤەکان!

چ سوودێکم لە ئەدەب وەرگرتووە؟ من تەنها ئەدەبم وەک گاڵتەیەک بینی و ئەدیبەکانیش وەک شێتێک! خەڵکی بەدوای پارەدا ڕادەکەن ئەدیبەکانیش بەدوای سەرابێکی هەڵخەڵەتێنەرەوەن پێی دەڵێن(شکۆمەندی ئەدەبی)؛ هەرکات بەرەو ڕووی دەرۆن لێیان ڕادەکات پێی ناگەن هەتا دەمرن.....باس کردنی خەڵکی سوودی بۆ مردوو نییە و شکۆمەندی بەکەڵکیان نایەت، تەنها ئەو کردەوە چاکانەی پێشی خستووە بە کەڵکی دێت. سەعید ئەفغانی هاوڕێم لەمن ژیرتربوو، هەرکات باسی ئاواتەکانی ژیانم دەکرد بۆی و، ئارەزوو کردنم بەوەی ببم بە نوسەرێک کە ئاماژەی بۆ بکرێت، لچی هەڵدەقورتان وەک گاڵتەکردن پێم، ئەوێ ڕۆژێ لە قوتابخانەی ناوەندی بووین، پێشبڕکێمان دەکرد لە خوێندنەوەی کتێب و شانازیمان دەکرد بە پوختەکردنی و تێبینی نووسین لەسەری. زەمانە چی لە ئاواتەکانم کرد؟ بینیمی هەوڵدەدەم و دوای سەرابێک کەوتووم و ناگەم بە هیچ، هیچ شتێکیش نییە هەتا پێی بگەم!

ئەمە چیرۆکی منە لەگەڵ ئەو ئەدەبەی ئیمڕۆ وازی لێدەهێنم، یان گومانم وایە وازی لێدەهێنم و، ڕوودەکەمە فیقهـ و پەیمانەکەم نوێ دەکەمەوە بەو کتێبانەی لەبارەیەوە خوێندوومەتەوە و هێز و قوتمی پێدەبەخشم، بائەوانە خۆیان ئامادە بکەن وادەزانن من بەربەستێکم

لەوەی بگەن بەو ئەدەبەی دەیانەوێت، ئەوانەی وادەبینن من موزاحیمیانم لەسەر ئەم ئاوە بۆ گەنە.

لە لاوازترین ڕۆژەکانمدا باشترین ئەدەبم نوسیووە، ئەمە لەکوێی ئەوەدایە؟ ڕاستی و خەیاڵ وەک یەک دەبن؟ هیچ زانستێک هەیە شانبدات لە شانی و هێندەی ئەو بەرێزبێت، بە هۆیەوە درووست و یاساخ دەزانرێت، گەرەنتی مافەکان دەکرێت و دژایەتی دووردەخرێتەوە و ئاشتی بەرپا دەبێت..........؟ ئەگەر ئەمرۆ گەنجەکان سڵ بکەنەوە لە پۆشاکی ئەهلی فیقه و دەترسن پەسن بکرێن بە وشکی و دواکەوتویی، ئەوە ئەو کەسە ناترسێت کە ناویان ناوە شێخ و ڕازیبووە بەو ناوەش، مێزەرەکەی لەسەر قورس نابێت و ئەو ڕیشەشی بەری داوەتەوە..... پۆشاکەکەشی، هیچ تاوانێک نییە، کاریکات لەسەر بونیادنانی تەبیعەتی خەڵکی و ڕێنوێنی کردنی ژیانی، ئەو دەمەی تۆ پۆشاکێکی تەنک دەپۆشیت یان پۆشاکی وەرزشی دەپۆشیت، شۆرتی کورت لەپێ دەکەیت، هەست بەلەش سووکی دەکەیت و ئارەزووی بازدان و جوڵەجوڵ دەکەیت و ڕقت لەوەستان دەبێتەوە لەسەر زەوی، ئەگەر زۆر بی پۆشیت دەبێت بە خوویەک تێتدا. ئەگەر قاپوتێک بکەیتە بەرت و جامانەیەک بکەیتە سەرت ئارەزووی میهرەبانی و هێمنی دەکەیت، ناتوانی ئەو شتانە ئەنجام بدەیت کە دژی پۆشاکەکەتن، خۆت دەپارێزیت لە دانیشتن لە قاوەخانەکان و چوونە سینەماوە، یان خێرا ڕۆیشتن بەرێگادا، یان گاڵتەکردن یان قاقای پێکەنین لە مەجلیسدا... بەمە




ڕادێیت هەتا دەبێت بە تەبیعەتت. ئەگەر بیری بکەیتە سەوت بەپێویستی دەزانی هاوڕێیەتی ئەهلەکەی بکەیت و لەگەڵیاندا دابنیشیت، بێزار دەبیت لە مزگەوت و کۆڕی پەرستش ئەگەرچی نوێژکەرێکی دینداریش بیت، ئا لێرەوە ڕێگری کراوە لە خۆچواندن بە غەیرە موسڵمانان، نموونەش بۆ ئەمە زۆرە....

لە کاتێکدا ئەگەر من واز لە ئەدەب بهێنم واز لە نووسین ناهێنم، هەندێ لە نووسین زانستە، هەندێکی چاکسازییە، هەندێکی سوود بە خەڵکی دەگەیەنێت و ڕێنوێنیان دەکات بۆ ڕێگای چاکە.....هەروەها ئەم نووسینە زۆر بڵێیەکی جوانە و دڵنەواییەکی پووچە و قسەیەکی هیچە کە وشکی ناهێڵێت...خاوەن پێنووسەکان تەماشا بکەن چ هەڵدەگرن و واز لەچی دەهێنن، خوێنەرەکانیش تەماشا بکەن کامەی دەخوێننەوە و کامەی فەرامۆش دەکەن!



دووبارە داوای لێبووردن دەکەم لە خوێنەران لە قسەکردن لەبارەی خۆمەوە، چونکە قورسترین قسەیە لەسەر بیسەر، بەڵام پیشەی ئەدەبە، خودا لەناوی ببات!

ویستم – کە دەستم کرد بە نووسینی ئەم وتارە- شتانێکی زۆر بڵێم کە لە دەروونمدا ئامادەم کردبوو، کە گەشتمە ئەوەی باسی

یەکەمین وانە بکەم کە پێشکەشم کردووە، ئەو قۆناغەی ژیانم هاتەوە یاد کە وەک مامۆستا بەسەرمبردووە و لە ئاسۆدا گەڕاوم، تێیدا چێژ و ئازارم چەشت و ڕۆشنی شەو و تاریکی ڕۆژم بینی کە تەنها خودا هەقیقەتەکەی دەزانێت، لەوەی کە تەنها کەمێکی کەمێکیمم پەسن کردووە لە ڕیسالەدا... کە گەیشتم بەوە هەست و سۆزەکان لە دەروونمدا تونبوون و یادەوەرییەکان بەشێوەیەک ورووژان پێنووسەکەمیان لە جوڵە وەستاند.

چۆن لە یەک وتاردا هەموو پارچەکانی دڵم کۆبکەمەوە، لە دارستانەکانی دیمەشق کە لە هەموو قوتابخانەکانیدا خوێندوومە، لە جەنگەڵە دڵ ڕفێنەکەی بەیروت لە کۆلیژی شەریعە، لە کەناری (وادعـ)ی دیجلەدا لە ناوەندیی مەرکەزییە، لە ڕێگای ئوبولە یەکێک لەچوار بەهەشتەکەی دونیا لە ناوەندی بەسرە، لە فەزا فراوانەکە لە کەرکوک شاری ئاڵتونی ڕەش کە بەردەوام دەگرێت، ئەو شارەی دانیشتوانەکەی کەسانێکی بەڕێزن، ئەوانەی لە یادمە و لە یادم نییە؟

هەزارەها وێنە بە دڵمدا دەڕوات کە پێشتر بە چاومدا ڕۆیشتووە، بەڵکوو ئێستا هەزارها ڕوو دەبینم هیی هاوڕێکانی کاتی خوێندم و ئەو خوێندکارانەی کە خۆشم ویستوون، لە تاریکی یادەوەرییمەوە هەڵدەقوڵێت و پاشان دێتە لام و بە ڕوویەکی بە خەندەوە چیرۆکی



دەروونم بۆ دەگێڕێتەوە، دەمگەڕێنێتەوە بۆ ئەو تەمەنەی بەڕێم کردووە، چۆن بتوانم لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەمدا کۆببەمەوە و ماڵئاواییان لێبکەم پێش ئەوەی دووبارە دابڕێمەوە لێیان، بۆ ئەوەی پەیمانیان بۆ نوێ بکەمەوە؟ چۆن و لەکاتێکدا لە ژێر هەموو ئەستێرەکاندا بڵاوبونەتەوە؟! چۆن و لە کاتێکدا ئەوەیان بەرزبووەتەوە بەرزبووەتەوە و ئەوەیان دابەزیووە دابەزیووە، سەرقاڵییەکانی دونیا سەرقاڵی کردوون و ئەو مامۆستایەیان بە یاد نایەتەوە ئەگەرچی مامۆستاکە لە یادی نەکردوون! چۆن و لەکاتێکدا وەفادار و بێ وەفایان تێدایە، مرۆڤەکان وەک کانزان....

ڕەحمەتی خودا لە مامۆستاکان بێت، لەوانەی کە خاوەنی دڵن! سڵاو لەو ڕۆژانەم بێت کە وەک مامۆستایەک بەڕێم کردن....سڵاو لە هەموو ئەو خوێندکار و هاوڕێیانەی ئەم بابەتە دەخوێننەوە، بەرزترین وەفا و سڵاوی دڵم بۆیان هەیە.

* * *



# وەستانێک لەسەر کەلاوەکان

لە ساڵی **١٩٤٥**دا بڵاوکراوەتەوە

لە لای مزگەوتی ئەمەوی و لە ژێرسایەی شورا بەرزەکەیدا، لە نێوان
لانکەی پاڵەوانی بە توانا مەلیک سەڵاحەدین و قوتابخانەی
کلاسیکی ئەسەریدا، لە نێوان قوتابخانەی سمیساتیە و
ئیخنائییەدا، قوتابخانەی جەقمەقیە چۆڵ و وێرانە
کە سەنجەر هیلالی بونیادی ناوە، مەلیک ناسر
لە ساڵی ٧٦١ی کۆچیدا تازەی کردۆتەوە، پاشان سووتا و
ئەمیر سەیفەدینی جەقمەق نوێی کردۆتەوە و دراوەتە پاڵی.

هەر دەمێک بەلای ئەم قوتابخانە وێرانە لە کارکەوتووەدا تێدەپەڕم ئەو یادگارییانەم دێتەوە یاد کە تێیدا ماڵئاواییم لێی کردووە و ئەو بەشەی ژیانم کە تێیدا جێمهێڵاوە، ئیللا دڵم ئاور دەداتەوە، و ڕادەدێرێت، ڕازەکان لە دڵدا دەوروژێن و وێنەکان لە چاومدا

هەڵدەقوڵێن، داندەنێم بەوەی دەستەوسانم ڕێگیان بخەم و بخوێنرێنەوە و بیانکەمە ئەم قاڵبە بێگیانە تەنگەوە، لە کاتێدا خێراترە لە ڕووناکی و فراوانترە لە زەمەن...... ئەگەر بمەوێت پەسنی بکەم تەنها ئەو وتە و قسە دووبارانەم دەست دەکەوێت کە شاعیرەکان لە سەردەمی نومروقەیسەوە لێی لانادەن، کە وەستاوە و وەستێنراوە، گریاوە و گریانراوە، دووبارەی دەکەنەوە و دەیڵێنەوە، ئێستاش هەر تازەیە لە هەموو دڵێکدا و خێرایە لەسەر هەموو زوبانێک....پرسیار لەم دیوارە ڕووخاوانە دەکەم، دەدوێم ....لەگەڵ ئەم ژوورە چۆڵانەدا. ئاییی! ئەگەر ئەم دیوارانە تاریفی ئەوەی دەکرد کە بینویەتی و دەرگاکان دەهاتنە گۆ، ئاییی! ئەگەر گۆرانیەکان تێدەگەیشتن و بیناکان قسەیان دەکرد! چۆن؟ دڵی خەڵکی بە ئاگا و بە وەفا نەبووە، چۆن خاک و خۆڵەکە بەوەفا بێت.

لە دەروونم دەپرسم: ئایا دەروونەکان وەفا دەزانن؟، کە سوور دەخوات چۆن زەمانە سوور دەخوات، بۆ هەموو دۆخێک پۆشاکی خۆی دەپۆشێت و بۆ هەموو ڕۆژێک پێوانەکەی هەڵدەگرێت؛ ئەوەی دوێنێ لای بەشکۆ ئەمڕۆ لای سانا دەبێت، ئەوەی لای گرانبوو بە هەرزانی دەزانێت، ئەوەی لای هەرزانبوو گرانی دەکات، کەسێک دەبینین و گوێی پێنادەین کە لە پێشدا شوێنی خۆشەویستیمان بووە، قەناعەتمان وابوو پەیوەندیمان لەگەڵ ئەودا بە بەختیمانە لە دونیادا یان شوێنی گەورەییمانە و، ڕازی بوونیان ئەوپەڕی ئاواتمانبوو، بەلای شوێنێکدا تێدەپەڕین و ئاوڕی بۆ نادەینەوە کە تێیدا تاڵی و

شیرینی ژیانمان چەشتووە و، شوێنەواری دەروون و تەمەنمانی تێیدایە؟!

سەردەمانێک ئەگەر پێیان بوتمایە ڕۆژێک دێت بەسەرتدا بەلای ئەم قوتابخانەدا تێدەپەڕیت و لەلایدا ناوەستیت ئیللا وەستانی بیرکردن و تامەزرۆبوون نەبێت، پاشان دەڕۆیت بەلای کاری خۆتەوە و لە دوای چەند هەنگاوێک لە بیری دەکەیت، بەڕاستم نەدەزانین! چۆن بەم شێوەیە بەلامەوە سانا بوویەوە کە دوێنێ نیوەی دونیام بوو؟ ئایا دونیای خوێندکار تەنها ماڵ و قوتابخانە و ڕێگای نێوانیان نییە؟ بەردەوام لەبیر و هۆشمدا بوو: لە بەیانیاندا کە دەچووم بۆی، لە نیوەڕۆدا کە تێیدا بووم، لە ئێوارەدا کە دەگەڕامەوە لێی؛ خۆشی و ناخۆشی، دۆست و دوژمنمی تێدا کۆبووووەوە، بەشێک بوو لە من. بەڵکوو چۆن ئەو منداڵەم لە یاد کرد کە ساڵی ١٩١٨ خوێندکار بوو هەڵگری ناو و شێوەی من بوو؟ چۆن ڕێگەمدا بە دەروونم بۆچوونەکانی فڕێ بدەم و گاڵە بە فیکرەکانی بکەم، ئەوەی بە گەورەی دەزانی بەسووکی بزانم؟ داماوە ڕۆیشت و نازانم بەرەو کوێ ڕۆیی، لە دوای ئەوەوە هاتووم، لێ ڕووداوەکانیم لە بیرنەکردووە. ئایا یادگە تاکە شتی جێگیرە لە مرۆڤدا لەو دەمەی ئاوەز و جەستە دەگۆڕێن؟

پرسیار لە بیریارەکان بکەن ئەگەر زانستیان لایە، سوپاس بۆ خودا لە ئەهلی فەلسەفە نییم!

***

لە بیریارەکان بپرسن و لێمگەڕێن لەبەر دەرگای ئەم قوتابخانەدا ئەو ڕۆژانە بگەڕێنمەوە کە ڕۆیشتوون. ئەگەر خەڵکی بگەڕێنەوە بۆ ڕابردوویان بۆ ئەوەی بحەوێنەوە و دڵیان خۆشبێت بە یادکردنەوەی ڕووداوەکانی، وەڵێ من دەگەڕێمەوە بۆ ڕابردوو بۆ ئەوەی تێیدا بژیم، ڕادەکەم لە ئێستام و ڕقم لێیەتی و بێزراوە لەلام. من کەسێکم هەتا لە تەمەندا بچمە پێشەوە تەنهاییم لەلا بەنرختر دەبێت و لە کۆمەڵ ڕادەکەم، وەک ئەوەی هەموو ڕۆژێک پەتێک لەم گورسیە دەپچڕێنێت کە گەمیەکەی بەستووە بە هەزارەها گەمییەی بچووکەوە لەلافاوی ژیاندا، وەک چۆن کەشتیەکان کۆدەبوونەوە و دەریای تاریکییان دەبڕی، ئاوی تێدانییە بەڵکو ئاگری تێدایە[24]، ئاگرێکی لە ژێردایە نازانرێت چ کاتێک دەتەقێتەوە زەوی دەریاکە دەهەژێنێت و شاخی شەپۆلەکان گڕدەدا، یەکێکی تر لە ئاسمانەوە ڕەجمی دەکات و دەرگایەکی دۆزەخی بەڕوودا دەکاتەوە...تەوژومی ژیان زۆر لەمە ناڕەحەتر و سامناک ترە.

....هەتا وام لێهات گورسیەکەم هەپرون هەپرون بوو تەنها چەند دەزوویەکی ماوەتەوە؛ کۆمەڵێک هاوڕێ کە لەپەنجەکانی دەست تێپەڕ ناکەن، چەند شوێنێک کە لەوە کەمترە، تەنها دەگەم بە ئەوان و ڕانایەم لەگەڵ کەسی تردا. لە شەوە درێژەکاندا شادوومانکار و

[24]واتە کاتی جەنگی جیهانی دووەم، دەریایی تاریکیی دەریایی ئەتڵەسە.

هاوڕێم نەماوە ئیللا ئەم کتێبانە نەبێت کە لێی بێزاربوومە و خۆشەویستییەکەی بۆتە زۆر لە خۆکردن و قسەکردنەکەی بۆتە بێزاری، ئەو ڕابردووەش کە ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر پێوەی وابەستە دەبم و بیری دەکەم، سەبارەت بە داهاتوو لێی دەترسم و بوێری ئەوەم نییە بیری لێبکەمەوە.

هەربۆیە کە دەگەم بە یەکێک لە هاوڕێکانی سەردەمی منداڵیم دەیوەستێنم و لە ئامێزی دەگرم، لە پۆشاکەکانیدا بۆنی گوڵەکانی ڕابردووی شیرین دەکەم، گاڵەی منداڵی و سۆعبەتە خۆشەکانی، بە باخەکانیدا تێدەپەڕین و ڕێدەکەین بە ڕێگا سەوزەکەی کە لەملاولایدا گوڵە بەیبوون و شەقایق ڕوواوە، دەمەوێت لە پشتی ئەم گەنجەوە کە شەو لێی داوە هەتا گەیشت بە پیری و پێداویستیەکانی بژێوی ماندووی کردووە و پرشنگداری و جوانییەکەی لێسەندووەتەوە، وەک ئەو دارە تاقانەی لێهاتووە کە لەلای شیوەکەدایەوە و هەرزوو سەرمای پایز لێی داوە... دەمەوێت لە ڕێیەوە ئەو منداڵە ببینم کە بەردەوام دڵخۆشبوو، پێدەکەنی، ڕۆژانێک هاوڕێم بوو خۆشمدەویست و خۆشیەکانم لەگەڵیدا بەش کردبوو....ئەگەر نەیبینم وەک خۆم دەمێنمەوە و پیاوێکی بێئومێد ڕادەکێشم کە لە بەرزترین هیواکانیاندا لێی قەوماوە و خۆشەویسترین ئاواتەکانی دڵی لەدەستداوە. ئەگەر لە شوێنێک لە شوێنەکانی منداڵی یان یارییەک لە یارییەکانی منداڵیدا بوەستم

سوچ و پایەکانی دەگەڕێم، بەردی دیوارەکان لادەدەم، پێویستە لە نێوانیاندا یادگارییەکی شیرین بدۆزمەوە کە ڕۆژێک شاردوومەتەوە و لە بیرم کردووە.

هەربۆیە ئەمڕۆ لەلای جەقمەقییە وەستام، لێ ئەوەم دەست نەکەوت کە دەمویست. هەردوو دزەکە شیرینترین یادگارییەکانمیان لە تاریکی شەودا لێ دزی، وەک چۆن دزەکان ئاڵتون لە گۆڕی فیرعەونییەکان دەدزن، هیچی بۆ نەهێڵامەوە تەنها هیچەکانی نەبێت. چ باس بکەم بۆ خوێنەرەکانم لەدوای ئەوەی ئەو دوو دزە پێیان کردم: زەمانە و بیرچوونەوە؟!

***

ئەمە ئەو قوتابخانەیە کە سەردەمی منداڵی و یادگارییە خۆشەکانم تێیدا بەجێهێشتووە، هێشتا دیوارەکانی ڕاوەستاوە و بونیادەکەی فەوتاوە، ئەمە ئەو ڕێگایانە کە پێیدا دەهاتم بۆ قوتابخانە و دەچوومەوە بۆ ماڵەوە، ئەمە ئەمەوی مەزنە هەموو ڕۆژێک بەیانی و نیوەڕوان و ئێواران دەچووینە سەری، هەر ئەوە لە نێوانماندا بوو لە دەرگای قوتابخانە دەربچین و دەچووینە دەرگای ئەوەوە، پاسەوانەکەمان غافڵ گیردەکرد و ڕاماندەکرد، بە دارەکەیەوە شوێنمان دەکەوت، پێدەکەنین و فێڵمان لێی دەکرد، لەسەربانی پاکی مزگەوتەکەدا ڕاوی دەناین هەتا تەواو ماندوودەبوو لێمان دەگەڕا و

چی بەدەما بهاتایە پێی دەوتین، کە دەروێشت و هاندەری یاری کردنمان نەدەما عاقڵ دەبووین و دەچوین گوێمان لە وانەکانی دەگرت. ئەمە ئەمەوییە ئێستاش هەر بەگەورەیی و مەزنی ماوەتەوە، هیچ مزگەوتێک لە دونیای ئیسلامدا شان نادات لە شانی لە ڕووی مەزنی و فراوانیەکەیەوە، لێ وێنەکەی لە چاومدا گۆڕاوە و ناوازەییەکەی سڕاوەتەوە و جادووەکەی بەتاڵ بۆتەوە. چی لە دیوار و بنمیچەکان دەکەیت ئەگەر ڕووەکان ڕۆشتبوون و ڕووحەکان گۆڕابوون؟ ئێستا ئەمەوی ئەمەوییەکەی جاران نییە؛ نە وانەکانی وانەکانی ئەو کاتەیە، نە زاناکانی زاناکانی ئەوکاتەیە، نە کەشەکەی کەشی ئەو کاتەیە. شارەکانیش وەک کەسەکان وان؛ هەموو ڕۆژێک لە دایک دەبنەوە. ئەو دیمەشقە مرد کە گەشەمان کرد تێیدا، دیمەشقی ئیسلامی زۆرباش، کە هیچ مەی فرۆشێکی دیار و قومارخانەیەکی بەناوبانگی تێدا نەبوو، نە باڕی تێدابوو نە خانەی لەشفرۆشی، ئافرەت لە ماڵەوەبوو پیاویش بۆ خێزانەکەی بوو، زاناکان کارییان بە زانستەکەیان دەکرد و میللەت بە قسەیان دەکردن، گەڕەک وەک یەک ماڵ وابوو لە هاوکاری کردن و هاوسۆزیدا، مزگەوتەکان ئاوەدان بوو پیاوەتی دیاربوو، ئەهلی دین بەهۆی دینەوە دونیایان نەدەخوارد و نەیاندەکردە بازرگانی........

داخی گرانم بۆ ئەو دیمەشقەی کە مردووە! ڕەحمەتی خودا لەو ڕۆژانە بێت: ئەو ڕۆژانەی لە دونیادا تەنها چێژی باش و باشی بە چێژمان دەزانی، گاڵە و گەپم دەکرد بەڵام وەک گاڵە و گەپی

ئەمڕۆ نا. دوورترین شوێن کە بۆی دەچووین ئەمەوی بوو، یان شەوان دەبووین بەدوو دەستەوە لە نێوانماندا جەنگ هەڵدەگیرسا، سەرمان دەشکا یان بریندار دەبووین، لێ فێری پیاوەتی و هێز دەبووین، پاشان پێکەوە بەتەباییەوە دەگەڕاینەوە. یان وازم لە وانەکان دەهێنا بە خوێندنەوەی چیرۆکی عەنتەر و حەمزە پاڵەوان، لێوەی فێردەبووین لەوەی کەممان بوو لە زانستی پەلاماردانان و ڕاکردن و زۆرانبازی و جەنگ و فێڵ کردن لە مامۆستاکانمان، ئەگەر حەزمان لە خۆشی بوایە و بمانویستایە تەماشاکردنی خەیاڵی سێبەر کەراکوز، سینەمای ئەو ڕۆژانە بوون، تەنها ئەوانە دەچوون بۆ سینەما کە کێشە لە ڕەوشتیاندا هەبوو. سەبارەت بۆ خۆ جوان کردن و خۆڕازاندنەوە هیچمان لێی نەدەزانی، سەردەمی ئێمە پێمان عەیبوو پانتۆڵ لەپێ بکەین چونکە جەستەتی وێنادەکرد، بە قەنابیزەوە دەچووین بۆ قوتابخانە، پەلەمان بوو لەوەی زوو گەورەبین دەرمانێکمان بەکاردەهێنا مووی سمێڵی گەورەدەکرد و گەشەکردنی خێرا دەکرد.

ڕۆژەکانمان لە کوێیە کە لەم قوتابخانەدا بەسەرمان برد، ئەو ڕۆژانە دەگەڕێنەوە؟ ئەو شێخە لە کوێیە کە لە هەموو نەفسێکدا خۆشەویست بوو لە هەموو چاوێکدا بەشکۆبوو، شێخی شام و شەست ساڵ مامۆستای....شەست ساڵ بەردەوام بوو لەسەر زانستەکەی منداڵانی ئەم میلەتەی وەردەگرت و بە گەنجێتی و مامۆستاییەوە

دەیگەڕاندنەوە، لە مێشکی خۆی دەکردە مێشکیانەوە، لە ئیمانی خۆی دەکردە سنگیانەوە، کوڕ و باوک و باوەڵی لێوەی فێردەبوون. ئەوە تۆماری قوتابخانەکەیەتی لێیان بپرسن وەڵامتان دەدەنەوە. ئەمەش پێشەوا شێخ عبد سیفەرجەلانییە.

• • •

ئەمە قوتابخانەکەیەتی! ئەمە بیناکانە نیشتەجێکانی لە کوێن؟ هاوڕێکانم لە کوێن؟ ئەوانە لە کوێن کە یەک کورسی کۆی دەکردنەوە و لە هەموو شتێکدا یەکسان بوون، کەسیان لە کەسیان جیانەبوون ئیللا ڕێژەی دەرچوون نەبێت یان ئەو ستایشەی لەلایەن مامۆستاوە وەریدەگرت؟ فڵانە کەسی فەقیر نوێنەری پۆلبوو، لە نێوان خوێندکارەکاندا لە پێشەوەبوو و، شێخیش دەیکردە نموونە بۆ کوڕە دەوڵەمەندەکان، مژدەی شکۆمەندی و پارە و پایەی پێدەدا، پێی دەوت تۆ لەسەر گوڵی ڕاخراو دەڕۆیت لە کاتێکدا ئەوان بەسەر دڕکدا ڕێدەکەن.

ڕەحمەتی خودات لێبێت، هەموو شتێکت پێکا تەنها ئەمە نەبێت. بیرەوە و تەماشابکە زەمانە چۆن دووری خستوینەتەوە، براکانی دابڕیووە و خۆشیەکانی پەرت کردووە، بڵاوبوونەتەوە بە ئاسۆی زەویدا و بڵاوبوونەوەتەوە بەپەیژەی ژیاندا بە بەرز و نزمەوە، زۆرێکیان بەسەر دڕکدا ڕۆیشتن و پێ خاوسەکەیان خوێناوی بوو، کەسانی تر

لەسەر گوڵ و ئامین و یاسەمین ڕۆیشتن و پارە و شکۆمەندی و پلەیان بەدەستهێنا، ناوی کەسیانت پێ نالێم بۆ ئەوەی بێتاقەت نەکەم لە بۆچوون و باشیەکانتدا!

نەخێر، حەزناکەم بگەڕێمەوە بۆ ئێستا، لێمگەڕێن چێژ وەربگرم بە باسکردنی ڕابردوو وەک چۆن ئەوکەسەی ونبووە لەدەشتایدا چێژ وەردەگرێت لەو توێشووەی کە پێی ماوە. تەماشای هەموو شتەکانی چواردەوورم دەکەم گۆڕاون و نکوڵی دەکەم، هەست دەکەم وەک کەسێکی بێگانەم لێهاتووە لە نیشتیمانەکەمدا، من و ئەنوەر عەتاری برام بەردەوام بیری نیشتیمانمان دەکرد و لە ڕووی مانگدا دەمانبینی لەلای فرۆکەخانەوە، لە لای دیجلەوە لەسەر پردەکەوە، دڵمان لە تامەزرۆیدا دەتوایەوە لە کاتێکدا لە بەغداد بووین، شاری خۆمان و برا بەڕێزەکانمان، ڕێگای شامیش کراوەبوو، ئەی دەبێت حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت هەست دەکات نیشتمانەکەی زەمانە پێچاویتەوەوە و لە پشتی ساڵەکاندا ونبووە و هیچ ڕێگایەک نییە بۆی؟

ئەی قوتابخانەکە، پێمان ڕابگەیەنە: بۆچی ناتوانین بە ڕێی زەمانەدا بگەڕێینەوە وەک چۆن دەتوانین بە ڕێگاکانی زەویدا بگەڕێینەوە؟ بۆچی ناتوانین لە ماوەیەکی خۆشی ژیانماندا بوەستین وەک چۆن کەسێکی گەشتیار لە شوێنێکی جواندا دەوەستێت ئەگەر بەلایدا تێپەڕبکات؟ ئەوکات دەگەڕامەوە و هەموو تەمەن خوێندکاردەبووم تێیدا، چێژم بە هاوەڵێتی ئەو شێخە نورانیە وەردەگرت

و لە کەشێکدا دەژیام کە شادوومان دەبووم بە ئامۆژگاری و چیرۆکەکانی، هەمیشە ئەو منداڵە دەبووم کە نەیدەزانی شەڕ چییە....ئەمە ئەوەیە خوازیارییم، چەندێ دوورە ئاواتە درۆینەکان بێنە دی!

***

هەرکات ئەم قوتابخانە دەبینم چۆڵ و وێرانە و کەسی لێ نییە و هیچ مرۆڤێک باسی شێخەکەی ناکات، دڵنیا دەبمەوە سپڵەیی سروشتی ئەو خەڵکانەیە. ئایا دیمەشق شێخ و مامۆستاکەی لە بیردەکات کە چاکەی هەبووە بۆی؟ ئەم شێخە زانایەکەی نووسەر نەبوو، سیاسییەکی فەرمانڕەوانەبوو، بیریارێکی بیرمەند نەبوو، لێ لە بوژاندنەوەی دیمەشقدا ڕوکنێکی بونیادنا هیچ زانا و حاکم و بیریارێک لەوەی ئەویان گەورەتر بونیادنەنا. مامۆستای منداڵەکان بوو لێ منداڵەکان بوون بە سەرکردەی شار، قوتابخانەیەکی ڕێکخراوی لە دیمەشقدا دروستکرد لەوکاتەی تەنها چەن کتێبێکی تێدابوو، هەر لە فیترەتەوە پەروەردەکاربوو نە بستالوسی خوێندبوو نە بنچینەکانی وانە وتنەوە، لێ باشترین پەروەردەکاربوو کە بینیبێتم.

ئەی خوێنەرەکان، مەڵێن: شێخ عیدی سیفەرجەلانی کێیە؟ چی داوە لەوەی پەڕەکانی ڕیسالە پڕە لە هەواڵی ئەو پیاوانەی کەس نایانناسێت؟ ئای چەندێ کەسانی مەزن لە تاریکی بیرچوونەوەدان،



لە ڕووناکی ناوبانگانیشدا چەندێ پەیکەر هەیە کە وادەزانین خەڵکن، لێ لە ڕاستییدا لە بەرد یان لە مسی سارد بونیاد نراون!

• • •



# لە دوای نەخۆشی

لە سالی ١٩٣٧دا بلاوکراوەتەوە

....دەڵێن مرۆڤ دەخوات بۆ ئەوەی بژی، وەلێ ئەمڕۆژانە دەژیم بۆ ئەوەی بخۆم، بە برسێتیەوە دەخۆم و زۆر دەخۆم هەتا هەست دەکەم گەدەم پڕبووە و شوێنی گەردیلەیەک نەماوەتەوە، بە خەمبارییەوە واز لە خواردنەکە دێنم و تەماشای قاپەکان دەکەم و ئەوەی تێیدایە، وەک ئەو کەسەی بە دڵگرانییەوە ماڵئاوایی دەکات، پاشان دەچم بەلای کتێبەکەمەوە دەیکەمەوە، یان بەلای پەنجەرەکەمەوە و لێوەی تەماشادەکەم، بەمە و بەوەوە خۆم سەرقاڵ دەکەم هەتا هەست (یان خەیاڵ دەکەم کە هەست ) بە برسێتی دەکەم، داوای خواردن دەکەم، یان سێ کاتژمێر تێدەپەڕێت، خواردن دەخۆم گەرچی برسیشم نەبێت....ئەی دکتۆر پێی نەوتم: هەموو سێ کاتژمێرێک خواردن بخۆ؟!

ئەمەش بەهۆی ئەوەوەبوو ماوەی بیست ڕۆژ حەزم لە پارچەیەک نان بوو داوام دەکرد و زۆر دەموتەوە بەڵام نەیاندەدامێ، دەخەوتم و خەوم پێوەی دەبینی، لە کاتی بە ئاگابووندا خەونم پێوەی دەبینی،

ئاوات و بیرکردنەوەکانم بۆیان بەرجەستە دەکردم خەیاڵم دەکرد بەدەستم هێناوە، دەمبینی تەنها ئەم شیرەم بەدەستدەهێناوە کە لێی جاڕس و بێزاربووم، کە بەیانیان و ئێواران لەسەر شێوەی عیزرائیل خۆی پێشان دەدات، بەهۆیەوە ڕقم لە هەموو سپیەك بوو....تەنانەت سپێتی بەرەبەیانیش! لە چاومدا وەک پیسیەیەک وابوو توانای بینینیم نەبوو، بووبە زەهرێک لە دەمدا و نەمدەتوانی تامی بکەم....پاشان خودا ڕزگاری کردم و هەموو ئەو خواردنانەی پێ بەخشیمەوە کە حەزم لێیەتی و دەمەوێت، چۆن بەبرسێتیەوە هێرش ناکەمە سەری، گەمژەیەتی وا چۆن دەکەم لەسەر سفرە هەستم و دەورییەکان خواردنیان تێدا مابێت؟

* * *

تێر نابم لە خواردن و خوێندنەوە و تێڕامان لەم فەزا فراوانەدا، ئەم باخاتە یەک بە دوای یەکانەی لە پەنجەرەکەمەوە دەردەکەون هەندێکیان هەندێکی تریان لە ئامێزگرتووە هەتا کۆتاییەکەی دەگاتە ئامێزی قاسیۆن....لە هیچ تێرنابم چونکە لەو نەخۆشییە دەرچووم وەک کەسێک کە دووبارە لە دایکبووەتەوە، هیچ لە دونیا نازانێت، بە دووچاوی منداڵێکی زیرەک تەماشای دەکات کە هەموو شتێک سەرسامی دەکات و ئاوات دەخوازێت هەیبێت و بیخوات و لە دەستیدا جەمی بکات....چونکە من بە لاوازیی و ماندوویبیەوە لێی دەرچووم پێشتر بەهێز و چالاک بووم.

ڕۆژێک لە ڕووبارەکە خۆم شۆری، پاشان بەچوست و چالاکی و بەهێزییەوە هاتمە دەرەوە، خەریکبوو دەفڕیم بەهۆی ئەو چالاکییەی کە هەستم پێی دەکرد، بە کەناری ڕووبارەکەدا ڕۆیشتم هەتا گەیشتم بە بەردێکی گەورە، ئەو بەردەی کە لە ڕووبارەکەدایە وەک تاقێکی گەورە وایە، یان وەک کەوانی سەرکەوتن وایە ئەم ئاوە نەرم و نیانە دایناوە، کە سەرکەوتوە بەسەر ئەم بەردە گەورە ملهوڕەدا، بە خۆڕاگری و جێگیربوونەکەی بە تێکۆشان لە دژیدا و ئاوا بۆشی کردووە، هێشتا هەر مەزن و ملهوڕیشە.....سوننەتی پەروەردگارە لە خۆبەزلزانەکاندا، هەموویان ناو بۆشن! کە لە بەیروت پێی هێژن ((بەردی خۆکوشتن)) چونکە شێتەکان، دوژمنی خۆیان و نیشتمانیان، لەوێوە خۆیان فڕێدەدەن و دەکەونە......دۆزەخەوە! خۆر بەرەو ئاوابوون دەچوو، کۆتا هەیبەتی خۆی دەدا بە ڕووبارەکە و گەشاوە و پرشنگدار دەردەکەوت وەک ئەوەی پۆشاکێکی لە نوور پۆشی بێت، ئەم ئافراینراوەم بە گەورە زانی: خۆر و ڕووبار و بەردەکە، لە بەردەم سرووشت و شکۆمەندی بەدیهێنەرەکەیدا بە بچووکیەوە وەستام، پاشان ئەو چالاکییەی هەستم پێی دەکرد زاڵبووبەسەرمدا و گەیشت بە مێشکم و پڕبوو لە بانگەشەکردنی خۆبەزل زانین و غرور، مرۆڤ لە فیکر و سۆزیدا بەردەوام ملکەچە بۆ دۆخی جەستە و ڕێژەی تەندرووستیی، بەردەکەم بینی بەرەو فەنابوون دەڕۆیشت و ئاوەکە یاریی پێدەکرد، ئاوەکەش بەرەو نەمان دەڕۆیشت و خۆر کردبووی بە هەڵم، خۆریش بەرەو ئاوابوون



دەڕۆیشت و ڕووبارەکە قووتی دابوو، بینیم تەنها خۆمم دەمێنمەوە، ئەوە منم بەردەکەم کەل کردووە، ئەوە منم ڕووبارەکەم زەلیل کردووە، ئەوە منم هەموو گەردوونم کردووە بە کارگەی تاقیکردنەوەی مێشکم و کەویم کردووە بۆ سوودی خۆم، ئەوە منم لە سینەمدا جیهانێکی گەورەتر لەم جیهانە هەیە، ڕووناکیەک ڕووناکتر لە ڕووناکی ئەم خۆرە، سۆزێک قوڵتر لەم ڕووبارە و نەرمتر لەم ئاوە و توندتر لەو بەردە....

چووم بۆ قوتابخانە و دەموت ((من))، پەنادەگرم بەخودا لە وشەی ((من)) چونکە وشەی ئیبلیسە.... بەپێ ڕۆیشتم دەستم کرد بە خواردن خواردنی ئەو کەسەی دووکاتژمێر لە ڕووباردا بووە و، کاتژمێرێکی تەواو ڕێی کردووە، لە (الروشة) بۆ (الحرج)[٢٥]، مەستی چالاکی و ((من)) هێشتا لەسەرمدا بوو، چووم بۆلای خوێندکارەکان و ڕێم کرد و ڕامکردوو و زۆرانم کرد و هەموو ئەو شتانەم کرد کە کەسی ژیر ئەنجامیان نادات، کە گەڕامەوە بۆ قوتابخانە نقووم بووبووم لە ئارەقدا دوو پەرداخی سەهۆڵاوم خوارد و بە ئاوی سارد خۆم شۆری، خەوتم و کە هەستام نەخۆشبووم!

•••

ئای لەم لە خۆباییە گەمژەیە کە تەنها یەک گەردیلە زانستی پێیە، گاڵەی بە گەردوون کرد وەک گاڵەی مناڵ، بەرزی کردەوە و

---

[٢٥] دوو ناوچەی بەیروتن. (وەرگێڕ).

دایبەزاند، هیچ ڕازی نەدەکرد ئەوە نەبێت بانگەشەی خوایەتی بکات یان ئەم زانستە بیکات بە خودا.... ئای لەم هێزە درۆینە و ئەم دەسەڵاتە هیچە، ئەم بەهێزە توندە کە بەردی کەل کرد و ڕووباری کەچ کرد، یەکێک لە بچووکترین مەخلوقەکانی خودا کەچی دەکات کە لەبەر بچووکیەکەی بەچاو نابینرێت، مەلایین دانەی لە دڵۆپێک ئاودا دەژی، یەک مەخلوق لە لاوازترین مەخلوقەکان مرۆڤ دەڕوخێنێت، هەموو بیرکردنەوەکان لەسەری دەفرێنێت و هەتا بە کەچی و بێ باری دەگەڕێتەوە....چیت دەکرد ئەگەر خودا تووشی سزایەکی بکردیتایە؟ چەندێ گەمژە و لە خۆباییت!

* * *

بەیانیم کردەوە و بیرکردنەوەکانی دوێنێم لەبیرکردبوو بەڵکوو هەموو دوێنێم لە بیرکردبوو، هەستم بە دووری دەکرد لە دونیا کە هۆگری بووبوم و خۆشمدەویست. جارێکیان چووین بۆ ناخی دوورگەی عەرەب، حەفدە ڕۆژ لە ناو تۆز و خۆڵە سامناکەکەیدا بووین و لەو دیووی سنوری جیهانەوە ڕێمان دەکرد لەگەڵ وەحش و خۆر و تونێتی و مردندا، هەستم نەکرد لە دونیا دوورم و هێندەی ئەم نەخۆشییە کورتەم تووش نەبوو....بەبێ ڕابردوو و داهاتوو و ئێستا مامەوە تەنها ئەم ئێستا نارەحەتە بە ئازارە نەبێت کە لە سکمدا جێگیربووە (ئینتیهاب)، لە کەلەکەمدا ڕمڵی گورچیلەم هەیە،

نەخۆشی و دژیەکەکان تێمدا کۆبوونەتەوە، ئینتیهاب تەنها کیسێکی سەهۆڵ دایدەمرکێنێتەوە، ڕملی گورچیلەش تەنها ئاوی گەرم چاری دەکات، دەرمانی ئەم بکەم ئەو زیاد دەکات، ئەگەر ئەو چارەکەم ئەم کەم دەکات!

•••

نەخۆشی هەموو شتێکی لەبیربردمەوە، تەنانەت بیرم نایەت ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕێم کردووە و خواردوومە و خواردوومەتەوە و خوێندوومەتەوە و نووسیمە و جۆرەکانی وەرزشم تاقیکردۆتەوە، بیرم نایەت من توانیمە بیر لە هەزارەها بابەت بکەمەوە و سەدەها کار چارەبکەم، دونیا لە چاومدا مرد و ئەم ئازارە بۆتە هەموو دونیام، ئەندێشەم لەلاکانیەوە بەردەدا لێی دەردەنەچوو و تێیدا نەدەگەڕا، خەیاڵی خراپترین جۆرەکانی نەخۆشی و جۆرەها جۆرەکانی مەترسیم دەکرد، پاشان دەچوو بەرەو ئەو کردارەی کە دکتۆرەکان جەختیان کردبووەوە لەسەری، هەر کە دەچێتە وێناکردنیەوە ژیان لە چاومدا ڕەش دەبێت و هەمووی بە شەڕ و ئازار دەبینم، ئاوات دەخوازم باوکم لەسەر مەزهەبی مەعریی بوایە یان دایکم منی نەبوایە.... شەیتان وەسوەسەم بۆ درووست دەکات باوکت چ مافێکی هەبوو وا تۆی هێناوەتە دونیاوە؟ ئایا ژیانت تەنها پەیوەندی بە خۆتەوە نییە؟ ڕاوێژی پێکردیت، یان قوربانیداوە بە خۆت و ئازادی و ئاسوودەیت لە پێناو چێژی خۆیدا، یان هەر بیری لێنەکردوویتەوە و بە خەیاڵیشدا

نەهاتووە؟.....دەبینم شەیتان دەیەوێت لەسەرووی نەخۆشی جەستەوە نەخۆشی دینیشم بۆ زیادبکات، نەفرەت لە شەیتان دەکەم و بەوەشی کە پێیەتی، ئەوەی شەیتان پێیەتی ناوی هونەر و داهێنان و نوێبوونەوەی لێدەنێن، لێ هەر هونەری شەیتانە......

واز لەمە دەهێنم و بە ئەندێشەمەوە دەگەڕێمەوە بۆ سەر ئەو قەرەوێڵەی کە بەڕێوەبەرەکە هێنامی بۆی و ڕادەستی پەرستارەکانی کردم، دوو خوێندکار بە دیارمەوە بوون و چوون دکتۆر بانگ بکەن، هەستام ئازارەکانم هەڵگرت و خەباتم کرد بۆ ئازادیم هەتا بەپێی پەتی گەیشتمە سەر شەقامەکە، یەکەم ترۆمبێل هات سەری کەوتم بەرەو کۆلێژ، خودا ڕزگاری کردم لە نەشتەرگەری و دکتۆرەکان! دکتۆرەکان (تکایە لێم مەگرن) کۆمەڵێکن لە هەست و سۆز بەریبوون و لە میهرەبانی دابڕاوون، سکی خەڵکی لەت دەکەن و گەدەی دەردەکەن و دەیکەنە تەشتێکەوە...جمجمەی مرۆڤەکان دەشکێنن و بە مێشکیدا دەگەڕێن، کار گەلێک ئەنجام دەدەن ئەگەر جگە لەوان ئەنجامی بدات پۆلیس پێی دەگات و دادوەرەکان ڕێزیی بۆی دەگرن و دەرگای زیندانیەکانی بۆ دەکرێتەوە و پەتی سێدارەی بۆ ئامادە دەکرێت! پاشان شانازی دەکەن بەوەی هاوڕێی مرۆڤایەتین.....ئەرێ سکی خۆمیان بدەمێ بۆ ئەوەی لەتی بکەن و بە نەخۆشی بگەڕێمەوە کە پێشتر لەشساغ بووم و پەلە بکەم

لەوەی خۆم نەخۆش بخەم؟ پەنادەگرم بە خودا لەوەی کە لە نەزانەکان بم!

* * *

لە کاتی نەخۆشییەکەمدا هیچ شتێک نەیدەتۆقانم هێندەی تاریکی شەو و درێژییەکەی؛ زۆر لێی دەترسام و خولەک و چرکەم دەژمار بۆ هاتنی، چاوەڕێیم دەکرد وەک چۆن ئەو کەسەی چاوەڕێی جێبەجێ کردنی بڕیاریی لە سێدارەدانی دەکات، چونکە نەمدەتوانی بخەوم و دابنیشم، تەنها دەمتوانی لەسەر پشت بکەوم و شەو و ڕۆژ تەماشای بنمیچەکە بکەم.....هەر پەڵەیەکی ڕەشم تێیدا بەدی دەکرد وامدەزانی مارێکەوە و دەیەوێت پێمەوە بدات یان جاڵجاڵۆکەیەکی گەورەیە و نەوەدونۆ قاچ و دە سەری هەیە، یان کۆمەڵێ دوپشک یان عفریتێکە لە پەرییەکان یان پەرییەکە لە عفریتەکان، لە ترسا هاوار دەکەم و وڕێنە دەکەم وەک وڕێنەی ئەو کەسەی پلەی گەرمی لەشی چل پلەیە!

ئێستا پێدەکەنم و یاومە لە قاقای پێکەنین کە ئەو وڕێنانەم بۆ دەگێڕنەوە کە گوێ بیستی بوون لێمەوە، وێنەیەکی ڕوون دەبینم هی زۆرێک لەوانەی دەیخوێنمەوە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا کە خاوەنەکەی بڵاوی دەکاتەوە بە حساب ئەدەبە و خەڵکی دەیخوێننەوە بە حسابی زۆربڵێی و وڕێنە!

ئەو کاتەی نەخۆشبووم خۆشەویسترین شت لەلام ئەوەبوو خەڵکی لە دەوورم کۆببنەوە، پاشان لەبارەی جۆرەها بابەتەوە بدوێن بۆ ئەوەی لە تەنیاییەکەم ڕزگارم بێت و دڵنەواییەکم بۆ بێت لە ئازارەکەم و لایەنێکی ژیانم بەبیربێنەوە... لێ گوێم لە دەنگیان دەبوو وەک ئەوەی لەناو بیرێکی پەڕاگەندەوە بێت یان لە قوڵایی ئەشکەوتێکی دوورە بێت، لە نێوان تاریکیەکی چڕەوە دەمبینین دەنگ و ڕەنگیانم بۆ جیانەدەکرایەوە، هەر بەزوویی لێیان بێزاردەبووم و داوای نوێم دەکرد. ڕۆژەکانم لێکدەچوون حەزم دەکرد هەموو چرکەیەک شتێکی نوێ بلۆزمەوە.

بێ توانا و بێ ئیرادەبووم و توانای ڕێکردنم نەبوو، نەمدەتوانی بڕیار بدەم بەسەر ئاوەزمدا، هیچ شتێکی زیندووم تێدا نەمابوو جگە لە زارم....هەموو ئەمانە لەبەرئەوەی بەکتریایەکی بچووک چۆتە جەستەمەوە؟! ئای لە بێهێزی ئەم مەردوومە بەهێزە!

***

لەم نەخۆشییەدا ئازارم چەشت وەلێ فێربووم؛ وانەیەکی نوێ لە ژیاندا فێربووم(ژیان چییە جگە لەوانەکانی نەبێت...) ئەویش ئەوەبوو نەخۆشی نیعمەتە نەک نیقمەت، پێویستە بۆ ئەو کەسەی بەهای لەشساغی و واتای ژیان نازانێت و ناگەڕێتەوە بۆ دەروونی

هەتا نەخۆش نەکەوێت، تا لێرەدا واتای ئەو شتانە دەزانێت کە لە کاتی لەشساغیدا بەخێرایی بەسەریدا دەڕوات چونکە سەرقاڵە بەو شتە پووچ و بچوکانەی کە کۆتاییان نایەت. نەخۆش -پێش چێژی لەشساغی- دوو چێژی بۆ هەیە، چێژی ئەم هاوسۆزییەی دەوری دەدات و ئەو خۆشەویستییەی تێیدا نقووم دەبێت....هەرگیز هاوسۆزی سەرۆکی کۆلیژ و جێگرەکەی و خوێندکارەکانی لەبیرناکەم، ئازارەکانم لە بیردەچێتەوە کە وێنای ئەو دووخوێندکارە دەکەم کە هەموو شەوەکە لە پەنامدا بوون، هەر کات دەموت ئاهـ یان ئەم دیوو دیووم دەکرد لەبەردەممدا بوون، منیان پێش بنەماڵەکەیان خستبوو، ئارامی منیان خستبووە پێش ئارامی خۆیانەوە، هاوسۆزی براکانم و بنەماڵەکەم باس ناکەم.

چێژەکەی تر، ئەو چێژە گەورەیەی ئەو ساتە دەستی دەکەوێت کە پەنا دەبات بۆ خودا دەبات و بە دڵسۆزی و ناچارییەوە داوای لێدەکات. ئەگەر پێشتر باسی نەخۆشێکیان بۆ بکردمایە لەو نەخۆشییەی ئێستای منی هەبوایە دەسم دەکردە شیوەن کردن بۆی و دەترسام لەوەی کە تێیدایە، کە نەخۆش کەوتم نە ترسام، سات گەلێکم بەسەرمدا تێدەپەڕی زۆر ناڕەحەتی دەکردم، لە شەواندا دەگەشتمە لوتکەی ئازار، لێ ساتانێک بەسەرمدا تێدەپەڕی بە تەواوی ڕازیبووم، دەگەڕامەوە بۆ لای پەروەردگارم، ئەم دۆخەی ئێستام وەک تاقیکردنەوەیەک دەبینی بۆ خۆڕاگرییەکەم و

نیعمەتێکە لەلای خوداوە و پاداشتم زیاد دەکات، دڵنیادەبووم و دەگەیشتمە سەرووی دڵنیابوونەوە...بۆ جۆرێک لە چێژی پاڵفتە کە لە کاتی لەشساغیدا هەستم پێی نەدەکرد، بۆ جۆرێک لە چالاکی دڵم هەرگیز لە کاتی لەشساغیدا نەمدەزانی. وادەزانم ئەگەر تووشی خراپترین و توندترین نەخۆشی ببم، دەتوانم بەم شێوەیە ڕازی ببم و هەست بەم دڵنیاییە بکەم و تەنها چێژی لێ دەبینیم!

ئەمە دۆخی من بوو زیادەڕەوی تێدا ناکەم و خەیاڵ ناکەم، تکام وایە خوێنەران بەڕاستم بزانن. ئەمە یەکێکە لە نیعمەتە شاراوەکان بەسەر مرۆڤەوە ڕووکەشێکە لەو ڕووکەشە بەهێزە سامناکەی پێی بەخشراوە، مرۆڤ ڕوکەشانە بڕیار نەدات بەسەر کەسی نەخۆش یان کەسی بێ ئومێد، گومان بکات لە دادپەروەری و میهرەبانی خودا، لێ با بچێتەوە ناوەوە، لەوەیە لە پشتی ئەم دیوارە وێرانەوە کۆشکێکی ئاوەدان هەبێت، لەوەیە لە پشتی دەرگایەکەی گەورەوە کوخێکی وێران هەبێت، لەوەیە لەناو ئەم پۆشاکە کۆنە و ئەم جەستە لاوازە دەروونێکی گەشاوەی ئاسوودە و مرۆڤێکی کامڵ بوونی هەبێت.

لە نەخۆشییەوە زانیم یەکسانی تەواو سوننەتی پەروەردگارە لە ژیاندا. تەماشای نەخۆشی بکەن: زەنگین و هەژار دەناسێت؟ پاشایەکی زۆرداری خاوەنی کۆشک و پاسەوان؟ دەرگا و

پاسەوانەکانی دەتوانن ڕێگری لە چوونە ژوورەوەی ئەم مەخلووقە بچووکە بگرن؟ دەرگا و پەنجەرەکان دابخە و نەفسەرەکان بکە حاڵەتی ئامادەباشیەوە و لە سندووقێکی داخراودا بژی....دێتە ژوورەوە لەگەڵ ئەو هەوایەی هەڵیدەمژێت و ئەو ئاوەی دەیخواتەوە و ئەو خواردنەی دەیخوات، جەستەت داگیردەکات و لە چاو و دەمتدا دەژی و لە خوێنتدا مەلە دەکات!

خۆت بەگەورە بزانە بەسەر هەژار و داماواکاندا، نەخۆشی دەتگەڕێنێتەوە بۆ ڕیزەکانیان، ئازار دەچێژیت وەک ئەوان، هاواردەکەین وەک هاواری ئەوان. هەرچی لە ژیاندا هەیە یەکسانی دەکات لە نێوانتاندا. ئەرێ زەنگین هەوایەکی بۆندار هەڵدەمژێت و کەسی هەژاریش هەوایەکی بێ بۆن، یان هەوا کە هۆکاری ژیانە بۆ تۆ و بۆ ئەویشە، هەردووکتان یەکسانن تێیدا؟ ئایا تۆ ئاوێکی شیرین و هەنگویناو دەخۆیتەوە و کەسی هەژار ئاوێکی تاڵ و سوێراو دەخواتەوە؟ ئاو و هەوا و مانگ و خۆر و لەشساغی و نەخۆشی و بوون و مردن....هەموو ئەمانە دیڕ گەلێکن خودا لەسەر پەڕەی ژیان کێشاویەتی و مرۆڤەکان تێیدا یەکسانن. ئەرێ بیستوتانە منداڵەکانی پاشا کە لە دایک دەبن ئاوریشمیان لەبەردا بێت، بە پێیەکانی خۆی بچێت بۆ جێگاکەی و خۆی وتاری لە دایکبوونەکەی بدات و لە پەنجەرەکەوە تەماشای گەلەکەی بکات، منداڵی کەسێکی بازاڕیش بە ناگۆیی و ڕووتیەوە بێتە بوون؟ بڕۆن

ئەو گلکۆ مەزنەی کە گەچکاری کراوە هەڵبدەنەوە و ئەو بت و پەیکەر و نووسین و نەخشانەی سەری لابدەن، ئەری ئێسقانێک دەبینن میسکاوی بێت لەبەرئەوەی حەریر و ئاوریشمی پۆشیووە؟

لە نەخۆشییەوە ئەمانە فێربووم!

لەدوای هەموو ئەمانەوە، قسەکانم درێژەی کێشا و کاتی خواردن هات، پێویستە ئەم قسانە بوەستێنم! سوپاسی خودا دەکەم لەسەر لەشساغی و نەخۆشی، سوپاسگوزاریم لە هەموو دۆخێکدا.



# لە فێرکردنەوە بۆ دادوەری

لە ساڵی ١٩٤١دا بڵاوکراوەتەوە

زۆرێک لەبراکان لێم دەپرسن: دادوەری چۆن دەبینیت؟ دادوەری بۆ من حەوانەی جەستە و ماندوویەتی فیکرە، پلەی بەرز و کەمی پارەیە، دەسکەوتنی زانست و زۆرکردنی دووژمنەکانە، بارێکی گەورەیە داوا لە خودا دەکەین لە خراپی عاقیبەتەکەی بمان پارێزێت.

سەبارەت بەوەی((حەوانەوەی جەستە))یە، ئەوەیە من لە کاتی مامۆستاییدا قسەم دەکرد و گوێم نەدەگرت، ئێستا زیاتر گوێ دەگرم لەوەی قسەبکەم. نەمدەتوانی بێدەنگ بم چونکە گەر بێدەنگ بومایە عەفاریتەکان قسەیان دەکرد(مەبەستم خوێندکارەکانە)، هەندێ جار ئەگەر قورگم ژانی بکردایە، پاشان نەمدەتوانی بۆ یەك خولەک بێدەنگ بم لەبەر ئەوەی نەبادا سەرێکی بەنەکە لە دەستم دەرچێت و گرێکە بکرێتەوە و سیستەمەکە بەتاڵ بێتەوە. ڕۆژانە پێنج بۆ شەش وانەم هەبوو لە کاتی وانە وتنەوەدا دانەدەنیشتم، نەوەک شەیتان بێ ئاگاییەکم لێ

ببینێت و لە کۆتاییی پۆلەکەدا پژمەیەک بکات و لە نێو پۆلدا ڕووداوێک بخولقێنێت، ئای ڕووداوەکانیان چەندێ زۆرە! بچوکترینیان وەک حەمامی ژنان وایە و ئاوی لێبڕابێت. پاشان کە لە پۆل دەردەچووم بۆ ئەوەی لە نێوان دوو وانەکەدا پشوویەک وەربگرم کۆمەڵێ خوێندکار دەگەیشتنە سەرم و پرسیارییان لێدەکردم، دەوەستام لە تەکیاندا هەتا ئیسرافیلی قوتابخانە فوو دەکردەوە بەشەیپورەکەیدا و خوێندکار و مامۆستاکان کۆدەکرانەوە بۆ ئاگری کارکردن. سەرەتای ڕۆژم دەگەیاند بە کۆتاییەکەی و هەر لەسەر پێیەکانم دەبووم و زارم لە جوڵە نەدەکەوت...ئێستا هیچ کارێکم نییە ئەوە نەبێت لەسەر کورسی دابنیشم و، وشە لە دوای وشە بڵێم و گوێ لە کۆمەڵێک وشە بگرم کە هیچ بابەتێکی نییە یان هیچ شوێنێکی نییە، یان نووسینی بڕیارەکان، سوپاس بۆ خودا کاتبەکە لە هەموو کارێکی تر پاراستوومی. لەم حەوانەوەدا تەنها لە قورسبوونی زارم دەترسم لەم بێدەنگییە زۆرەدا دواتر وەک جاران نەیەتە گۆ، ئەگەرچی ئەمە نیعمەتێکە ئاواتەخوازییم، زارم سەرچاوەی ئازارەکانمە و باشترە بۆم قورس بێت یان لە کاربکەوێت!

سەبارەت بە(ماندووبوونی دەروونم) چونکە مافی خەڵکی لەسەرشانمە و بڕیار لەسەر کەسایەتییان دەدەم، ئەمەش بۆ کەسانی نەجیب بە بەهاتر و بەنرخترە لە پارە و سامان، هەڵبسم ودابنیشم بیر لەم دۆسیە و ئەو سکاڵایە دەکەمەوە، نەک بەهۆی قورسی یان



نالۆزییەکەی، ڕێگای یاسا دیارە بۆ ئەو کەسەی گەورەترین خەمی یاسایەوە و دینی پەرستنی وشەکانییەتی، بەڵکوو لە ڕێی بیرکردنەوە دەگەمە مەبەستی یاساکان، ئەویش بەرپابوونی دادپەروەرییە. بیردەکەمەوە بۆ ئەوەی ڕاست و باتڵ جودابکەمەوە، پۆشاکی ڕیایی لەبەری ئەو کەسانە لادەبەم کە خۆیان کردووە بە قازی بۆ ئەوەی هەقیقەتە ڕووتەکەیان دەربکەوێت، ئەمەش کارێکی سادە و ساکار نییە. ئەگەر من لە ساتی یەکلای کەرەوەدا گەیشتووم بەوەی کە بە بوونی شایەتەکانیش نازانرێت ئەمە لە فەزڵی خوداوەیە، وەلێ بەردەوام نابێت، پێویستە بگەڕێیتەوە بۆ لای شایەتەکان کە قازی دەزانێت شایەتی درۆیە و کەسانی فاسقن، عەدالەتیان نییە و شایەتیان وەرناگیرێت و هەموو هاوڕێ بەڵگەکان بە درۆی دەخەنەوە[٢٦]. هاوڕێ بەڵگە و نیشانەکان لە هۆکاری بڕیاردانن (وەک چۆن ئیبنولقەیم لە کتێبە بەنرخەکەیدا (الطرق الحكمية) ڕوونی کردۆتەوە)، بەڵام هیچ ڕێگایەک نییە بۆ گرتنی جگە لەوەی وەزارەتی داد لە دیمەشق تەماشای ئەو پێشنیارە بکەن کە بۆم بەرزکردوونەتەوە لەم بابەتەدا و بیکەنە بنچینەیەک بۆ چاکسازییەکی گشتی، هەتا خەڵکی ڕزگارییان بێت لە شایەتە درۆزنەکان، کە ئێستا کۆمەڵە و پلە و کرێی بەرزییان هەیە و کەسانێکیان تێچووە ئەوەی لێی بڕوانێت وادەزانێت لە ئەولیا و زاناکانە! ئەم شەڕە بڵاوبۆتەوە و خەڵکی هەواڵەکەی دەزانن و

---

[٢٦] لە دوای ئەم نووسینەوە یاسایەک دەرچوو مافی ئەوەی دەدا بە قازی کە شایەتی وەربگرێت یان ڕەتی بکاتەوە.

زیانەکەیان بەرکەوتووە، چۆن دەروونی ئەو کەسە ئاسوودە دەبێت کە زاڵ دەبێت بەسەر گومانەکەیدا یان دەزانێت ڕوونکردنەوەکە ناڕاستە و پاشان ناچار دەبێت بڕیاری لەسەر بدات؟

خودا ڕزگاری کردم-بەهۆی توندیم لەڕەوشت و لەحەقدا- لە نارەحەتیەکانی دادوەری، لە واستە و دیاری و ڕەشوە و دەعوەت کردن.....سەلامەتی کردم لە هەموو ئەمانە، من لە هەقدا نەرمی و موجامەلە و شەرم و جیاوازی نازانم، ئاواتەخوازم ئەمەم بەردەوام بێت.

سەبارەت بە(( پلە بەرزی)) چونکە ناوی قازی - بەبێ حاکمی مەدەنی گەرچی پلەکەی بەرزبێت و کارەکەی زۆربێت- لە گوێیەکاندا دەنگێکی گەورەی هەیە و لە دڵەکاندا وێنەیەکی مەزنی هەیە، هەیبەت و شکۆی هەیە، ئەم هەیبەت و شکۆمەندییە ئەو پاڵەوانانەی گەردوونی دادپەروەری کردوویانەتە بەری، تاکەکانی سەردەم و زەمانە کە مافی خۆمانە پەری و مرۆڤەکان شانازی پێوەبکەین، گەر دەستمان کرد بە هەژمارکردنی شانازییەکانمان پێویستە یەکەمین پەنجەمان بۆ دادوەری بێت( ئێستاش دادوەری شانازی یەکەمی هەموو گەلێکە)؛ قازییە یەکەمینەکانمان شورەیح و ئیاس و شورەیک و ئەبو یوسف و عیزی کوڕی عەبدولسەلام و مونزیری کوڕی سەعید، لەوانەی ئێستا باسم



کردن و ئەوانەی باسم نەکردن لەوانەی بژاردنیان کەمە و حەسر کردنیان قورسە.

ئەگەر ئێستا سەرقاڵی نووسینی سیمینارێکی تەواو نەبومایە لەم بارەیەوە و ڕێگەیان بدامایە بە بڵاوکردنەوەی پێش بڵاوکردنەوەی بە خوێندنەوەی ئێستا بە تەواوەتی قسەم لەسەری دەکرد، بیسەریش بەتامەزرۆییەوە گوێ بۆ ڕادەدێرا. هەربۆیە خەڵکی ئاوی قازی بە گەورە دەزانن چونکە ئەمانە و هاوشێوەکانیان بیردەکەوێتەوە، سەردەمێکیان بیردەکەوێتەوە ڕەحمەتی خودا لەو سەردەمە، لە هەموو ناکۆکییەکدا قازی بە شەرعی خودا بڕیاری دەدا، موسڵمانەکان پشتیان لە گەوهەر و مروارییەکەیان نەدەکرد بۆ ئەو تەنەکەی لە دەستی پیسکەکاندایە چونکە جگە لەوەی نییە، شەریعەتی دادپەروەرترینی دادپەروەرەکانیان جێ نەدەهێڵا بۆ شەریعەتی کەسێک لە ناو و گڵە، سەرقاڵی زاناکانیان گەڕانبوو بە دوای چاک و خراپدا، ئایا شەرعین یان عەقڵین زۆر قسە هەیە لەم بارەیەوە، کە گەیشتین بەم ڕۆژە ئەو ناکۆکیە نەما و تەبایی جێگەی گرتەوە، کەسانی سەردەمی خۆمان لە پێگەشتووەکان و گەنجەکان وتیان باشە ئەوەیە کە ئەوانە.... بە باشی بزانن خراپەش ئەوەیە ئەوان بە خراپی دەزانن، هەموومان پێی ڕازی بووین و ئەمەش دەرئەنجامەکەیەتی کە پێی گەیشتووین و لەسەری وەستاوین،

موناقەشە و وتی نەماوە، خودای گەورە باوەڕدارانی لە کوشتار پاراستووە، سوپاس بۆ خودا لە(هەموو)دۆخێکدا!

سەبارەت بە(پارە کەمی) چونکە پارەی قازی شەرعی لە شارەکەماندا زۆر زۆر کەمە، کەمتر لە حاکمە مەدەنییەکان، لە کاتێکدا مەرجە لیسانست هەبێت لە مافدا، لە تاقیکردنەوەی وەرگرتندا سەرکەوتوبێت و، ماوەیەک لە بواری پارێزەریدا کارت کردبێت....ئەم قسانە هی شوێنێکی ترن.

سەبارەت بە((دەسکەوتنی زانست)) ئەمە تاکە نیعمەتە لە نێوان کۆمەڵە نیقمەتەکانی دادوەریدا، لە دوای نیعمەتی پاداشتەوە ئەگەر خودا بۆ کەمتەرخەمێکی وەک من بینووسێت، شایەنی نییە بە کردەوەکەی و نیەتی بۆ پاکنەکردۆتەوە و هێشتا لە خۆشەویستی ناوبانگ و پلە دەرنەچووە، گەرچی حەزەکەی لاوازبووە و بەلایەوە هیچە! خوێندنەوە نیعمەتێکی ئەم پیشەیەیە، لە کاتی مامۆستایەکەمدا بەردەوام دەمخوێندەوە، بەڵکوو بە خەیاڵمدا نایەت لەوکاتەوەی فامم کردۆتەوە ڕۆژێک بەسەرمدا تێپەڕی بێت هەتا ئەمرۆ هیچم تێدا نەخوێندبێتەوە، لێ سوودم لە دادوەری بینیووە بەوەی شادوومانم بە کتێبی فیقهی و چێژی لێوەردەگرم وەک چۆن چێژم لە کتێبی ئەدەبی وەردەگرت یان نزیک لە ئەو. کۆمەڵێ کتێبی باشیم لەلایە ئەگەر بەردەوامبم لە خوێندنەوەیان ئومێدم وایە

ببم بە یەکێک لە خوێنەوارەکانی ئەم زانستە، ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە دەخوێنمەوە و شەرم ناکەم و، خۆم بەگەورە نازانم لەوەی پرسیار بکەم لەو شتانە کە نایزانم، چونکە یادگەیەکم هەیە دەقەکان وەرناگریت بە وشە و ژمارە و بەیتەکانیەوە، وەلێ لە ئەزبەرکردنی بابەتەکان و شوێنەکانیان لە سەرسوڕهێنەرەکانم. بیرم نایەت بابەتێکم خوێندبێتەوە و لە بیرم کردبێت، کەسێکم ناسی بێت و هاوڕێیەتیم کردبێت بۆ ماوەیەکی زۆر ئینجا ناوەکەیم ئەزبەرکردووە، پاش دابڕان ناوەکەی لە بیردەکەم وەلێ هەرگیز شێوەی کەسەکان لەبیرناکەم گەرچی یەکجاریش بینیبێتم، هۆکاری ئەمەش نازانم.

سەبارەت بە(( زۆرکردنی دوژمنەکانم)) دادوەرێکی دادپەروەر و کارکەر لە پێناوی گەڕانەوەی ماف بۆ خاوەن ماف و فەرمانبەری پاکی ڕاوەستاو، شتێکی دیاری بەدیهیە و پێویست بەڕوونکردنەوە ناکات. لە ئەبو زەڕییان گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی:قسەی ڕاست هاوڕێی بۆ نەهێشتوومەتەوە! ئەمەش لە سەردەمی هاوەڵاندا بووە لە باشترین چەرخدا، ئەی لە سەردەمی ئێمەدا؟ قازی چ بڵێت کە هەر دۆسییەک دێتە بەردەستی ئیللا دووکەسی تێدایە ئەبێ بڕیاربدات بەسەر یەکێکیاندا، ئەوەی بڕیاری بەسەرا دراوە دەبێتە دوژمنی دادوەرەکە، مەگەر دانسقەی دانسقە لە خەڵکیدا کە ڕازی بن بە هەق، ئەگەرچی بەسەر خۆشیدا بێت. گەورەترین موسیبەت ئەوەیە کەسی باتڵ و بڕیاربەسەردراو یان ئەوکەسەی تکای کردووە و

تکاکەی ڕەتکراوەتەوە لە نێو هۆزەکەیدا گەورەبێت و قسە ڕۆشتوویێت لە شارەکەیدا، ئەگەر پەیوەستی بکەیت بەو شتەی شەرع پەیوەستی دەکات، گەل و حوکوومەت لێت هەڵدەسن و بوختانت بۆ دەکەن، بەڕێوەبەرەکەت بۆچوونی خراپ دەبێت بەرانبەرت و ئازارت دەدەن و زیانت پێدەگەیەنن و بەرزکردنەوەت دوادەخەن. ئەوەی لە خاوەن دەستەڵاتەکان ڕوونە فەرمانبەری چاک ئەو کەسەیە کە کەس لێی زویر نابێت و کێشە نانێتەوە، ئەمەش بۆ دادوەری دادپەروەر و فەرمانبەری پاک دەست نادات، بەڵکوو بۆ مرۆڤێکی دەغەڵ دەس دەدات کە لە گیرفانیدا هەزار ڕوو هەیە، هەر ڕوویەکی سەد زاری هەیە، ڕووبەڕووی هەمووان دەبێتەوە بەو ڕووەی پێیان خۆشە و بەو زمانە گفتوگۆیان لەگەڵ دەکات کە ڕازییان دەکات.

پوختەی قسان لەوەی دادوەری (بارێکی قورس) و (خەمێکی درێژە)، ئەگەر خودا بێ پێویستی بکردمایە لێی و بۆم بنوسرایە کە بە پێنووس و نوسینەکانم بژیم، یان پلەی ئەهلی وەرعم پێببەخشرایە، نە دەهاتم بۆلای و پێشم نەدەخست بەسەر فێرکردندا؛ ئەوە سەلامەتترە. بەڵام تێی کەوتم، خوداش لە سەرووی توانای خۆمانەوە داوای لێنەکردووین. هەموو توانای خۆم و ئەو پەڕی کۆششم دەکەم کە بڕیار نەدەم لە دۆسیەیەکدا کە حوکمی شەرعی تێدا نازانم، بە قەستی نەچم بەلای لادان و ستەم کردندا و مەیلم بەلای هیچ



لایەنێکدا نەبێت، حەزی هاوڕێ و ترسی خاوەن دەسەلات لە حەق نەمگەڕێنێتەوە. سەبارەت بە هەڵە ناتوانم دووری بخەمەوە بە بە ئاگابوون نەبێت، سەبارەت بە نەزانین توانام نییە لەتەکیدا ئیللا بە فێربوون و پرسیارکردن نەبێت.

ڕاڤەی فەرموودەی دادوەرێک و دوو دادوەر بەوە کراوە: ئەو دوو دادوەرەی دەچنە ئاگرەوە دانەیەکیان بە ستەم بڕیار دەدات، ئەوی تریان بە نەزانین. داوا لە خودا دەکەین ئێمە و هەموو ئەوانەی هەقیان خۆشدەوێت، سەرکەوتوومان بکات لەوەی شوێنی حەق بکەوین، ئەوەمان فێربکات بە سوودە بۆمان و ئەوەی دەیزانین کاری پێ بکەین و زانیمان فرە بکات.

• • •



# من و پێنووس

له ساڵی ١٩٤٠دا بڵاوكراوەتەوە

ئێستا چەندین پەیامم لەبەردەستم دایە، لە بەیروت و حیمس و بەغداد و ئەسکەندەرییە و ئوم دەرمانەوە، لەلایەن برا بەڕێزەکانمەوە گەشتووە بەدەستم و شەرەفمەندم بە پەیوەندی لەگەڵیاندا، هەموویان پرسیاری ئەوەم لێدەکەن بۆچی ئەم ڕۆژانە لە ڕیسالەدا نانووسم، خەمیانە نەهامەتیەکان کۆڵەکەیان ڕووخاندبێتم و ڕمەکەمیان شکاندبم....ئەمەم بۆیان نووسی وەک دیاری و وەڵامێک بۆیان.

دانبەوەدا دەنێم بەهرەکەم وشکبووە یەک دڵۆپەی لێوەنایەت، هزرم ماندووبووە و خەیاڵم مردووە، چەندین ڕۆژ بەسەرمدا تێپەڕین نەمتوانی یەک وشەش بنووسم، وەک ئەوکاتانەم لێهاتووە کە سەرەتای نووسینم بوو، وەهام لێهاتووە وەک ئەوەی هاوەڵی پێنووس و هاوڕێی پەڕە نەبوومە، دەڵێی لە گۆڕەپانی ڕەوانبێژیدا غارغارێنم نەکردووە....نازانم ئایا خودا ڕزگاری کردووم لە پیشەی ئەدەب کە تووشی بوومە و تووشم بووە، یان سەکتەیەکی لە ناکاوە و تەگەرەیەکی کاتییە کە تووشی شاعیر و نووسەرەکان دەبێت، پاشان



ـەکتەکە دەڕوات و زمان ڕەها دەبێت و لە جاران تیژتر دەبێت؟ نازانم هۆکارەکەی ئەم هاوسەرگیرییەیە(وتراوە هاوسەرگیری ئەدیب ئازاری دەدات و کانیاوی بیرکردنەوەکانی وشک دەکات). یان نەهامەتی و ئازارە، ئەوەی ئەدیب دەبات بەرەو لادانی شتەکان لە ڕێگای خۆی، ئەوە پێشدەخات کە پێویستە دوابخرێت و ئەوە دوادەخات کە شایەنی ئەوەیە پێشبخرێت، ونکردنی مافەکان و زاڵکردنی نەزانەکان.....یان دوورکەوتنەوەیەکی هەستی و ڕووحییە بە خۆشی بێت یان ناخۆشی، ژیانمی وەک ئەستێلێکی مەنگ خواردوو لێکردووە و بەردێکی تێناکەوێت لیتاوەکەی بجوڵێنێت و گەوهەرەکانی بەدیاربخات؟

هەرکات پێنووس دەگرمە دەستم بۆ ئەوەی بنووسم هەستدەکەم لاساریی دەکات و جڵەوییم بە دەست نییە، یاخییە لێم و خۆیدەپارێزێت لێم، دەمبینی حەزم بەلای خوێندنەوەی کتێب و تەماشاکردنی ڕۆژنامەیە، ڕوومدەکردە خوێندنەوە و حەقی ئەوەم دەکردەوە ماوەیەکی زۆرە لەدەستمچووە، هەتا ئێستاش پێویستم بە فێربوونی زۆرێک لەوشتانەیە کە نایانزانم، ئێستاش هەندێ کتێب هەیە بە دوومانگ یان سێ مانگیش توانام بە سەریدا ناشکێت. وەک ئەوکەسە نالێم کە گومانی وایە دیوانی فەرەزدەقی لە پازدە ڕۆژدا خوێندووەتەوە، سوێند بە خودا بە یەک مانگ لە یەک هۆنراوەی تێناگات.....وەک ئەو کەسەش نا کە گومانی وایە هەموو

شتێک فێربووە تەنانەت پرسیار لە یەک کەسیش ناکات هەتا زانیاری زیاتربکات! خوێندنەوە بەرەو زوهدی نووسینی بردم، زوهدیش بەرەو داواکردنی سەلامەتی و خۆشەویستی تەمەڵی لە دوای حەزکردن لە باسکردن، پاکوینگەری بۆ ئەوزاتەی دڵەکانی لە ژێردەستدایە!

هاوارم بوو لە دەستی غەریبایەتی و نارەحەت دەبووم پێی، ئێستا هاوارمە بۆ لە دەستدانی، ئای غەریبایەتی چەندی چاکە، وروژێنەری هەستەکان و زیندووکەرەوەی هیمەتەکانە. ئازارم دەچەشت تاریفی ئازارەکەمم دەکرد، تامەزرۆ دەبووم و وێنایم دەکرد، شتی نوێم تێیدا دەبینی و لە بارەیەوە دەمنووسی، ئێستا بەبێ ئاگاییەوە بەلای دیمەنەکاندا تێدەپەڕم چونکە ڕاهاتووم لەگەڵیدا و دەیانناسم، نە دڵخۆشدەبم نە خەمبار، ناڵێم ڕازیم یان بێئومێدم.....ئەمەش خراپترین دۆخە کە بەسەر ئەدیبدا تێدەپەڕێت، ئەمە مردنە! لەوەیە کارە ناڕەواکان سەرقاڵیان کردبم و کاتێکی زۆریی لە دەستدابم. ئایا خوێنەرانم سوود وەردەگرن ئەگەر بزانن ماوەی مانگێکە کاری من ئەوەیە لە گەڕەکەکانی دیمەشقدا سووڕدەخۆم لە ڕۆژهەڵاتییەوە بۆ ڕۆژئاوای، لە باکورییەوە بۆ قیبلەی، دەگەڕێم بۆ خانوویەک بچمە ناوی لە جێی خانووەکەی خۆم( لە جادەی پێنجەم)، چونکە گەمژەیی خاوەنەکەی وایلێکردووم ڕقم لە جوانی باڵەکۆنەکەی و خۆشی شوێنەکەی بێت.....مێشکم



بەردەوام لەهەڵچوونداىە و ژینی لێ تاڵ کردووم، بە بۆنەی دە منداڵەوە(خوابیانهێڵێت بۆ دایبابیان) لە قاتی خوارەوەمان، بۆ یەک سات ئارام نابن و لە جوڵەناکەون و بێزارنابن لە گریان یان هاوار یان گۆرانی وتن یان دان لە دەرگا یان پەنجەرە شکاندن.....دڵم دەتەقێت و ئاوەزم وێران دەبێت و هیچ سوودێک لە دەروونم وەرناگرم، سکاڵام برد بۆلای کەسێک پێم پێکەنی و گاڵتەی پێکردم! با خوێنەران تەسەوری ناڕەحەتی و ئازارەکانم بکەن، بریا بەهرەی نووسینم پێنەبەخشرایە، یان بریا وەک پێم بەخشراوە بمزانیایە چۆن سوودی لێوەردەگرم، هیچ شتێک گرانترنییە لەسەر پیاو لەوەی بیەوێت و نەتوانێت یان بتوانێت و نەیەوێت.

با خوێنەران بڕوابکەن ڕۆژێک بەسەرمدا تێپەڕێت و هیچی تێدا نەنووسم یان لە دەروونمدا شتێک ئامادەنەکەم بۆ ئەوەی بینووسم ئەوە ڕۆژێکی نەهامەتییە بۆم نەک نیعمەت، یەکەمین شت کە بیریلێدەکەمەوە - ئەگەر شتێک دڵخۆشبم بکات یان خەمبارم بکات، یان پێی سەرسام بم یان پێم جوان بێت - چۆن وێنای بکەم و وێنەکەی پێشانی خوێنەران بدەم و هەستەکانمیان بۆ بگوازمەوە و ڕازەکانم دابەش بکەم لەگەڵیاندا؛ ئەمە بۆ ناوبانگ و شکۆمەندی ئەدەبی ئەنجام نادەم، بۆ سوود و زیان ئەنجامی نادەم، هێندە بەناوبانگبووم کە دەتوانرێت لەسەری بوەسترێت ئەگەر ناوبانگ گەورەترین مەبەستم بوایە، وەلێ پشتم تێیکرد چونکە هیچ خێرێکم

لێی دەست نەکەوت. پاشان لەم شارەی ئێمەدا لە نێوان پیاو و بەناوبانگ بووندا بە سیفەتی ئەدەب، تەنها ئەوە هەیە بابەتێک یان دووبابەت بنوسێت، ئیدی ئەو و ئەوەی گوێیەکانی پڕکردووە لە ئەدەب و ڕەوانبێژیی نەمر یەکسانن! وەلێ من دەنووسم - خودا دەزانێت- بۆ ئەوەی ئەو بێزاری و ئازارە لە دەروونم دووربخەمەوە کە بەهۆی نەنووسینەوە تووشی دەبم، وەک ئەوەی کاردەکەم بەو حەزەی پاڵنەری هەنگ دەبێت بۆ درووستکردنی هەنگوین و کۆڵەژم بۆ زەهر ڕشتن و هەموو زیندەوەرێک لە زیندەوەرەکان بۆ ئەوشتەی بۆی کەوی کراوە لە سوود یان لە زیان! نازانم باش دەکەم یان خراپ، چ کاتێک چاکە دەبێت و چۆن دێت، هەموو ئەوەی دەیزانم بیرۆکەکەم بە بیرمدا دێت بە بینینێک یان بیستنێک، گەشەدەکات تێیدا هەتا هزرم پڕدەکات و دەستدەگرێت بەسەرمدا ناتوانم دوابکەوم لە نووسینەوەی؛ پێنووس دەگرمە دەستم و خۆی دەست دەکات بە نووسین و خوشکەکانی بە دوای خۆیدا بە کێش دەکات، لە نووسین بەردەوام دەبم هەتا پێنووسەکە خۆی دەوەستێت، پاشان نووسینەکە دەنێرم بۆ گۆڤار یان ڕۆژنامە، ئەگەر خاوبن لە بڵاوکردنەوەی یان فەرامۆشی بکەن تووڕەدەبم، ئەگەر بڵاوی بکەنەوە دڵخۆشدەبم و بە چێژەوە دەیخوێنمەوە، دوای ڕۆژێک دووبارەی دەیخوێنمەوە و نەنگیەکانی دەبینم، دەڵێم: بریا لێرەم کەمکردایە و لەوێم زیادبکردایە، ئەمەم بسڕایەتەوە و ئەوەم جێگیربکردایە.... پاشان ئەمە وام لێناکات جارێکی تر



ئەگەڕێمەوە بۆ سیفەتی خێرایی کردنم. جارێک هەوڵی پوخت کردن و پێداچوونەوەمدا لەبری ئەوەی چاکی بکەم تێکمدا، گەڕامەوە بۆ سرووشتی خۆم، سوپاس بۆ خودا خەڵکیش سەرسامبوون بە نووسینەکانم.

لەبەر کەمی بابەتەکان بێدەنگ نەبووم، بەڵکوو بەهۆی وشکبوونی بەهرەکەمەوە بێدەنگبووم. ئەگەر مەبەستم نووسین بێت دەتوانم لە هەموو شتێکدا بابەتێک بنووسم، بەڵام پێویستی بە هەست و هونەرە، ئەگەر ئەدەبی واقعیی ئەوەبێت هەرچی ڕوویدا بنووسرێتەوە هەموو خەڵکی دەبوونە ئەدیب، بەڵکوو ئەدەبی واقعیی ئەوەیە وێنەیەکی جوان بهێنێت، سروشت ناسکی کردبێت و خەیاڵ ڕەنگی کردبێت و دەستەواژەی ڕاست و دارشتنەوەی ورد جوانیکردبێت. بەڵام ناواش لە واقع دەرنەچێت.

ئەگەر بەهرەکەم هاوکاری بکردمایە لە پەسنی ئەو گەنجەدا بابەتێکم دەنووسی کە لە لیژنەی تاقیکردنەوەدا لەگەڵماندابوو، شێخ بەهجەت بیتاریشمان لەگەڵدابوو، بۆ سەحکردنی وەڵامی خوێندکارەکان، هەرکات (ئیستیعارە) یان (مەجازێکی) دەبینی هێڵێکی بە ژێردا دەهێنا، هەرکات دوو وشەی هاومانای دەبینی لەسەریەوە سەهمێکی دەکێشا، پاشان نمرە نمرە لە خوێندکارەکانی دەشکاند. سەبارەت بەمە گفتوگۆمان لەگەڵی کرد بۆچوونی وابوو

کە لە پاریس فێریببووبوو، ئەو خوێندکارانەشی کە کردبوویان بە مامۆستای خۆیان دەیانوت بۆچوونی ئوێ نکوڵی ئەمە دەکات و بە هەڵەی دەزانێت، بەڵگەی یەکلای کەرەوەی بۆ ئەوەی بۆچوونەکەی ڕاستە ئەوەبوو، بۆچوونی خۆیەتی. بەمەش هەموو ئەوانەی ڕەتکردەوە کە شێخ بۆی ڕوونکردەوە لە شێوازی عەرەب لە قسەکانیاندا و لەوەی ڕەوانبێژەکان بەکاریان هێناوە و لەوەی لە قورئاندا باسکراوە، بەڕێوەبەری قوتابخانەکەش مەیلی بەلای بۆچوونەکەی ئەودا چوو، چونکە ئەنها ئەو لە نێوان ئێمەدا خاوەنی بڕوانامەی عەرەبییە لە.....پاریس!

گەر بەهرەکەم هاوکاری بکردمایە سەرنجم دەنووسی لەسەر تاقیکردنەوەکان و ئەو واستە و تکایانەی تێیدا دەکرێت و چیم تووشبووە تێیدا، چەندین دەموچاوم بینی لە ماڵی خۆماندا کە نەدەبوو تێیدا بێت، ئەگەر پێویستی و تکاکردن نەبوایە......و ئەوەی دێتە ڕێی مامۆستایەکی ڕاستگۆی بەڕێز لە ماندووی و هیلاکی و ئەوەی لەبارەیەوە دەوترێت.... و ئەو جۆرەها فێڵ و غەشەی خوێندکار بەکاریدەهێنێت، ئەگەر ئاشکرات کرد و سزاتدا لەسەری، وادەزانێت ستەمت لێی کردووە و خۆی فەقیردەکات و وەک قوربانییەک خۆی پێشاندەدات، بەمەش خەڵکی لە دژت دەجوڵێنەوە، یان یاخی دەبێت و دەتگرێت، یان جوێنت پێدەدات یان کەسێک دەکات بە وەکیل کە هەڵدەستێت بە واجبەکە!

ئەگەر بەهرەکەم هاوکاری بکردمایە، لەبارەی مێژووی ئەدەبەوە بابەتێکم دەنووسی و، پێشکەشم دەکرد بە دکتۆر فلان هەتا ببینێت لەلای خودا مەحاڵ نییە کە بەهرەی ئەدەب ببەخشێت بەوکەسانەی بڕوانامەی ئەدەبیان نییە.....و، بڕوانامەی بێ زانست هەمیشە باشتر نییە لە زانست بەبێ بڕوانامە!

ئەگەر بەهرەکەم هاوکاری بکردمایە تاریفی ئەو دیمەنەم دەکرد کە دەروون پڕدەکات لە ئازار و دڵەکان دەتەقێنێت بە جەخار، دیمەنی هاوڕێ و مامۆستای لاو (موستەفا شوکری خەسرەو) کاتی هاوسەرگیرییەکەی ئەمڕۆبوو، تەندرووست بوو، لێ ئەمڕۆ تەرمەکەیی برا بۆ گۆڕستان و بەتانی هاوسەرگیرییەکەی پێوە پێچرابوو، خێزانی کە چاوەڕێی ئاهەنگ بوو، مردنی موستەفای بینی.

کەسی ئەدیب وێڵە بەدوای ئەمجۆرە بابەتانەدا، بەدوای ساتەکانی گەشانەوە و پرشنگدانەوەدا وێڵە، کە هەست دەکات لە خودی خۆی دەرچووە و ڕووحێکی تر چۆتە ناوی، دەیفڕێنێت بەرەو مەلەئی ئەعلا، شتانێک دەبینێت کە چاو نایبینێت و زوبانی مرۆڤەکان ناتوانن تاریفی بکەن، بەڵکوو بە ئاماژەکردن و کۆد وێنادەکرێت و، خوێنەرانی بڵند دەکاتەوە بۆ ئەم جیهانە نورانییە.



***

سەبارەت بە هاوسۆزەکانم کە دەترسن ڕووداوەکان ڕەمەکەم بشکێنێت و کۆڵەکەم وێران بکات، بابزانن من لە ئەماندام، و پەیامی ئەدیب ئەوەیە بەرگری لە حەق بکات و تێبکۆشێت هەتا وشەکەی بەرزدەبێت. تەماشابکەن کامیان لە خەڵکیدا زۆرتر دەروات و بەتاویانگرە: وەرەقەی بڕوانامەیەک کە باسی خاوەنەکەی دەکات، یان گۆڤارێک کە ئەدیب تێیدا دەنوسێت و سەدهەزار کەس دەیخوێننەوە؟ کامیان بەهێزتر و پتەوترە: ئەم پێنووسە وردە یان قاچەکانی ئەو کورسیانەی ئەوانە لەسەری دانیشتوون و خۆیان پێ بەرزدەکەنەوە؟ کامیان تیژتر و ماوەترە: زارێکی پاراو و قسەزان یان زاری توتیەکانی لیسانس و دکتۆرا؟

هەموو ئەدیبێک پەیامێکی هەیە، خودا یارمەتیمان بدات لە گەیاندنی پەیامەکەمان.



# لەبەردەم چلدا

لە ساڵی ١٩٤٨دا بڵاوکراوەتەوە

پێیەکانم لە سوارییەکە هێنایە خوارەوە، هەمی سەفەرم لە مێشکم دەرکرد، فووم لەو شتانە کرد کە چووبە سەر یادگەم، پاشان چووم بۆلای ئەو گەنجینانەی ڕابردوو لە پەرجووی پاڵەوانی و

پێناگات و وەهمەکانیان بڕی پێناکات، هەوڵمدا بۆ ژمارەی نوێی ڕیسالە بنووسم. زۆر نەڕۆیشتم لە بابەتەکەدا هەتا پێنووسەکەم خاوبوویەوە، پاشان کەوت، پاشان وەستا....لە دەروونمدا هەستم بەوتوندییە دەکرد کە ماوەی بیست ساڵە لێمنابێتەوە و هاوڕێمە، بڵێسەکەی حەماسەتم دەکوژێنێتەوە و چالاکیم کۆتدەکات و دەرگای ئیلهامم بەسەردا دادەخات، هەرچی دەنووسم تەنها بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی و بەڕێکردنی کاتە، وەک ئەو کەسەی شەوان ڕێدەکات و نەفسی بە کێش دەکات، هیچ مەبەستێک نایبات و هیچ ئامانجێکیش ڕایناکێشێت.

تەماشام کرد دوومانگی تر چل تەواو دەکەم....چل ساڵی قەمەریی لەگەڵ گەردوون ڕۆشتوومە و لەگەڵ خۆردا

سوورمخواردووە، پێشوازیم لە ساڵەکان کردووە پاشانماڵئاواییم لێیکردووە وەک چۆن پێشوازیم لێیکرد، ئاواتەکانم هاتنە بوون پاشان دفنم کردن، شایی و شینم بینی، دۆستایەتیم کرد و دوژمنایەتیم کرد، چاکم کرد و خراپم کرد، لە هەموو ئەمانە چیم بۆ دەرچوو؟

لەم ماوەی ئەم چل ساڵەدا زیاد لە ڕێگایەکم بڕی، لێ نەمزانی بەرەو کوێ! چواردەهەزار ڕۆژ بەدوای یەکدا ڕێم کرد، نەمزانی بەرەو کوێ دەڕۆم!

هەموو ڕۆژێک لە خەو هەڵدەستم، لەگەڵ خێزانمدا قسەدەکەم و نان دەخۆم و دەچم بۆ سەرکارەکەم، پاشان دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە وتارەکانم دەنووسم یان تەماشای نووسینەکانم دەکەم، یان سەردانی هاوڕێیانم دەکەم یان بەوشتانە قاڵ دەبم کە هاوتەمەکانم پێوەی قاڵ دەبن، پاشان دەخەوم بۆ ئەوەی سبەینێ هەستمەوە و هەمان شت دووبارە بکەمەوە....ڕۆژەکان دووپاتدەبنەوە، ساڵەکان دەپێچرێنەوە و تەمەن دەڕوات، منیش وێنای ڕۆمانە بەردەوامەکە دەکەم: هەستان و خەوتن، خواردن و خواردنەوە، بێدەنگی و قسە، خۆشەویستی و دوژمنایەتی..... بەڵام من نەفسی خۆم دەناسم و هەموو ڕۆژێک کاتژمێرێک لە گەڵیدا تەنها دەبمەوە و دەپرسم: چییە و لە کوێوە هاتووە؟ لە چییەوە هاتووم و بۆ کوێ دەڕوات؟ ئەمە ئەوەیە هەتا ئەمڕۆ ئەنجامم نەداوە. بەڵکوو بە ڕاکردن لێی ڕادەکەم و دەترسم




لەگەڵیدا بە تەنیا بم، بە قسەی هیچ و کتێبی پووچ و خۆشی باتڵ، خۆمی لێوە سەرقاڵ دەکەم، ئەگەر پەیوەیستبم بە هاوڕێیەتی ئەوەوە و سەرقاڵیەکانم نەمێنێت دەروونم تەنگ دەبێت و بێزاردەبم و هەستدەکەم شێت دەبم!

تەمەنم خەرج دەکەم لە بڕینی تەمەندا و گەورەترین خەمم بە فیڕۆدانی ڕۆژەکەمە، وەک ئەوەی ژیانم پێبەخشراوە بۆ ئەوەی وێرانی بکەم، ئەگەر شتێکم دەستنەکەوێت کاتەکەمی پێ بە فیڕۆبدەم و ناچاربم ڕووبەڕووی کاتت ببەمەوە لە ساتێک لە ساتەکانی چاوەڕوانی تەمەندا لەبەردەممدا تەنگ دەبێت و، بێزاردەبم و هەستدەکەم شێت دەبم!

بەردەوام بەدوای داهاتووەوەم؛ لە داهاتوودا دەگەم بە ئاواتەکانم، تێیدا خۆم چاکدەکەم، تێیدا دەگەڕێمەوە بۆ لای پەروەردگارم، تێیدا ئەو واتایانە دەنووسم کە دەروونمی دەخرۆشاند و بە پێنووسەکەم نەمنووسیووە، تێیدا کتێبی گەورەکان دەنووسم کە ئاواتە خوازبووم بیاننووسم.... تێیدا هەموو شتێک ئەنجامدەدەم. لێ هەرگیز داهاتوو نایەت، کە دێت دەبێت بە ئێستا و دەڕۆم بەدوای داهاتوویەکی تردا، وەک ئەو ئەسپە وام کە غاردەدات و توند دەڕوات و خۆی ماندوودەکات بۆ ئەوەی بگات بەو دەستە سەوزەی سەری، بەردەوام لە بەرچاویدایە و هەرگیز پێی ناگات، هەر بەردەوام

خۆی ماندوودەکات هەتا ماندوو دەبێت و دەکەوێت، یان چاڵێک دێتە ڕێی و تێی دەکەوێت.....بەڵام ئەو چاڵەی منی تێدەکەوم هەستناوەی نییە و ڕێگا نییە بۆ دوورخستنەوەی، گەورە و بچووک، زەنگین و هەژار، شازادە و کرێکار ناتوانێت خۆی لێبپارێزێت.

ئەوکاتەی دەگەم بە یەکێک لە ئاواتە گەورەکانم سانا دەبێت لەلام و جوانییەکەی دەرِوات و ناوازەیەکەی نامێنێت، وەک ئەوەی ئاواتەکان سەرابن و تەنها لە دوورەوە پرشنگ دەدەنەوە.

ئەوڕۆژانەی لە سەرەتایی بووم گەورەترین ئاواتم ئەوەبوو ببمە مامۆستا، خەیاڵی ژیانی مامۆستام دەکرد کە وەک بەهەشتێک وایە خودا دایبەزاندۆتە سەر زەمین و حەزت بەچییە تێیدایە....
ئەی مامۆستا فەرمان ناکات بە قسەی دەکرێت، ڕێگری دەکات لەشتەکە دووردەکەونەوە، ڕێزی لێدەنێن و بە گەورە دادەنرێت؟ ئەو دەمەی بوومە مامۆستا ئەو بەهەشتەم دەستنەکەوت ئیللا ئەوە نەبێت کە لە زستاندا لە غوتە دەیبینیت: زەوییەکی قوڕاویی تەنها دڕکی تێدایە، و دارێکی وشک تەنها چڵی پێوەیە، بینیم مامۆستای ناوەندی قەدری زۆرتر و کاری کەمترە و پلە و پایەی بەرزترە و فراوانترە، ئاواتەخوازبووم منیش وابم. ئاواتەخوازبووم نووسەربم، ئاواتەخوازبووم دادوەربم، ئاواتەخوازبووم وتاربێژبم، ئاواتەخوازبووم لە شاراندا بگەڕێم...هیچم لە ئاواتەکاندا دەستنەکەوت تەنها ئازاری

چاوەڕوانییەکەی نەبێت، دواتر بێزاربوون لە مانەوەی. ئێستا دڵنیام ئەگەر ببم بە سەرۆک کۆمار یان خاوەنی ئەهرامەکان یان پارەی(عبرود)، ڕۆژەکان چێژی هەموو ئەمانە دەبات و ڕاهاتن ساناى دەکاتەوە، سوودی لێنابینم ئیللا ئیرەیی ئیرەکاران نەبێت و حەسرەتی-ئەگەر لە دەستی بدەم- لە دەستدانی. بێگومان خۆشییەکانی دونیا وەهمە، ئەوەی بەدەستی نەهێناوە تامەزرۆیەتی و ئیرەیی پێدەبات، ئەوەشی بەدەستی دەهێنێت لێی بێزاردەبێت و ئاوات بەشتی تر دەخوازێت: ئەوەی هاوسەرگیری کردووە ئاواتدەخوازێت سەڵت بوایە و ئەوەی سەڵتە حەزی بە هاوسەرگیرییە. کەسانی ناوشار حەزیان بە گەشتە و گەشتیار دەیەوێت بگەڕێتەوە، لادێنشین بیری لای شارە و شاریی حەزی لە لادێیە، ئێمە هەموومان وەک منداڵیین....یارییەکی بە نرخ بۆ منداڵێک دەکڕیت دڵخۆش دەبێت پێی و یاریی پێدەکات، دواتر فڕێیدەدات و داوای شتێکی تر دەکات ئەگەرچی لەوەش کەمتربێت! پاشان ئاواتەکان کۆتاییان نییە؛ ئەوەی ملیۆنێکی پێبەخشراوە داوای دووملیۆن دەکات، ئەو فەرمانبەرەی یەک پلە بەرزدەکرێتەوە داوای دووپلە دەکات. بەردەوام لە دوو بەدبەختیدایە: ئێستای کە پێی قایل نییە، داهاتووش کە پێی ناگات.

بۆ ئەمە چل ساڵ هەوڵمدا و خۆم ماندووکرد؟ هەوڵمدا بۆ ئەوەی بگەم بە سەراب؟

بیرۆکەکان بەسەرمدا ڕژان، نارەحەتییەک ڕوویتێکردم کە ئەگەر ترسی خودا نەبوایە چەندین ساڵە بەرەو مردنی بردبووم! سکاڵا لە دەست نەخۆشی ناکەم تەندرووستم، سکاڵا لە دەستی هەژاری ناکەم هێندەم هەیە بەسمە، لێ سکاڵا لە دەست فەراغێک دەکەم لە دەروونمدا نازانم لە کوێوە دێت، بەهێزبووە تێمدا و ناتوانم دووریخەم، تامەزرۆی شتێکم بە وردیی نازانم چ شتێکە.

پێنووس و تیانووسم وازلێهێنا و هەستام و لە ژوورەکەمدا گەڕام، لەسەر تاقەکە چرایەکەم بینی بلورێکی مل درێژی سک پانی هەیە، هەنگێک چووبوە ناوییەوە و نەیدەتوانی بێتە دەرەوە، هەوڵدی دەدا و خۆیکۆدەکردەوە و بەهێزەوە ڕوویدەکردە پێشەوە، سەریدەیدا بە شووشەکەدا و دەگەڕایەوە، دووبارە وایدەکردەوە، ئەو دیوارەکەی بەردەمی نابینێت بەڵکوو پشتی ئەو دەبینێت، وادەزانێت لە نێوان ئەو و فەزادا بەربەست نییە. تەماشاییم دەکرد و لەمە بەردەوام بوو، هەر کات بەریدەکەوت دووبارە هەوڵیدەدایەوە نە دەوەستا و پشووی نەدەدا، هەتا چل جار زیاترم بژارد کە وایکرد، هەمووجارێک تووشی سەدمەکە دەبوو وەلێ پەندی وەرنەدەگرت و درکی بە هەقیقەتەکە نەدەکرد، سەری هەڵنەدەبڕی هەتا ڕێگاکە ببینێت و بزانێت ڕێگای فەزا و دەرگای ئازادیی لەسەرەوەیە نەک لەلای ڕاست و لەلای چەپ....

لەم هەنگەوە ئەوە فێربووم کە لەلام شارەوە بوو: فێربووم ئێمە وەک ئەو هەنگە واین وادەزانین ڕێگای دەرچوونمان لەسەر زەمینە و بەرەو

پێشەوە دەچین، ڕێگرییەکان دەدەن بەڕووماندا و دەمانگەڕێننەوە، بە بێئومێدی دادەنیشین یان جارێکی تر دەگەڕێینەوە، دەرچوون لە ناوبانگ یان پارە یان خۆشییەکانی جوانیدا بەدیدەکەین، چەندێ دوورە! ئەوە کەسانی لە پێشینەن لە سیاسی و هونەرمەندان و گۆرانیبێژەکان، زەمین پڕدەکەن بە وتەکانیان و خەڵکی قاڵن بە هەواڵەکانیانەوە، وێنەکانیان دەبینریت و دەنگیان دەبیستریێت، بەمانە چییان چنگ دەکەوێت؟ چ سوودێک دەکەیت ئەگەر هەموو خەڵکی ستایشت بکەن و تۆش لە ژوورەکەی خۆتدا تەنها و بێئومێد بیت، دەروونت ماندوو و دڵت خەمباربێت؟

ئەوە لاوە دەوڵەمەندەکانن، هەموو بارێک دەکەن و هەموو ڕۆژێک چێژ لە جوانییەکی نوێ دەبەن، ئایا ئەمە توونیەتی دڵی تێرکردوون لە کانیاوی جوانی؟ ئارەزووەکانیان تێربووە؟ یان ئەمە وەک ئاوی سوێر وایە هەتا بیخۆیتەوە تونیەکەت نوێ دەبێتەوە؟ ئەوەش خۆشەویستەکانن، خۆشەویستانیان لە ئامێزدەگرن، لێ هێشتا دەروون تامەزرۆییەکی تێدایە ئامێز و نزیکبوون تێری ناکات، هیچ چێژێک لە چێژەکانی جەستە تێری ناکات. ئەوەش ملیۆنەرەکانن، ئایا ملیۆنەکانیان نەفسیانی تێرکردووە و قەناعەت و دڵنیایی پێبەخشیوون؟

ئەمە ڕێگای بەختەوەریی نییە. ڕێگای سەر زەوی داخراوە، فەزاکانی چواردەووریشت سنووردارن، ڕێگای فەزا و دەرچوون تەنها

لە سەرەوەیە، لەوێ جیهانی نەفس هەیە، نەفس چالاک دەبێت هەرکات بەرقێکی بۆ بدرێت، هەرکات گوێبیستی ئاوازێکی سحراوی بێت دەنگێکی ئەو جیهانەی تێدابێت یان چیرۆکێکی عەبقەریی بخوێنێتەوە ئاماژەی تێدا بێت بۆ ئەو شتە ئادیارە، یان ئامۆژگارییەکی بەرز دڵۆپێکی ئەو کانیاوەی تێدابێت.

ئێستا زانیم، داخی گرانم بۆ چل ساڵی لە دەستچووم!

• • •

مەڵێن: تۆ لەبارەی ئایین و باشەوە دەنووسیت بانگەواز بۆ چاکە دەکەیت، چونکە ئەمشەو بڕیارمداوە ڕاستی بڵێم ئەگەرچی لەسەر خوشم بێت.

ڕاستیەکە ئەوەیە- بەڕێزەکانم- بانگخوازانی ئەمڕۆ( هیچ کەسێکی لێدەرناکەم لەوانەی دەیانناسم) هەموویان نمایشکارن؛ لە گۆڤار یان مینبەرەکاندا پۆشاکی شانۆ دەپۆشن بە جبە و مێزەرەوە دەردەکەون، ئەگەر زنجیرەکە تەواوبوو دایدەکەنن و دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەکەی خۆیان، دینار پەرست بەلای پەرستراوەکەیەوە دادەنیشێت و هیچ هەمێکی نییە کۆکردنەوە پارە نەبێت، ئارەزوو پەرست، پلە و پایە پەرست... بتەکان یەکێکن و شیرکەکە یەکێکە!

نمایشکارن و من یەکەمین نمایشکارم. ئەگەر من ڕاستگۆ بومایە لە بارەی ژیانی ئەبووبەکر و عومەرەوە ئەمدەنووسی و پاشان لامنەدەدا لە ڕێگایان و بەڕێگایەکی تردا نە دەڕۆیشتم، ئەگەر ڕاستگۆ بومایە لەوەی بانگخوازی ئیسلامم نهێنی و ئاشکرام، زوبان و دەستم بەپێی فەرمان و ڕێگرییەکانی ئیسلام دەبوو، ئەگەر من( و دە کەسی وەک من، ڕاستگۆ بوینایە) لەسەر زەویدا خراپە نەدەما. تەنها یەک دوانگەی دار هەموو زەوی پاککردەوە لە پیسیەکانی، سێ پلە نە قوبەی هەبوو نە دەرگا، ئەی بۆچی هەزارەها دوانگەی ڕازاوە و نەخشێنراو کە دەرگای جوان و قوبەی هەیە زەوی پاکناکاتەوە؟ لەبەر ئەوەیە خەڵکی سرووشتیان تێکچووە؟ یان زەمانە لە کۆتایی نزیک بۆتەوە؟

ئەخێر؛ بەڵکوو لەبەرئەوەیە ئەوانەی لەسەری وەستاون ئامۆژگاریکارێکی دارینەن، شمشێرێکی تەختەیان بەدەستەوەیە!



سەبارەت بەو ڕاستییەی پێویستە ئەمشەو بوترێت ئەوەیە کە: ئەم ئامۆژگاریی و وتارانە ناماننگەیەنن بە خودا، بەڵکوو بەوە پێی دەگەین هەرکەسێک لە ئێمە بگەڕێتەوە بۆ نەفسی خۆیی و بپرسێت: لە کوێوە هاتووە، بۆچی ئافرێندراوە، چارەنووسی بەرەو کوێیە؟ هەمووان بزانن ڕێگا لە سەرەوەیە، سەری بەرزبکاتەوە بۆ

ئەوەی ڕێگاکە ببینێت. کێ لە ئێمە ئەمڕۆ سەری بەرزدەکاتەوە. ئێمەش وەک هەنگەکە تەنها زەوی دەبینین؟ بەڵکوو کەسانێکمان هەیە وەک پەپولە وایە بەرەو ئاگر دەڕوات و، وادەزانێت دەرگای دەرچوونە!

گاورەکان نوێژ بۆ خودا ئەنجام دەدەن لە پێش نانخواردن لەسەر سفرە و لە پێش وانە لە قوتابخانە و یەکشەمان لە کەنیسەدا، بەمەدا دەزانیت گاورن، زۆربەی موسڵمانەکان چی دەکەن؟ چ نیشانەیەک بەڵگەیە بۆ ئەوەی موسڵمانن، لەو ساتەی ڕۆژدەکەنەوە هەتا ئەوساتەی شەودادێت؟!

نەنوێژ، نەزیکر، هیچ جیاکارییەک نییە لە نێوان حەڵاڵ و حەرامدا.... ئەگەر کارێکی چاکە بکەن بەناوی ڕەوشت و چاکە و تەندروستیەوە ئەنجامیدەدەن نەک بە ناوی ئیسلامەوە، جیاوازی ئەمان و ئەوانی تر چییە؟

دەڵێن دین مامەڵەکردن و ڕاستگۆیی و نیەت و دادپەروەرییە و، مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا بکەیت بەو شێوەیەی پێت خۆشە مامەڵەت لەگەڵ بکەن. ڕاستە؛ بەڵام ئەمە لە دیندایە، هەموو دین نییە! ئەمەش حاڵی هەموو بەڕێزێکە، هەموو ڕێزدارەکان تێیدا یەکسانن، واتای جیاکارییان چییە بۆ باوەڕدار و مولیحد و بتپەرست؟ هەموو

ئەمانە بۆ ژیانی دونیایە، چ شتێک ئەنجام دەدەین بۆ ڕۆژی پەسڵان؟

نەخێر، بەڵکوو ئایین ئەوەیە پەیوەندی بکەیت بە جیهانی بەرزییەوە، خودا بە چاودێریی کارەکانت بزانیت، بزانیت بەردەوام ئاگای لێتە، بە چاوی چاودێریت دەکات تۆش بە دڵ و بە ئەندامەکانت گوێڕایەڵی بیت.

ئەمەش ئامانجی ئافراندن و نهێنی بوونە(وجوود):
﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾
نە عیبادەت عادەتە، نە نوێژ وەرزشە، نە ڕۆژوو چارەیە، نە حەج گەشتە، بەڵکوو عیبادەت ئەوەیە کە دڵ هەست بە شیرینی ئیمان دەکات، چێژی لەزەتی بەندایەتی دەچێژێت، هەست بە وەستان دەکات لەبەردەم خودادا. لەگەڵ ئەمانەشدا با تێبکۆشێت لە گۆڕەپانی ژیاندا، با باشترین بەشی پاکیەکانی بەچنگ بخات لە زانست و لە هونەرەکانی، با بەهێزبێت با زەنگین بێت.
ئەمە هەقیقەتی ئایین و ئامانجی ژیانە، ئایا ئەو کەسە دەگات بە ئامانج چل ساڵە ئەو ڕێگایەی ونکردووە و بە ڕێگایەکی تردا ڕێی کردووە؟
داخی گرانم بۆ ئەو چل ساڵەی لەدەستمچوو!



# بە دەستی خۆمانماڵەکانمان وێرانکرد

لە ساڵی ١٩٥٩دا بڵاوکراوەتەوە

دوێنێ لە کاتی گەڕانەوەم بۆ ماڵ گەیشتم بە کۆمەڵێک برام، وتیان: لەگەڵمان وەرە دەچین بۆ سەردانی فلانەکەس. وتم: کارم هەیە. وتیان: لە ڕێگاکەتدایە، لە (عەفیف). وتم: کەواتە بابڕۆین، لەوێ چەندین یادەوەریم هەیە حەزدەکەم نوێی بکەمەوە.

لەگەڵیان کەوتمە ڕێ و باسی یادەوەرییەکانم دەکرد لە عەفیف.

ڕۆژانی جەنگی جیهانی یەکەم خوێندکاری سەرەتایی بووم، ماڵەکەمان لەلایەکی (سەممانە) بوو، لەو کۆڵانە پێچاوپێچە تەسکانەی کە پیادە نەیدەتوانی دەستی درێژبکات دەیدا بەلایەکیدا، قوتابخانەکەشمان لە بازاڕی (صاروجا)بوو، ڕۆژە درێژەکانمان لە پشتی دیوارەکانەوە بەسەردەبرد و نەماندەتوانی بە دڵی خۆمان ئەم دونیا فراوانە ببینین، نە چاویشمان تێربکەین بە سەوزی کێڵگەکان



و شینایی ڕووبارەکان، نە گوێمان لە خوڕەی ئاو و چریکەی کەناریی بێت....

هەربۆیە خۆشترین ڕۆژ بەلامەوە ئەو ڕۆژانەبوو کە خێزانەکەمان دەچوو بۆ سەردانی ماڵی مامەم لە (عەفیف). ڕۆشتن بۆ ئەوێ سەیرانبوو، دەچووین بۆ دەرگای (ساڵحییە)....کە ئەمڕۆ کرۆکی دیمەشقە و گەورەترین گۆڕەپانە تێیدا و چواردەووری گەورەترین بیناکانی تێدایە، لێ ئەو ڕۆژانە مەترسیداربوو، کەسێک بوێرنەبوایە نەیدەتوانی شەوان لێوەی تێپەڕێت، لە کۆتایی بازاڕی (صاروجا)دا دەرگایەکی دار هەبوو شەوان دادەخرا، کە لێی دەردەچووی ڕێگایەکی تەنگی هەبوو کە ڕۆسەر لێوەی تێپەڕدەبوو لە هەردوولایەوە دوو دارستان هەبوو چەندین ماڵی پەرشوبڵاوی تێدابوو، لە شوێنی شەقامی گەورە((شەقامی **٢٩**ی ئایار)) دارستانی (کوڕکە) هەبوو، لە شوێنی پەرلەمان سینەما هەبوو ئەو کاتەی خوێندکاربووین بردمانیان و فیلمێکیان پیشان داین باسی ڕووداوی ((شناق قلعة))ی دەکرد. دواتر سینەما سووتا و داروپەرتووەکەی مایەوە هەتا کرا بە پەرلەمان.

ئەوکاتەی دەگەیشتین بە ماڵەکە هەستمان بە ئازادیی و ڕەهایی دەکرد لە دوای زیندانی و ناڕەحەتی، یاریمان دەکرد و بە داردا سەردەکەوتین و دەچوینە سەربان و ترێمان دەخوارد( مێوی ماڵەکان هەموو ساڵێک یەک تەن ترێی دیمەشقی دانسقەی دەگرت) و

ماڵی عوسمان پاشامان دەبینی، لەدوای ئەوەوە خانووی تر بوونی نەبوو، دواتر ئەم ماڵە بوو بە کۆشکی مەلیک فەیسەڵ لەوکاتەی لە دیمەشق بوو، پاشان بوو بە شوێنی فەڕەنسییەکان، ئەمڕۆ چۆڵ و وێرانەیە، گاڵتە دەکات بە وانەی متمانەیان بە سەردەمە و ئارامن بە دەسەڵات!

هەر لەمە بێزاردەبووین دەچووینە باخاتەکانەوە و تێیدا دەماینەوە و ڕووەکە دانسقەکانمان خراپدەکرد، لە کۆتاییەکەیدا دەرگایەکی بچووک هەبوو لامان وابوو کۆتایی ئاوەدانی و کۆتا شوێنی زەوییە، دەترساین کە نزیک دەبووینەوە لێی، جارێک بوێریمان کرد و لێوەی چووینە ژوورەوە وەک ئەوە وابوو لە دارستانەکانی ئەفریقادا بین بەترسناکی و سەرسامییەکەی: دوو دارستانی چڕ و چەندین تاڤگەی سامناک، شەلالی قوڵ و سەگی دڕندە و پاسەوانی دڕندەتر لە سەگاکان......کۆمەڵێ منداڵ بووین، من و ئامۆزاکانم و منداڵی دراوسێکان بووین... شەو هات بەسەرماندا و لەم شاراوانەدا بووین و شەوێکی زۆر تاریکبوو.

***

ماڵە شامییەکان بەم شێوەیە بوون، شوێنی نیشتەجێبوون و خۆشیبوو، گەرمیان و کوێستانبوو، وەک ئافرەتێکی داپۆشراوابوو



جوانییەکەی تەنها بۆ خێزانەکەی دەردەخست، لە دەرەوە دەتبینی واتدەزانی گەنجینەی کا یە، هیچ پەنجەرە و باڵکۆنێکی بەدیارنەبوو، کە دەچووینە ناوی، حەوشەی گەورە و مەلەوانگە و کارێز و دارە دانسقەکانت دەبینی، لە هەموو ماڵێکدا خێزانێکی تەواو بوونی هەبوو خۆشەویستی و دڵسۆزی کۆیکردبوونەوە، ناکۆکی و ڕاجیاییان دەبوو، لێ جیاوازییەک خۆشەویستی نە دەسڕیەوە و ناکۆکیەک ڕقوکینەی بەرهەمنەدەهێنا، بەڵکوو وەک بەرکەوتنی دوو چڵ وابوو لە باخێکی چڕدا بەهۆی بایی شەماڵەوە.

لە یەک قاپ و لەسەریەک سفرە نانیان دەخوارد، لە کاتی نوێژی عەسردا حەوشەکەیان دەشۆری، بەرد و مەڕمەڕەکانی وەک ئاوێنە شەوقیاندەدایەوە، ئاوەڕشێنی دارەکانیان دەکرد و ئاویان لێدەتکا، دەمەو ئێوارە باڵندەکان دەهاتن و دەستیان دەکرد بە خوێندن، خێزانەکەش لە هەیوانەکەدا ڕیزییان دەبەست: باپیر و کوڕ و کچ و بووک و نەوەکانی، سەماوەر دادەنرا و ڕیزە چا تێدەکرا، منداڵەکان یاری و بازبازێنیان دەکرد و گەورەکان قسەیان دەکرد و پێدەکەنین، ئەگەر هاوارییان بکردایە یان گۆرانیشیان بوتایە دەنگیان نە دەگەیشت بە دراوسێکان و دەنگی دراوسێکانیش نە دەگەیشت بە ئەمان، کەس نەیدەبینین ئەگەر خۆشیان پەتی بکردایە و کەسیشیان نەدەدی، مەملەکەتێکی سەربەخۆبوو خاوەنەکەی

هەستیدەکرد تەنها بۆ خۆیەتی، ئازاری دراوسێی نەدەدا و دراوسێش ئازاری نەدەدا، ژوورەکانی زۆربوون، چەند بەشێک بوون، بۆ پیاوی بیرمەند نیعمەتبوو دەیتوانی لە ژوورێکدا بەهێمنیەوە بخوێنێت و بنووسێت و لە خانووەکەشدا ژاوەژاوێکی گەورە هەبوایە نەیدەبیست، جیهانێکی پڕ دیمەن بوو، زۆر جیاوازبوو، ئەگەر لە شوێنێک بێزاربویتایە دەچوویتە شوێنێکی تر، لە دانیشتن لە هۆڵەکەدا یان چوونە سەربان یان لەسەر ڕاخەرێک لە ژێر دارێکدا، یان بە تەنیا لەسەربان بێت.

ئەمەماڵەکانمانە کە بۆ ئێمە درووستکراوە و ئەندازیارییەکەی سروشتی کەشەکەمان و ئادابی دینەکەمان و خوو و نەریتمان بووە، ماڵە شامییە ڕەسەنەکانە کە بنچینەکەی تیاماندا چەسپاوە، پاشان ڕووبار و دەریاکانی بڕی و کەنار بۆ کەنار، لە شامەوە بۆ ئەندەلووس، ئەندەلووسی پڕکرد، پاشان چوو بەرەو مەغریب هەتا ئەمڕۆش تێیدا ماوەتەوە، وەک ئێمە لێی بێزارنەبوون و پشتیان تێنەکرد بۆ شوێنکەوتنی ڕۆژئاوا، شوێنکەوتنی ئەوانمان وەک ئایین وەرگرت و هەموو شتێکی ئەوانمان بە باش زانی، ئەگەرچی خراپە و ئابڕووچوون، سەما و مەی، تاوان و کوفریش بێت!

***

لە کاتی ئەم قسانەمدا گەیشتین بە ماڵی پیاوەکە، تەماشم کرد زەوی گۆڕاوە بە زەوییەکی تر، ئەو دارەی شوێنی منداڵی و

یاریکردنم بوو لەگەڵ دوێنێدا گوزەشتووە، لە شوێنەکەیدا دووباڵەخانەی نوێ هەبوون لە نهۆمێکیاندا ماڵی ئەو هاوڕێمانەی لێبوو کە هاتبووین بۆ سەردانی، هەستم کرد- لەوەی لە دەستمدابوو لەوەی کە بینم- وەک ئەوەی ماڵئاواییم لە ئازیزێک کردبێت و لە خۆشەوسیتێکم جودابوبێتمەوە، زەمانە لە نێوان ڕابردوو و ئێستادا بردمی هەتا وەها هەستم کرد تووشی سەرەخولەبوومە، خۆم هەڵگرت و بەبێ هەست و ئاگا چوومە ژوورەوە، ماڵەکە زیندانییەک بوو لە زیندانییەکان کە پێی دەڵێن شووقە: کۆمەڵە سندوقێکە لە چیمەنتۆ لە هاویندا داخ دەبێت، خەریکبوو دەخنکایین وتمان: پەنجەرەکە بکەنەوە تۆزێ بایی شەماڵ بێتە ژوورەوە.

وتی: ناتوانین، پەنجەرەی هاوسێکەمان بەرانبەرمانە، ئەگەر بیکەینەوە هەموو ماڵەکەمان دەبنین.

بە ئازارەوە ئاراممان گرت، تەنها تاوێک بوو هەتا خانووەکە لەرییەوە وامزانی بۆمب تەقییەوە! وتم: ئەمە چییە؟

وتی: شتێکبوو لە ماڵە هاوسێیەکمانەوە کەوتە خوارەوە....

ساتێکی تر، دەنگێک هات ماڵەکەی پڕکرد و گوێیەکانی کاسدەکرد. وتم: ئەی ئەمە چییە؟

وتی: ڕادیۆیی دراوسێکەمانە.

وتم: پەنادەگرم بە خودا، چۆن دەتوانن لەم ماڵەدا بژین؟

وتی: لە عەزابدا. دۆزەخمان پێش خۆمان خست لە دونیادا لەوکاتەی پشتمان لە ماڵە عەرەبییەکان کرد و ڕوومانکردە ئەم شوقانە، دۆزەخی گەورە و بچووکە. نابینیت منداڵەکان لە هەموو ڕێگایەکدا یاری دەکەن، لە قوتابخانەی شەقامەکاندا تووشی هەموو نەریتێکی خراپ و هەموو قسەیەکی ناپەسەند دەبن، بە پیسی پۆشاک و ڕەوشت و زارەوە دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە.....ئەمە ئەگەر بەسەر شکاوی یان قاچ شکاوی نەگەڕێنەوە.

هۆکارەکەی ئەم ماڵانەیە، ئەگەر لە ماڵەکاندا حەوشە و باخچەی وەک جاران بوونی هەبوایە منداڵەکان نە دەچوونە دەرەوە بۆ شەقام و ڕێگاکان.

* * *

لەلای ئەوان دەرچووین، ماڵئاواییم لە هاوڕێکانم کرد و بە تەنیا وەستام و بۆ ئەو ڕابردووە گریام کە لەدەستمداوە، بەدوای پاشماوەکەیدا دەگەڕێم نایدۆزمەوە، ماڵەکانمان هێنایە گۆ، بیسەری وەڵامەکانیان نەبووم، پاشان لە پشتی دوو باڵەخانەکەوە، وێرانەیەکی

بچووکی فەرامۆشکراوم بینی کارێزێکی تێدابوو هێشتا ئاوی لێهەڵدەقوڵا، بەردەکانی سەوزبوون و قەوزە لەسەری گەشەی کردبوو، بە بینینی هەستم کرد دڵم دەدات لە سینگم، هەناسەم سواربوو وەک ئەوەی لە نێوان ئاپۆڕای خەڵکیدا ڕووی ئەو خۆشەویستەم بینیبووە دەمێکە دوورە و تامەزرۆیی دیدارییم...

مەلەوانگەکەی ماڵی مامەم بوو، ئەو مەلەوانگەی کە بەردەکانی وەک ئاوێنە دەدرەوشایەوە و ئاوەکەی شەوقیدەدایەوە وەک ئەڵماس، ئەمڕۆ وەک پیرەکێکی لێهاتووە، لێ من هەروەک ڕۆژانی شکۆمەندییەکەی دەیبینم، وەک منداڵێکی جوانی بە ناز دەیبینم.

وەستام گوێم ڕادێرا بۆ خوڕەخوڕی ئاوەکەی، بێئاگابووم وەک چۆن منداڵ بە لایلایەی دایکی بێئاگا دەبێت، ئینجا خەونم دەبینی:

مەلەوانگەکەم بینی دەدرەوشایەوە و ئاوی بە بەهێزی لێدەهات، لە دەووریدا دیواری و بنمیچی ڕازاوە هەستابوونەوە، هەیوان و سەربان گەڕابوونەوە، ماڵ گەڕابووەوە و ڕابردوو ژیابووەوە. گوێم لە قیرەقیرِی بۆقەکان و هاواری ئافرەتان و قیژەی منداڵەکانبوو.

...

لە ڕابردوودا ڕۆچووم هەتا چووم هاوارم کرد و بانگی کەسەکانی ماڵەکەم کرد و ئەوەم لەبیرکردبوو بانگی چل ساڵ لە دواوە دەکەم، ناوی ئەوانەم دەهێنا کە لەژێر خۆڵدان، هەیانە ڕۆژگار هەڵیداوە بۆ دوورترین شوێن.

کەس وەڵامی نەدایەوە.

پەنجەرەکەم کردەوە و بینیم کۆمەڵێک خەڵک تەماشام دەکەن.
وتیان: ئەم بێگانەیە کێیە وەک شێتەکان لەم وێرانەیەدا هاواردەکات؟ گومانیان وابوو من بێگانەم.

من بێگانەم؟ (بەڵا)م لێدان! ماڵی ئێمەیە؛ پارچەیەک لە دڵم و پاشماوەی ژیانمی تێدایە، لە ماڵەکەی خۆمدا بێگانەم؟

گەڕامەوە بۆ ئێستا، خەونەکە ڕۆیشت وەک ئەوەی دێڕێک بێت و لەسەر ئاو کێشرابێت. ڕۆیشتم و لە خۆمم دەپرسی بۆچی سەرکۆنەی ئەوانە بکەین کە ئەو ماڵە بەنرخانەیان ڕووخاند کە لە مەیدان و شاغوور و سەیدی عاموودیبوون؟ بۆچی سەرکۆنەیان بکەین لە کاتێکدا خۆمان ئەوە دەڕوخێنین کە فەڕەنسییەکان بۆیان بە جێهێشتوین؟! فەڕەنسیەکان دوژمنمان بوون ئایا خۆشمان دوژمنی خۆمانین؟ داخی گرانم بۆ ئەو خانوانە! داخی گرانم بۆ خۆمان!

***



# وانەی کۆتایی

لە ساڵی ١٩٣٦دا بڵاوکراوەتەوە

منداڵەکانم!
چاوەڕێ بکەن، کتێبەکانتان دەرمەکەن و تیانووسەکانتان مەکەنەوە، نە هاتووم وانەتان پێبڵێم، بەڵکوو هاتووم بۆ ئەوەی ماڵئاواییتان لێبکەم چونکە لە قوتابخانەکەتان گواستراومەتەوە. ڕۆڵەکانم ماڵئاوایی قورسە چونکە سەرەتایی جیابوونەوەیە، هەموو ئازارەکانی دونیا جۆرێکە لە جیابوونەوە: مردن جیابوونەوەیە لە ژیان، جەرگسوتان جیابوونەوەیە لە منداڵ، غوربەت جیابوونەوەیە لە نیشتیمان، هەژاری جیابوونەوەیە لە پارە، نەخۆشی جیابوونەوەیە لە لەشساغی.

ماڵئاوایی کردن سەختە ئەگەرچی تەنها بۆ یەک ڕۆژیش بێت، ئەی چی ئەگەر ئەوکەسەی ماڵئاوایی لێدەکەیت هاوڕێیەکی ئازیزت بێت، ئەی چی ئەگەر منداڵت بێت، ئەی چی ئەگەر منداڵەکانت بن؟

ئێوە منداڵی منن، منداڵی ڕاستی منن، وەک موجامەلە و ڕووپامایی و وەک قسەیەک نایڵێم، بەڵکوو هەموو ئەندامێک لە ئەندامەکانم وادەڵێت و لە قووڵایی دڵمەوە هەستی پێدەکەم!

بۆچی نا؟ ئێوە منتان خۆشناوێت و منیش خۆشمناوێن؟ ئایا بەردەوام بیرتان لێناکەمەوە و خەمی ئێوەم نییە؟ گەر یەکێکتان ئازاربچێژێت ئازاردەچێژم، دەوروژێم ئەگەر دەستدرێژی بکرێتە سەر یەکێکتان؟ ئەرە دڵم بۆ والانەکردن هەتا دڵنیابوونەوە و شادوومانبوون پێم و ئەو بەربەستە ترسەتان سووتاند کە لە نێوان من و ئێوەدابوو، وەک چۆن لە نێوان هەموو مامۆستا و خوێندکارێکدا بوونی هەیە، دواتر داواتان دەکرد لە یارییەکانتدا بەشداری بکەم، چیرۆکەکانی خۆتانتان باسدەکرد و سکاڵای خەمەکانتان دەکرد، نهێنییەکانتان باس دەکرد و ئەوشتانەتان باس دەکرد کە لەلایەن باوک و خێزانەکانتانەوە تووشتان دەبوو؟ پەیوەندی چ باوک و کوڕێک لەم پەیوەندییە پتەوترە، چ هۆکارێک لەم هۆکارانە بەهێزترە؟

ئێوە منداڵی منن. ئایا بینووتانە باوکێک ماڵئاوایی کۆتایی لە منداڵەکانی بکات و بتوانێت جڵەوی فرمێسکەکانی چاوی بگرێت؟ زەمانێک نەفسی منتان سەرقاڵ کرد و ڕێگای ژیانتان لێگرتم، جگە لە ئێوە کەس نابینم و تەنها بیر لە ئێوە دەکەمەوە،



قەناعەتم هەیە بەم هاوڕێیەتییە پاکە ماندووکەرە لە هاوڕێیەتیەکی درۆ و خۆشەویستیەکی هیچ.

چۆن دەتوانم خۆم بگرم کە ئێستا وشەی کۆتاییم دەڵێم، پاشان دەڕۆم بەلای کاری خۆمەوە، نازانم سبەینێ دەتانبینم یان بۆ هەتاهەتایە ناتانبینمەوە؟

بەڵام ئێوە خۆڕاگربن! خەفەت مەخۆن و بەداخ مەبن و مەگرین، چونکە من فێرمکردوون لەم منداڵیەتاندا چۆن خۆڕاگر و پیاوانە بن زیاتر لە ئێمە لەکاتی لاوێتیماندا، لەسەر ئەو هێزە پێمگەیاندن کە ئێمە لەدەستماندابوو دوور لە هەستوسۆز کە لەسەری پەروەردەکرابووین و، نکوڵی نازارەکان کە هەتا ئێستاش لێی ڕادەکەین، ئەو تێکۆشانەشی کە ئێمە ڕقمان لێیەتی و فەرامۆشی دەکەین، بۆ ئەوەی لە ڕۆژێکی وەک ئەمڕۆدا خۆڕاگریتان ببینم.

ئێستا ئێوە لە چواردەوورم کۆبونەتەوە، لێ لە داهاتوودا جیادەبنەوە و بڵاودەبنەوە بەسەر پلەکانی پەیژەی کۆمەڵگادا، هەژار و زەنگین، گەورە و بچووک، بازرگان و پیشەوەر، فەرمانبەری گەورە، بەڕێوەبەر و وەزیرتان تێدا دەبێت...بەڵام دڵم هەر بە دواتانەوەیە، ژیانم تێتاندا درێژ دەبێتەوە، بنەماکانم لە دڵتاندا دەمێنێتەوە و ناتوانن لە بیری بکەن، وشەکانم لە مێشکتاندا دەزرنگێتەوە و ناتوانن

فەرامۆشیکەن، بیسەری دەبن لە کاتی خۆشیدا بەناوی واجبەوە بانگتان دەکات، لەگەڕی باتڵدا بەناوی هەقەوە، لەمەستی چێژدا بەناوی فەزیڵەتەوە. خۆشبەختی بۆ ئەوەی دەیبیستێت و وەڵامی دەداتەوە، ماڵ وێرانی بۆ ئەوەی لە بیریدەکات و نکوڵی دەکات و پشت هەڵدەکات و خۆی بەگەورە دەزانێت!

بنەماکانی هەق و فەزیڵەتم فێرکردوون، بەڵام لە جێبەجێ کردنیدا تووشی ناڕەحەتییەکی گەورە دەبنەوە، دەبینن یەکەمین دوژمنی مامۆستای قوتابخانەکەت و خێزان و هاوڕێی ڕێگاکەتە، کەسی بەختەوەر ئەو کەسەیە جێگیربێت لەسەر هەق و لەڕێیدا ئازاربدرێت، پاڵەوان ئەوکەسەیە سنگی بخاتە بەر ئەو تیرانەی دەنرێت بە ئوممەتەکەیەوە و بە خوێنی ئەو ئاگرە بکوژێنێتەوە کە نیشتیمانەکەی دەسوتێنێت. لە ئوممەتەکەتاندا تاعونێکی ئەخلاقی ترسناک بوونی هەیە ماوەی پێنج سەد ساڵە تووشیبووە، زەلیل و بێجوڵەبووە، عیززەت و خۆڕاگری و هێزی لە دەستداوە، کاتی ئەوە هاتووە ئوممەت بە تەواوی ڕزگاری بێت لێی. تەنها لەسەر دەستی ئێوە ئەم کارە ئەنجام دەدرێت.

ڕێگاکەم نیشانداون و کلیلی سەرکەوتنم کردۆتە دەستانەوە، هەر باشەیەکم زانی بێت فێرمکردوون، دوورمخستوونەتەوە لە هەموو کەموکورتییەکانم، ڕێزم گرتوون بۆ ئەوەی ڕێزم بگرن، لەبەردەمتاندا

هەڵەم کردووە بۆ ئەوەی بمگەڕێننەوە، لە هەڵەکەشم گەڕاومەتەوە بۆ ئەوەی لێمەوە فێربن، بە ویژدان بووم لەگەڵ خۆمدا بۆ ئەوەی لەگەڵ خەڵکیدا بە ویژدان بن، فێرمکردن ئەگەر ستەمم کرد بەرهەڵستیم بکەن بۆ ئەوەی بەرهەڵستی هەموو ستەمکارێک بکەن........ئەمانە هیچی داهێنانی خۆم نین؛ ئەمە بنەماکانی ئیسلامە کە فێرم کردن، شوێنی ڕێنگاکەی بکەون و لە فەرمان و ڕێنگرییەکانیدا بوەستن، شانازی پێوەبکەن و بە ئاشکرا شوێنی شەعائیرەکانی بکەون، پەروەردەم کردن لەسەر ئەوەی گوێڕایەڵبن بەبێ سەرشۆڕی و بە عیززەت بن بەبێ لوتبەرزیی، هاوکاربن لەسەرچاکە، و لەسەرهەق جێگیربن و بەهێزبن بەبێ ستەم، سیستەمێکی کامڵ بەبێ ئەوەی سیستەمی کەسایەتی و سەربەخۆیتان لەدەست بدەن.

باسی ئەو نارەحتیانەم بۆ دەکردن کە لە قوتابخانە لەلایەن مامۆستاکانەوە دەهاتە ڕێمان، هیچم لەگەڵ ئێوەدا ئەنجام نەدا: ئێمە لەدەستی قوتابخانە ڕاماندەکرد چونکە تێیدا توندێکی ستەمکاری عەبووسی دەنگ گڕی قسە پیسی لێبوو، واملێکردن قوتابخانەتان خۆشبوێت چونکە دەگەن بە باوکێکی ڕووخۆشی بەسۆز، خۆشیدەوێن و بەسۆزە بۆتان، سوورە لەسەر ئەوەی ڕازیتان بکات وەک چۆن سوورە لەسەرئەوەی سوودتان پێبگەیەنێت.

ڕقمان لە وانە خوێندن بوو چونکە شتێکی نامۆبوو بۆمان و تەلاسیمێک بوو لێی تێنەدەگەیشتین و نەماندەزانی پەیوەندی چییە بەژیانەوە، سزا دەدراییین لەسەر فەرامۆشکردن و هەڵەکردن تێیدا، واملێکردن وانەکانتان خۆشبوێت چونکە ئاسانبوو بۆتان، دەزانن پەیوەندی چییە بە ژیانتانەوە و سوودی چییە بۆتان، ئەزبەریدەکەن چونکە پێویستە و بەسوودە نەک لەبەری ترسی سزادان.

ئێمە چاوەڕێی ئێوارەمان دەکرد بۆ ئەوەی ڕزگارمان بێت لە قوتابخانە، چونکە تێیدا زیندانی بووین و نەماندەتوانی بجولێین یان ئاوڕبدەینەوە یان قسەبکەین، تەنها دەستەواژە نارِوونەکانی وانەکە و جوێنی بە ئازارمان لە مامۆستاوە دەبیست. واملێکردن ڕقتان لە ئێوارە بێت چونکە جوداتان دەکاتەوە لەو قوتابخانەی کە چیتان دەوێت تێیدا دەیلێن لە قسەی باش، چ کردەوەیەکی باش بتانەوێت ئەنجامی دەدەن، دەخوێننەوە هەتا تاقەتی خوێندنەوەتان هەبێت، ئەگەر بێزاربوون لەوانەکە گوێبیستی چیرۆکی بەسوود یان نوکتەیەکی خۆش دەبن، ئەمیش وانەیەکە لە وانەکان، دەتان بینی قسەتان لەگەڵ دەکەم وەک چۆن قسە لەگەڵ پیاوان دەکەم نەک منداڵان. ئێمە لە قوتابخانە هەستماندەکرد سەرشۆڕیین چونکە نەماندەتوانی بەرگری لە مافی خۆمان بکەین و داوای ئەو شتە بکەین کەهی خۆمانە، **ئەگەر وشەیەکمان بوتایە دارەکە لەسەرسەرمان بوو، یان وەلامی مامۆستامان بدایەتەوە بەلاکە دەبووە ملمان، بە عیززەت و**

ئازادم کردن، بەرگری لە مافی خۆتان دەکەن و داوای ئەوشتانە دەکەن کە هی خۆتانە، بەڵام بە ئەدەب و ڕێز و شوێنکەوتنی یاساکانی کۆمەڵگا و سیستەمی قوتابخانە.

***

ئەو ڕۆژەتان لە یادە هاتم بۆ لاتان زۆرینەتان کە دەهاتن بۆ قوتابخانە ڕانی بەدەرەوەبوو قژی هەڵدابووەوە، شانە و ئاوێنە لە گیرفانتاندا بوو بێریشتان بەسەرەوە بوو، شانازیتان بەڕێک پۆشیتانەوە دەکرد و خۆتان بەعیززەت دەکرد بەجوانیەکانتانەوە و بە پۆزەوە ڕێتان دەکرد، هیچ شتێک نەیدەبەستنەوە بە ئیسلامەوە ناو نەبێت، هیچ شتێک بە عەرەب نەیدەبەستنەوە پێناسەی باری شارستانی نەبێت، لە مێژووی خۆتانتان نەدەزانی هێندەی لە مێژووی حسیین و ئارامییەکانتان دەزانی کە بەدرێژی خوێندبووتان پێش ئەوەی ژیاننامەی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا بخوێنن، پێش ئەوەی بزانن ئەبووبەکر کێیە، پێش ئەوەی ناوی موعاوییە ببیستن! فێرمکردن شانازی پیاو بەهێز و تواناکەیەتی، بە عیززەت بوونی بە ئایین و زمانەکەیەتی. مێشکتان توندبوویەوە و دەروونتان بەهێزبوو، نیەتان بە ئاگاهاتەوە، وەک شێر دەڕۆیشتن و وەک عفریتەکان یارییتان دەکرد، وەک زاناکان دەتانخوێندەوە و وەک بیریارەکان بیرتانکردەوە، وەک ڕاستگۆییان هەستان بە چاودێریی خودایی دەکرد، لەم تەمەنەدا واتان لێهات سیمیناری **بیست لاپەڕەی** ئامادەبکەن

سەبارەت بە (عەمری کوڕی عاس) یان (عەبدولمەلیک) یان (عەبدوڕەحمان ناسر)، بیستان لە دونیادا زانستی ئیسلامی هەیە، لە دەروونتاندا جێگیربوو ئەم زانست و شارستانی و شکۆمەندییە هەردەبێت هەستێتەوە وەک هەستانەوەی ئەورووپی ڕینسانس.

بەڵام ئێوە ناتوانن- منداڵەکانم- لەو قوربانییە تێبگەن کە لە پێناوی ئێوەدا داومە؛ چونکە پێش من مامۆستای لەم شێوەتان نەبینیووە، بەسمە پێتان بڵێم من بە ئەدەبەوە قاڵم. مەبەستم ئەوەیە دەروونێکم هەیە هەست دەکات، ئازاردەچێژێت و شاد دەبێت، تووڕە دەبێت و ڕازی دەبێت، دەوروژێت و ئارام دەبێت، بەهیوا دەبێت و بێهیوا دەبێت، ئامانجێکم هەیە لەم کارە گەورەترە، گرنگی بە شتانێک دەدەم جگە لە شاوری کارگوزارەکە و عەسای تەمێ کردن و لەبەرکردنی نوکتەی سارد بۆ کات کوشتن، قاچ خستنە سەرقاچ بۆ چاوەڕوانی کردنی وانەکە....

هەموو ڕۆژێک دێم بۆ قوتابخانە و لە دەروونمدا دەیان وێنە و بیرۆکە هەیە کە هەیکەلی گەورەی لێ بونیاد دەنێم بۆ شوێنەواری ئەدەبی بە پێزم، کە هەتا ئێستا هیچیم لێنەنووسیووە، کە دەگەمە قوتابخانە و ئەو هەوایە دێت بە لووتمدا کە پڕە لە میکرۆبی تەمەڵی و خاوییەتی، هەموو شتێک لە مێشکمدا دەڕوات، هەستدەکەم بوومە بە مامۆستایەکی سەرەتایی!

بەڵێ! دەروون و تەنەێشەم کردە قوربانی لە پێناوی ئێوەدا...لە پێناوی ئێوەدا لە دەستمدان، ئەوەتا ئێستاش ئێوە لە دەستدەدەم.

ئێوە نازانن بە جودایی ئێوە دەروونم چ پۆشاییەک ڕووی تێدەکات، وادەزانن مامۆستاکەتان یەکێکە لەو مرۆڤە ڕۆبۆتیانەی کە دێن و دەچن، کاردەکەن و وازیلێدێنن، بەڵام بەبێ دڵن، چیرۆکێکتان بۆ باسدەکەم هەفتەیەک پێش ئێستا بەسەرمدا هات:
ڕۆژی پشووبوو، ماوەیەکی زۆربوو چاوەڕوانی بووم هەتا پشوویەک بدەم لەو ماندووییەی شەکەتی کردووم و بێنایی سڕیومەتەوە و گەیشتووە بەرپەڕی بیرکردنەوەکانم، بەیانییەکەی دەستمکرد بە خوێندنەوە هیچی لێتێنەگەیشتم، شتێک پاڵنەرمبوو بەرەو دەرەوە، پۆشاکەکانم کردە بەرم و نەمدەزانی بەرەوکوێ دەڕۆم، خۆمم بینییەوە بەو ڕێگایەدا دەڕۆم کە هەموو ڕۆژێک لێوەی دەڕۆم، پێیەکانم بەرەو شوێنێک دەیان بردم، سواری ئۆتۆمبێل بووم بۆ گەڕەکی موهاجیرین، بۆ بەردەرگای قوتابخانە. لێرەدا بەئاگاهاتمەوە و گەڕامەوە بۆ دەروونم، نەمتوانی یەک ڕۆژ لە دووری ئێوە بژیم، بۆ هەرکوێ دەڕۆیشتم وێنە و زەردەخەنە شیرینەکانتان و هاوڕێیەتییە پاکەکەتان و ئەو دەستانەی بەرزتان دەکردەوە بۆ پرسیارکرد لەبەرچاومبوون و لانەدەچوو!
بەڵام ئێوە هیچتان لەسەرنییە ڕۆڵەکانم، بیر لە من مەکەنەوە و خەمی من هەڵمەگرن، بەڵکوو بەردەوام بیر لە بنەماکانم بکەنەوە

کە فێرمکردوون، لە داهاتوودا ئەوە باسبکەن من مامۆستاتان بووم و منتان خۆشویستووە و منیش ئێوەم خۆشویستووە، ڕقتان لێم نەبێت لەسەرئەوەی هەندێ جار توندبووم لەگەڵتان یان سزام داون، بۆ سوودی ئێوە وامکردووە.

لەدوای هەموو ئەمانە، هەستن ڕۆڵەکانم ماڵئاوایی لە باوکتان بکەن کە لە دوای ئەمڕۆوە ئیتر پێی ناگەنەوە!

***

هاوڕێکەم بە جەستەیەکی ڕووخاو و بێهێزەوە لە قوتابخانەکە هاتە دەرەوە، بۆ کۆتاجار تەماشای کرد، لەڕێی ئەسرینە پرشنگدارەکەیەوە قەشەنگیەکی بەدیکرد وەک ئەوەی ئەڵماس بێت و لەبەرخۆردا بێت، پاشان ڕۆیشت و.... بە بیرکردنەوەیەکی شێواو بیریدەکردەوە.

***

ئەمە ژیانی مامۆستایە؛ داری خۆشەویستی لە دڵیدا دەڕوێت بە ڕەگەوە لێی دەکەنەوە، کە گوڵ دەگرێت لە دڵی دەریدەکەن: منداڵانێک وەردەگرێت نایانناسێت و نایناسن، بەردەوام هەوڵدەدات هەتا تەبیعەتیان دەزانێت و خوویان پێوەدەگرێت و خۆشیدەوێن، لارییەکەیان ڕاستدەکاتەوە و خراپەکەیان چاکدەکاتەوە، هەتا

ئەوکاتەی خۆشەویستی بەرێک دەگرێت و بە سۆزی سوودێک دەگەیەنێت، خاوەن دەسەڵاتەکان بە نووکی پێنووسەکەیان هەموو ئەم هۆکارانە دەبڕن، بە یەک دڵۆپە حیبر جودایی دەکەنە نێوان باوک و منداڵەکانیەوە، لەبەرهیچ شتێک نییە، بەڵکوو خراپییە یان پلانگێڕییەکی نزمە، یان بۆ ئەوەیە شوێنەکەی پێ چۆڵ بکەن بۆ ئەوەی خاوەن واستەکان شوێنیان بگرنەوە.

هاوڕێکەمان ڕۆیشت و دەیچرپان بە گوێی دەروونیدا: من هەست بە ڕوخاویی و لاوازی دەکەم هەستدەکەم چرایەکبوومە و خامۆشبوومە، بەوە بەسیان نەکرد کە لەدەستیان دام و کردمیانە ئەم تەڵەوە هەتا وایانلێکردم مەلەی تێدابکەم، پاشان لە ناخیدا بگەڕێم، لە کاتێکدا هیچەکان و دزەکان شۆخی دەکەن بە چاوێکی ڕوونەوە گوڵ و گوڵزارەکەی لێدەکەنەوە!

هیچ هیوایەکم نەماوە... پێش ئەوەی چنگیان بکەوم لە جەنگەکەدا کەوتم....دەروون و داهاتوو و ئاواتەکانم فرۆشت بە نۆ جونیەی مانگانە بۆ نانی خێزانەکەم! یاساخبوو لە غەیری ئەم ڕێگایەوە بەدەستی بێنم؟ ئەرە پێویستبوو بمرم هەتا بژیم؟!

پەروەردگارا داوای لێخۆشبوونت لێدەکەم، پەڵپگرتن و ڕەخنەگرتن نییە، لێ سکاڵان. ئەی مرۆڤ کە ماڵەکەی لە دەست دەدات

سکاڵا ناکات و بۆ لە دەستدانی خۆشەویستەکەی ناگری؟ دەبینێت هیواکانی لەبەردەمیدا دەڕووخێن و دەروونی دەتوێتەوە و ژیانی لەناودەچێت و کارامەیەکانی دەڕوات و هیچیش نەڵێت؟!

سکاڵا دەکەم بەڵام بۆلای خودا، هیچ مرۆڤێک نییە سکاڵای لەلا بکەم؟

***



# ژمارە ۱۰۰۰ای ڕیساڵە

لە ساڵی ۱۹۵۲دا بڵاوکراوەتەوە

کە بیستم خەریکە ڕیسالە ژمارە هەزاری تەواو دەکات شۆکبووم و دڵخۆشبووم، وەک چۆن ئەو کەسە شۆکدەبێت کە پێی دەڵێن منداڵەکەت بووە گەنج، دڵخۆشدەبێت وەک ئەوەی یەکەمجارییەتی گەنجییەتی خۆی دەبینێت، ئەمەش بەهۆی نەزانین و فەرامۆشکردنی نییە، بەڵکوو ئێستاش لە دایکبوون و منداڵییەکەی لە یادە، چونکە هەموو ڕۆژێک دەیبینێت هەستناکات دەگۆڕێت و نازانێت منداڵی تێپەڕاندووە و بووە بە گەنج. بەردەوام دڵخۆشیم بە ڕیسالەم لە یادە، هەڵوێستی ئەنوەر عەتاری برام، کە ژمارە یەکی هێنابوو لە پشتیەوە شاردبیەوە، وتی: ئاگاداربە! وتم: بۆچی؟ وتی: زەیات گۆڤارێکی ئەدەبی دەرکردووە.

هەستدەکەم -لەزۆری ئەو خۆشییەی چووە دەروونمەوە لە کاتی قسەکەیدا- ئەوە دوێنێ بووە.....ڕۆژەکان چۆن تێپەڕین هەتا تەمەنی ڕیسالە گەیشتووە بە هەزار هەفتە؟ چۆن ئەم ماوە زۆرە تێپەڕی لە کورتێکەیدا دەڵێی شەوانی بەیەکگەیشتنە؟!

•••

هەزار ژمارە؟! چەندێ لە هزرم بەخشی لە ئامادەکردنی وتارەکان بژیی و لە ناوەزم لە چاوەڕوانی گەیشتنیدا! چەندێ پرسیارم لە فرۆشیارەکانی کردووە، لە شەقامی ڕامی لە دیمەشق و، لە بازاڕی سەرای لە بەغداد و، لە عشار لە بەسرە و، لەسەر سوور لە بەیرووت و، لەلای بابوسەلام لە مەککە و، لەلای پردەکە لە دیر، لە شەقامی ملووک لە حەیفا.... لە هەموو شارێک لێی ژیاوم یان پێیدا تێپەڕیووم! چەندێ نووسینەکانیم خوێندەوە لە پشتی خاوەن ئیمتیازەوە لە ژووری بەڕێوەبەر و لە پشتی ئامێرەکانی چاپەوە! ڕۆژەکانم شەممە و یەکشەممە و ڕۆژی ریسالەبوو، دیمەن و هاوڕێکانم دەگۆڕان، بەڵام ڕیسالە هاوڕێی بەردەوامبوو، هەموو ژمارەکانیم لە یادە هەموو وتارێک کە تێیدا بڵاوکراوەتەوە هەموو موناقەشە و توێژینەوەیەک تێیدا، لە سەرەتا هاوسەرگیریەکەماندا خێزانم پێی وتم: هەوێم نییە، لێ ڕیسالە هەوێمە!

دواتر بینی لە ژیرترین و باشترینی ئافرەتەکانە، هەوێیەکە نە زیاندەگەیەنێت نە عەزیەت دەدات.

•••

چەندێ لە دڵ و بیرکردنەوەکانم تێیدا دانا، لە دیمەنەکانی ژیانم و یاداشتەکانم، لە ئازار و ئاواتەکانم، لە ساڵی ١٩٢٢ەوە هەتا ئیمڕۆ!



هەزار ژمارە، ان شاءالله ڕیساله دەژی هەتا دەگات بە دەهەزار هەتا دەبێت بەبایەخترینی کتێبخانەی عەرەبی و گەنجینەکانی.....وەک چۆن بووە. دەژی هەتا دەگاتە تەمەنی(( المقتطف))، المقتطف لەوشایستەتر نییە بە نەمری.

ڕیساله فەزڵی هەیە بەسەر زمان و ئەدەب و ئەخلاقەوە، ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە زیندووکردنەوە ڕووحی ئایین لە دونیای ئیسلامدا، نووسەر و شاعیری پێگەیاند و پێشانی خەڵکیدا و قوتابخانەبوو بۆ ڕەوانبێژیی عەرەبی؛ بە گەنجی چووینە لایی و بە ڕێگای پیرەکانی ئەدەبدا ڕۆیشتین، تێیدا ماینەوە هەتا نزیکە ئێمەش لە پیرەکان هەژماربکرێین، ئایا لە دوای چل و پێنج ساڵییەوە گەنجێتی هەیە؟

گەنجێتی ڕۆیی و گوڵی تەمەن پوکایەوە و پیریبەتی هات، ئەگەر بیرمبچێت هەموو ئەندامەکانم بیرمدەخەنەوە؛ ئەگەر زۆربخۆم گەدەم دەڵێت: ئاگاداربە، گەنجەکەی جاران نەماوی. ئەگەر ئەو وەرزشانەی جاران ئەنجامبدەم دڵ دەڵێت: بوەستە، تۆ گەنج نیت. ئەگەر سەرمام بێت جومگەکانم دەڵێت: ئاگاداربە، هەڕەتی لاویت تێپەڕاندووە! ئەگەر ڕووبکەمە خۆشەویستی یان بۆ جوانی پێبکەنم، دڵی بێزار و جاڕسبووم دەڵێت..... ئای لە توندی ئەوشتانەی دڵی بێزار و جاڕسبوو دەیڵێت! ئەگەر لە دەمارەکانمدا ئاگری حەماسەت

هەڵگیرسێت و ئەو پێنووسە بگرمە دەستم کە ڕۆژانی جاران پێمدەنووسی، خەمی خێزان دێتە پێشچاوم و ئاگری حەماسەتم خامۆش دەکات.

سوکەڵەبووم و دووباڵم هەبوو لە خەون و ئاواتەکانم، چوارکچەکەم و دایکیان و پورەکانیان و پوری باوکیان پشتیان قوورسکردم، باڵەکانم دایان بە ئەرزی واقعدا، سێبەری خەونەکان و درۆی ئاواتەکان بەدیارکەوت، هەردوو باڵەکە شکان، کەسێک خەمی هەشت ئافرەتی هەڵگرتبێت چۆن بەبێ باڵ دەفڕێت؟
ئێستا دەوەستم و حساباتی خۆم دەکەم هەتا بزانم چیم قازانج کردووە و چیم لە دەستداوە!

ڕیساله فەزڵی زۆرە بەسەرمەوە و شوێنی منی لەناوخەڵکیدا ڕۆشنکردەوە و ناوی منی بردە شارانێک کە ناویشیانم نەبیستبوو، ناوبانگ و پلە و شکۆمەندی ئەدەبی پێبەخشیم، کۆمەڵێک برای لە چەندین شوێن پێناساندم کە نەچوومەتە ناوی و گومانیشم وایە ناچم، پەیامەکانیان لەبەردەستمە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە، لە ئێران و ئەندەنوسیا و یابانەوە، دەزانن ڕیساله لە یابان فرۆش و خوێنەری هەیە؟ لە تونس و جەزائیر و مەراکیش و ئەمریکا.
جارێکیان وتارێکم نوسی لەبارەی((ژیانی ئەدەبی لەدیمەشق)) ڕیساله دە پەیام زیاتری پێگەیبوو لە بارەی ژیانی ئەدەبییەوە لەو



شارانەدا، جارێکیان موناقەشە لە نێوانی من و ئوستاز موحسین بەزاریی( بوو بەسەرۆک وەزیرانی حوسنی زەعیم، پاشان وەفاتی کرد) لە جاواوە پاڵپشتیم بۆ هات، ئەوەش ڕۆژنامەی (برس) ە لە شیراز بەش بەشی کتێبەم بڵاودەکەنەوە بە زوبانی فارسی بە پێنووسی ئەدیبی فارسی ئوستاز ئەحمەد ئارام، لەگەڵ پەراوێز نووسین لەسەری لە ستایش کردن و پاڵپشتی کردنی بە هۆنراوە و پەخشان، منەتی پێدەکات بەسەر خوێنەراندا، نزیکە وەرگێرانی بۆ بکرێت بۆ ئەوردەیی، ئەگەر ڕیسالە نەبوایە هەموو ئەمانە نەدەبوون.

بەڵام سوودی هەموو ئەمانە چییە؟ ناوبانگ چییە؟ پلەوپایە چییە؟

ئێستا ئەم وتانە دەنووسم لە خانویەکی تەنهادام لەم شاخەدا نەخۆشم و تەنیام، ئایا ناوبانگ نەخۆشییەکی لێدوورخستوومەتەوە یان پلەوپایە بێزاری لێدوورخستومەتەوە؟ لە دیمەشقیش هەر بەوشێوەیە بووم؛ ماوەی چەندین ساڵە لە بازنەیەک بەتاڵدا دەژیام کە نزیکە ماڵەوە و دادگا تێنەپەڕێنێت، تەنانەت ڕۆژی هەینی و ڕۆژی پشووش دەچووم بۆ دادگا، وەک ئەو کەرەی بەشەڵتەکەیەوە ڕێدەکات، ئەگەر گوریسەکەی ملیشی لێبکەیتەوە هەر دەسوڕێتەوە چونکە پەیوەستە بە گوریسێکەوە کە بەچاو نابینرێت.

چ سوودێکم پێدەگەیەنێت ئەگەر من تەنهابم و سەد هەزار کەس لە شارەکاندا ستایشم بکەن؟ چ زیانێک دەکەم ئەگەر سەرزەنشتم بکەن یان ناومیان نەبیستبێت؟ چ سوودێک دەکەم - لە دیمەشقدا وەک بێگانەیەک بژیم- و (ئەمە واقعە، و شانازی ناکەم) لە دەکەس کە بەهەر شەقامێک لە شەقامەکانیدا ڕێدەکەن بەلایەنی کەمەوە پێنجیان دەمناسن.

ڕۆژنامەکان هەفتەیەکی تەواو سەرقاڵی جوێندان و قسە پێوتنم بوون لە لاپەڕەی یەکەمیاندا بەهۆی وتارە بەناوبانگەکەمەوە، ڕۆژانی هەڵبژاردنی ساڵی١٩٤٧ بەهەمان شێوەیان کرد و هەندێ تەنگیان دایەپاڵم کە شەیتان ناشرین دەکات، خوێنەران بەڕاستم دەزانن کە گوێم پێی نەداوە، تەنانەت زۆربەیم نەخوێندەوە؟ سوێند دەخۆم ئاوابووە! چەندین جار ڕۆژنامەکان جوانترین ستایشیان کردووم و هەندێ شانازییان داوەتە پاڵم کە فریشتەکان دەڕازێنێتەوە گوێشم بەمەیان نەدا، چونکە هەر دووسەرەکەی سەرکۆنەکراوە، ستایشکردن ئەگەر زیادبکرێت وەک هەجوو وایە ئەگەر زیادبکرێت، هەردووکیان لە درۆوە نزیکترن، نە فریشتەم نە شەیتان، چاکە و خراپەم هەیە، لە هەموو کەسێک باشتر خۆم دەناسم.

* * *

دووبارە دەپرسمەوە: ناوبانگ چییە؟



ناوبانگ وەهمێکە و لەبازاڕی هەقیقەتدا هیچ نرخێکی نییە و لە تەرازووی واقعدا هیچ کێشێکی نییە، تەنانەت ئەم پیشەیە زوبان ڕاست ناکاتەوە....

ناوبانگ سەرابێکی هیچە. وەک داهاتوو وایە کە هەموو خەڵکی شوێنی کەوتوون و هەرگیزیش پێی ناگەن، چونکە ئەگەر پێی بگەن دەبێت بە ئێستا و دووبارە بەدوای داهاتوویەکی تردا دەگەڕێن، وەک ئەو چەپکە گیایەی بەستراوە بەسەری ئەسپەوە، بەردەوام هەوڵدەدات پێی بگات!

ئەمە لە ناخی دڵمەوە دەڵێم و باوەڕم پێیەتی، سەردەمانێک بەسەرمدا تێپەڕین شیرینترین ئاواتم ئەوەبوو بەڕێگادا بڕۆم و خەڵکی بڵێن: "ئەوە عەلی تەنتاوییە"، بچمە سەر هەموو مینبەرێک، ناوم لە هەموو ڕۆژنامەیەکدا هەبێت، دڵم بۆ جوانی و خۆشەویستی والآدەبوو، کە هەموو ئەوانەم ئەزموون کرد و چێژەکەیم چەشت هەموو ئاواتم ئەوەبوو لە خەڵکی ونببم و لە نێوانیاندا بڕۆم و کەسیان نەمناسن.

تەمەنێکی زۆرم بەڕێکرد، ژیانم بینی و خۆشی و ناخۆشیم چەشت. هیچ چێژێک نەماوە ئیللا چێژم لێی بردووە، نە چێژەکان بەردەوام بوون نە ئازارەکان، نە ناوبانگ سوودی هەبوو نە پلەوپایە.

دووجەنگی جیهانییم بینی، دەوڵەتە یەک لەدوای یەکەکانی شامم بینی لە عوسمانییەکانەوە هەتا فەڕەنسیەکان و ئەوانی دواترییان، لەوەی هەستا و دانیشت، لەوەی هات و ڕۆیی، ئەگەر وەزارەتم بویستایە ڕێگاکەیم دەگرتە بەر و سەردەمانێکبوو بەدەستمهێنابوو، وەک چۆن پێی گەیشتن ئەوانەی لەدوای منەوە هات لە خوێندن و لە ژیاندا، ئەگەر بمویستایە دەبوومە ئەو شێخانەی دەستیان ماچدەکرێت و پاشان پڕدەکرێت لە پارە، خاوەنی بۆنی خۆشی و ئۆتۆمبێلی گرانبەهان و بە پیشەی ئایین دەبن بە کوڕەگەورەکانی دونیا! بەڵام شتێکم نەبینی بەردەوام بێت. وەزارەت دەڕوات و تەنها حەسرەت لە دڵی خاوەنەکەیدا جێدەهێڵێت، خەڵکی بە ئاگادێنەوە و دەزانن ئەوانەی بەهۆی ئایینەوە دونیا دەخۆن ناگونجێت لە پیاوچاکان و چاکسازان بن.... پشتمکردە پلە و پۆست و شێخایەتی، سانابوویەوە بۆم و لەبەرچاومدا بچووکبویەوە، تەنها یەک شتم لەم دونیایەدا بۆ ماوە: بە ئاگاییەکی دڵ، کە درکی هەقیقەتەکانی وجودد و ئامانجی ژیانی کردووە و ئامادەکاریی دەکات بۆ دوای مردن. چ کارەساتێکە دڵت بە ئاگابێت لەم جیهانە مادییەدا!

ئەو کەسەی دەچێتە سەر لوتکەی شاخەکان ئاڕاستەیەکی تری بۆ ئاشکرادەبێت و ئەودیووی لێژبوونەوە دەبینێت، ئەوا من گەیشتوومەتە لوتکەی تەمەن و لێژبوومەتەوە وەلێ هیچم نەبینی....ڕێگاکە بە



دووکەڵ داپۆشراوە، لە قەرەباڵخی ژیان و تەڵخی گوزەراندا چراکەم لەدەستداوە!

***

ڕیسالە فەزڵی هەیە لەسەرم و چاکبووە بۆم. سکاڵام لەئەو نییە، بەڵکوو سکاڵام لە سەردەم و دەروونمە، هەقە لە جەژنی هەزاری ڕیسالەدا سڵاوێک بکەم باشتر لەم سڵاوە، بەڵام من بەدەستێکی نەخۆش و بیرێکی ماندووە دەنووسم، لەلای ئوستاز زەیاتی هاوڕێی مەردم پۆزشێکی جوانم هەیە.

***



# لە پەیامەکانی هاوین

زنجیرەکە بابەتێکبوو لە سالی١٩٢٢ لە ((ألف باء))بلاومدەکردەوە، تەنها ئەم پەیامە و پەیامێکی ترم لەلا ماوە، ئەوانی تری وەک وتارەکانی ترم ونبووە لێم.

بۆ هاوڕێم( فلانەکەس):

نازانم لە کوێوە دەست بکەم بە قسە زۆرەکانم و لەم پەیامەدا ڕۆیی بکەم؟ دەترسم بە شێواوی و نارێکی بگاتە لات و هەندێکی تێکەڵ بەوی تربوبێت، هیچی لێتێنەگەیت. من - وەک پەیمانت لێوەرگرتم پێش ئەوەی بچیت بۆ هاوینە هەوارەکەت و کاتێکی خۆشی تێدا بەسەرببەیت و وەک چۆن هەموو هاورێکانم پەیمانم لێوەردەگرن- پیاوێکی فەوزا و شێواوم، دەڕۆم بەرەو شوێنێک و دەمەوێت بچم بەرەو ئەوێ، دوورناکەومەوە هەتا شەپۆلێک لە شەپۆلەکانی ژیان بەرەو شوێنێکم دەبەن کە مەبەستم نییە.....چیمداوە لەوەی باسی خۆمت بۆ بکەم پێش ئەوەی لێت بپرسم: ئەی تۆ چۆنیت؟ ئارامیت لەو ژیانەتدا لەو شوێنە دلڕفێن و دڵگیرە، قایلیت بە دانیشت لەسەر بەرد بەفقێن و ئەو تەختاییەی لەژێر تاچتدا کە وەک فەرشی

ئاوریشم وایە........ یان بێزاریت لەو تەنیاییە و بیری قەرەباڵغی شار دەکەیت؟ ئایا سروشت- وەک دەڵێن- کانیێکی زیندووە و خەمۆکی و بەها و خەفەت و دڵخۆشی هەیە؟ ئایا بەها و خەمۆکیەکەی فراوان دەبێت بۆ ئەوەی هاوڕێیەتی دەکات و خۆی دەخاتە ئامێزییەوە؟ من ئەمە بە ئەفسانە دەزانم، باوەڕم وایە ئەوە مرۆڤە (تکام وایە گوێبیستی ئەم وشەیە ببیت، من یەکەم کەس نیم کە لە شوێنی خۆیدا بەکاریدەهێنم) ئەم واتەیە دەبەخشێت بە سرووشت، بە ڕووخۆش و مژدەدەر دەیبینێت ئەگەر خۆی ڕۆخۆش و مژدەدەربێت، بە خەمباری و تاریکی دەیبینێت ئەگەر دەروونی چڕوتاریک بێت. خەریکە باوەڕ بە قسەی ئەو شێتە ئینگلیزییە دەکەم بارکلی( وشەی شێت تووڕەت نەکات، عەبقەرییەکان گرنگیان پێداوە!) ئەوە دەڵێت: دونیا پەڕمیەکی سپییە وەک پەڕەی سینەما، هیچ شتێکی تێدانییە بەڵکوو وێنەکانی لە سندووقەکەوە دەخرێتە سەری. سندووقی ژیانیش سەری من و تۆ و سەری براکانمانە لە ئەندامانی کۆڕی ئەدەبی، بە یارمەتی ئەو خودایەی ئێمەی کردوو بە ئەدیب دەتوانین دونیا ببینین بە غەیری ئەو شێوەیەی خودا ئافراندێتی، هەموو شتێک بە پێچەوانەوە وەربگرین، شت گەلێک دابهێنین وەک خۆشەویستی پاک، کە هیچ شوێنەوارێکیش نییە بەڵگە بێت بۆی ئیللا مێشکە پاکەکانمان و پەڕەی کتێبەکان نەبێت.

ئەوە چیتە نیگەران بوویت و چوویتە پرسیارت کردووە لەم کۆزانە. ئەرێ ساتێک ناوەستیت هەتا باسەکەیت بۆ باس بکەم: هاوڕێکەم ئەم کۆزانە دامەزراوە و پێکدێت لە سەید مونیر عیجلانی (سکرتێرە) و سەید محەممەد جیرۆدی (خازینە) بەڕێز ئەنوەر عەتار و میشێل عەفلەق و سەعید ئەفغانی و بەڕێز خۆم (ئەندامی بەڕێوەبردنین) و، بەڕێز زەرکەلی و جەمیل سوڵتان و حیلمی لەحام و زەکی مەحاسینی و مستەفا مەحایری (ئەندامانی کارکەرن)... ئەمانە دەستەی دامەزرێنەرانن، و ئەم بەڕێزانەش هاتوونەتە ناوی: کامل عیاد و مستەفا عیزەم و ئەنوەر خاتەم، هەموو ئەمانە بێ پێویستن لە ناساندن.

سەبارەت بە ئامانجی ئەم کۆزانەش ئامانجی ژیانەوەی ڕووحی ئەدەبییە لەم شارەدا و هاوکاریکردنە لەسەر بەرهەمهێنان، قۆڵ گرتن و هەستناوەی هەموو ئەو ئەدیبە بلیمەتانەی ڕێگرییەک لە ڕێگرییەکانی زەمانە داینیشاندووە و، دوورستکردنی ئەدەبێکی نوێی بەهێز، نوێبوونەوە وەک ئەوەی تێی گەیشتوین(یان وەک ئەوەی من تێیگەیشتووم بەلایەنی کەمەوە) ئەمەش بە پەیوەندی پچڕان نییە لەگەڵ ڕابردوودا و دەرچوون نییە لە قەواعیدی عەرەبی و شێوازی عەرەب لە قسەکردنیاندا، بە بانگەوازکردنی گەمژەکانیش نییە بۆ زمانی عامە و ڕووخاندنی قەواعیدی نەحو و ئاشکراکردنی ئازادی زمان و هێنانە خوارەوەی فاعل کە بەدرێژایی سەردەم بێزاربووە



لەبەرزی و بەرزکردنەوەی مەجرور کە چەندێکە لە خوارەوەیە و زەلیلە.....نەخێر. ئەمە ناونانێم نوێبوونەوە بەڵکوو ڕووتێتی و گەمژایەتییە. زمان دەبێت وەک خۆی بمێنێتەوە لە یاسا و ڕێساکانیدا، لەدوای ئەمەوە چیمان بوێت لە ڕێگا و بیرۆکە و کتێبی نوێی بۆ زیادبکەین، واتە هەمان ئەو شتە ئەنجام بدەین کە عەرەب لە بەرەبەیانی دەوڵەتی عەباسییەکاندا ئەنجامیاندا ئەوکاتەی وەرگێڕانیان بۆ کتێبە یۆنانی و فارسییەکان کرد و کردیان بە عەرەبی، لەبەر ئەوان زمانەکەی خۆیان نەکرد بە یۆنانی و فارسی یان زمانێکی شێواو، ئەو زمانەی دەیبینین لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا زمانی مەیمونییە کە وەرگێڕانی ئەدەب و شیعری ئینگلیزی و فەڕەنسی پێدەکەن، دەبێت یەک کاتژمێر تەرخان بکەیت بۆ ئەوەی لەبڕگەیەکی تێبگەیت دواتریش هەر لێی تێناگەیت!

کەواتە یەکەمین مەرج لە مەرجەکانی نوێگەری پاراستنی ئەو پەیوەندییە کە لە نێوان ئەدەبی ئێمە و ئەدەبی عەرەبیدایە، ئەمەش تەنها بەوەدەبێت کۆمەڵێک لە ئێمە داببڕێت بۆ کلتوری ئەدەبی بەپێزمان کە هەندێ لە نەزانەکان پێی دەڵێت کلتوری کتێبە هیچەکان. بەڵێ، پێویستە لەسەر کۆمەڵێکمان داببڕێت بۆ ئەو کتێبە هیچانە بیخوێننەوە و بەتەواوی لێی تێبگەن؛ پێویستە کتێبی نەحو بخوێنینەوە نەک تەنها لە پرۆگرامەکانی خوێندندا بەڵکوو لە(

المغني و الأشموني و كتاب سيبويه و مفصل للزمخشري)دا.
کتێبەکانی لوغە بخوێنینەوە، کتێبە گەورەکانی ئەدەبی عەرەبی بخوێنینەوە وەک ( الأغاني و الكامل و البيان و الأمالي)، کتێبی بەلاغە و أصول و مەنتق بخوێنینەوە، بۆ نموونە لە تەفسیردا کتێبی کەشاف بخوێنینەوە و لەفەرمووددا کتێبێکی تر بخوێنینەوە، کتێبێکی فراوانی لوغەمان لەبەردەستدا بێت وەک(( اللسان یان التاج یان القاموس)) بەلایەنی کەمەوە، ڕۆژانە دەجار بگرێینەوە بۆی......لەوەیە تۆم ترساندبێت و کەوتبێتمە وەهمەکەتەوە کە من دواکەوتوم چونکە هەموو ئەمانەم لەسەر ئەندامەکان پێویستکردووە!
نەخێر بەڕێزەکەم؛ لەسەر کەسی پێویست ناکەم بەڵکوو وادەزانم فەرزی کیفایەیە لەسەرمان، پێویستە هەندێک لە ئێمە بەم ئەرکە هەستێت وەک چۆن هەندێک فێری تێگەیشتن لە ئەدەبی ئینگلیزی یان فەرەنسی دەبن و لێکۆڵینەوە لە ڕێبازی ڕەخنە و بنچینەکانی شیکردنەوە دەبن و لەسەر ئەدەبی ئێمە جێبەجێدەکەن، وەک چۆن دەبینین زۆرێک لە ئێمە لەم ڕووەوە کاردەکەن وەک سەید عیجلانی و عەفلەق، هەندێکی تر دەبینین وەک سەید ئەفغانی و جیرۆدی و من لە ڕوویەکی ترەوە کاردەکەن، خەریکە متمانە دەکەم بەوەی ئەفغانی و جیرۆدی لە ئێستاوە قبوڵی ناکەن بە درک و تێگەیشتن بۆ ئەم زانستە ئیسلامییە عەرەبییانە بۆ ئەو کەسەی بیست ساڵی ژیانی تەرخان کردووە بۆ لێکۆڵینەوە تێیدا، ئەگەر قایل بوون دووبارە لێکۆڵینەوەی لێبکەن و بۆی دابڕێن ئەوا



لەوان و لەهاوشێوەکانیان ئەو چینە لە ئەدیبەکان کە ئوستاز ئەحمەد ئەمین بە ئازاربوو بۆ لەدەستدانی لەمیسر و بانگەوازیکرد بۆ بونیادنانی.

***

لەدوای هەموو ئەمانەوە، لەوەیە بێزارمکردبێت بەم قسانە، لەوەیە بۆشبن و هیچی تێدا نەبێت، داوای لێبووردن دەکەم لەتۆ و هاورێ خوێنەراکانم و تکام وایە قسەم زۆر پێنەڵێن.....بە هیوای دیدار هەتا پەیامێکی تر لەمە پوچیەکەی کەمتربێت!



# له پانتایی دەریادا

له ساڵی ١٩٥٥دا بڵاوكراوەتەوە

عەلی تەنتاوی مرد.....

.....هیچ سەیرنییە مردبێت، مردن كۆتایی هەموو زیندوویەكە، بەڵكوو ئەوە سەیرە لە دوای مردنی بگەڕێتەوە و پەسنی ئەو مردنە بكات كە بینویەتی بۆ خوێنەرە موسڵمانەكانی!

ئەمەش پێش دوومانگ بوو، لە كەناری دەریادابوو لە بەیروت، دەریاكە تووڕەبوو شەپۆلەكانی فڕێدەدا وەك تەپۆڵكە وابوو، خەڵكەكە ڕایانكردبوو لێی لە هەموو كەنارەكاندا- بە درێژ و پانییەوە( لە سان سیمۆن هەتا ئەوزاعی) - تەنها هەندێ خەڵكی لێبوو.

هیچی لە مەلەوانی نەدەزانی تەنها یەك وانە نەبێت، ئەویش پێش سێ یەكی سەدەیەك فێربووبوو لە مامۆستایەكەوە كە هەرگیز مەلەی نەكردبوو، ئەویش بەو شێوەیە بوو كە لە شوێنێكدا بوەستێت

ئاوەکە نەگاتە سەر سنگی، پاشان هەوڵبدات بەدەمدا بکەوێت و قاچەکانی جووت بکات و بەدەستەکانی بکێشێت بە ئاوەکەدا، بەم شێوەیە بمێنێتەوە بە ئەندازەی ئەو ئاوەی قووتی دەدات لە ئاوی دەریاکە( کە وەک خواردنەوەی خوێی ئینگلیزی وایە) کە گەدە و لوتی پڕدەکات....پاشان دەرچێت! گەنجێکی تونسی لەگەڵدا بوو لە زاناکانی مزگەوتی زەیتوونەبوو، لە مەلەوانیدا لە ئەو نەزانتر بوو، تەنانەت ئەو وانەش فێرنەبووبوو چونکە ئەو کاتە لە دایک نەبووبوو، کاتێکیش گەورەبوو نەیتوانی وانەی هاوشێوەی وەربگرێت چونکە ئەو ((مامۆستایە)) مردبوو.

شوێنی مەلەکردنەکەیان بەجێ هێشت چونکە ئافرەتەکان بە ڕووتی پاڵکەوتبوون و کەوتبوونە سەردەم، قاچیان بەرزکردبۆوە و عەورەتیان دیاربوو، لە پشتی بەردە گەورەکەوە بەدوای شوێنێکی دوور لە خەڵکی دەگەڕان، ئاوەکەی وەک ئەستێڵێکی سەلامەت و ئارامی لێهاتووە و شەپۆلەکانی پێ ناگات و منداڵێک نقووم ناکات، چوونە ناویەوە. وتی:

دەستم کرد بەو مەلەکردنەی دەیزانم، قاچم بەرزدەکردەوە و دەستم دەجوڵاند، هەر کە هیلاک دەبووم دەردەچووم و چێژم لە خۆر و هەوا وەردەگرت. تەواو لەشساغ و تەندرووست بووم، لە چالاکیمدا هەڵدەبەزییمەوە، هەستم دەکرد زەوی بە پاڵنان پاڵم پێوە دەنێت.

مردنیش دووربوو لە بیرم، بەردەوام مردن دوورترین شتە لە بیرماندا، ئەگەرچی نزیکترین هەقیقەتە لێمانەوە، لە بیری دەکەین لە کاتێکدا لەلای ڕاست و چەپمانە، جەنازە بەڕێ دەکەین و لەگەڵیدا دەڕۆین بێ ئاگایین و باسی دونیا دەکەین، مردن دەبینین بیرناکەینەوە و پەند وەرناگرین، وای دانانێین ئێمەش دەمرین وەک چۆن ئەمانیش مردن و کەسانێک مردن کە لە ئێمە لەشساغ و بەهێزتر و دەسەڵاتدارتر بوون لە ئێمە هاوکارییان زۆرتربوو، ئەوکاتەی مردن هات بۆیان تەندرووستی و هێز و دەسەڵات و هاوکارەکانی نەیانتوانی مردنی لێی دووربخەنەوە، بە ئاوەزی خۆمان دەزانین کە مردن کوپێکە و هەموو زیندوویەک لێی دەخواتەوە، بەڵام بە هەست و سۆزەکانمان ئەم هەقیقەتە لە بیردەکەین و سەرقاڵی دونیا و شتە پووچەکانین، دونیاکەمان دوورماندەخاتەوە لێی، هەموو بەزاری خۆی دەڵێت: مردن هەقە و لەسەر هەموو کەسێک نووسراوە کە دەبێت بمرێت، بە کردارەکانی دەڵێت: نامرم، مردن لەسەر هەموو نەفسێک نوسراوە نەفسی من نەبێت، بەردەوام فراوانییەک لە تەمەنمدا هەیە و هەرگیز ئەجەلم نایەت.

چوومە ئاوەکەوە و زۆر تێیدا مامەوە و، هەستم نەکرد- بست بەبست دووردەکەومەوە- ئەو ئەستێلەم تێپەڕاندووە و گەیشتوومە شوێنێکی قوڵی دەریاکە، دواتر زانیم تەیارێکی تێدایە مەلەوانە بە تواناکان

دەپارێزن، ئەی دەبێت حاڵی ئەو کەس چۆن بێت کە لە مەلەوانی نازانێت تەنها هونەری نقووم بوون نەبێت؟

هەوڵمدا بوەستم بەڵام زەوییەکی ڕەق لە ژێر قاچمدا نەبوو، هەوڵمدا سەرم بەرزبکەمەوە و بڕوانم نە هەوام بۆ دەهات و هیچم نەدەبینی، هەستم دەکرد ئاوی سوێر لە دەم و لوتمەوە دێتە دەرەوە، تەنها دەمتوانی قوتی بدەم و بیتفێنمەوە. ئیتر لێرەوە هەستم بە ئازارێک دەکرد کە وێنا ناکرێت و وەسف ناکرێت، بە تەنها لەسەرم یان لە ئەندامێکی جەستەمدا نەبوو، بەڵکوو لە هەموو خانەیەکی جەستە و ڕووحمدا بوو...هەستم دەکرد بەردێکی گەورە خراوە بەسەرمدا و دەمارەکانم لە ژێریدان و دەیبڕێت وەک چۆن بەنی ئاوریشم دەپچڕێت ئەگەر دڕکی تێکەڵ بێت! هەموو خەمی دونیام ئەوەبوو کزەیەکی هەوام دەست بکەوێت وەلێ دەستم نەکەوت، وتم: ئەمە مردنە، ئەمە ئەو مردنەیە کە ڕادەکەم لە قسەکردن لەبارەیەوە، ئەو مردنەی کە دەمبینی دووره لێمەوە و کاتی نەهاتووە و مۆڵەتەکەی نەهاتووە، هەر لەبەر ئەمەش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ تەوبەم دوادەخست، دەموت: ئەگەر گەشتمە تەمەنی گەنجی تەوبە دەکەم، کە پێی گەیشتم وتم: لە چل ساڵیدا تەوبە دەکەم، کە تێمپەڕاند وتم: چاوەڕێ دەکەم هەتا خانووەکەم تەواو دەکەم، کە تەواوم کرد وتم: تەوبە دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆلای خودا ئەگەر گەیشتمە تەمەنی خانەنشینی....وەک ئەوەی پەیمانێکم لە فریشتەی ڕووحکێشان



وەرگرتووە کە لە دەرگام نەدات هەتا دەگەمە تەمەنی خانەنشینی، ئەوەتا بەبێ هیچ ڕێکەوتێک هات!

یەکەمین شت کە بەهەستمدا هات ئەوەبوو کە من ئاواتە خوازبووم بە ئاسانی و لەسەر ئیمان بمرم، چەندین سەردەمە ئەمە ئاواتمە، ترسام کە خۆم هاتبم بەرەو ڕووی ئەم مردنە و پەنا بە خودا بەخۆکوژی لەسەرم هەژماربێت. بیرم لەوەکردەوە پێش ئەوەی بێمە ئاوەکەوە چیم ئەنجامداوە، هیچ شتێکیم بیرنەماوە، هەستم دەکرد سبەینێ لێم دوورە وەک ئەوەی سەدساڵ لێمەوە دووربێت نەک چەند خولەکێک، دونیا لە چاومدا بچووکبوویەوە وەک ئەوەی لە فڕۆکەیەکدابم و لەسەرووی هەورەکانەوە دونیا ببینم. ئەو کەسەی بەتەمای گەشتە پەلەدەکات بۆئەوەی بەخێرایی بگات بە شەمەندەفەرەکە، ئایا ئەو شەقامانە دەبینێت کە پێیدا تێدەپەڕێت؟ جوانی کەسەکان و هونەری ڕێگاکە سەرنجی ڕادەکێشن؟ هەست دەکات نامۆیە پێی یان بۆ ئەو نییە، دیمەنەکانی لە چاویدا وەک وێنەیەکی گوزەشتوو وایە، ئەو کەسەی دڵنیاییە دەمرێت چۆن تەماشای دونیا دەکات؟

سوێند بەخودا وێنەی دونیا لەبەرچاومدا سڕایەوە. تەنها چەند ساتێکی کەمم لە دونیادا ماوە، منیش پەرداخی خەم نۆش دەکەم؟ هیچ شتێکی تێدا نەماوە سەرنجم ڕابکێشێت، بەهۆی سەرقاڵییەوە بە



خۆمەوە تەنانەت بیرم لای خێزان و منداڵەکانم نەمابوو، ئەو وتانەی چیرۆکەکان بەڕاست مەزانن کە باسی ئەو کەسانە دەکات لە لێواری خنکاندایە و بیری لای خۆشەویستانیەتی یان کارەکەیەتی یان لەلای ئەدەب و زانست و وتار و هۆنراوەکانییەتی، یان گرنگە بەلایەوە لەدوای خۆی چی لەبارەوە دەڵێن، لەوەیە ئەمە موسڵمان نەبووبێت، لێ ئەو کەسەی موسڵمانە لەوساتەدا تەنها ئەوە دەبینێت کە بەرەو ڕووی دەڕوات.

ڕازەکان قەرەباڵەخییان لەسەرم کرد لەوەی چی ئەنجام بدەم، هەوڵمدا سەرەتا شایەتوومان بهێنم و تەوبەبکەم، نەمتوانی هیچ شتێک لەوانە بڵێم چونکە دەمم پڕی ئاوبوو. ئازارەکانم زیاتر دەبوون، لێ ڕازەکانی نەدەبڕییم، لە هزرمدا هەستم بە چالاکیەکەی سەرسوڕهێنەر دەکرد کە لە هەموو تەمەنمدا هەستم پێی نەکردبوو، لە نێوان ترسان لە مردن و حەزکردن لێی بووم: حەزم لێی دەکرد ئومێدم وابوو ئەم مردنە لەسەر ئیمان بێت، دەترسام چونکە هیچم پێنەبوو بۆ بەردەمی خودا، وەک چۆن تاقیکردنەوە بەرۆکی خوێندکارێکی ئیهمال دەگرێت، خوێندنەوە و ئەزبەرکردن دوادەخات و دەڵێت: تاقیکردنەوە دوورە.......و ڕۆژەکان تێدەپەڕن، هەتا کە دەیبینێت لە پەشیمانیدا پەنجەکانی دەقرتێنێت و نەفسی لە حەسرەتدا دەڕوات، ئەمەش هیچ سوودێکی پێناگەیەنێت.

ئەمە تاقیکردنەوەیەکی سادەیە خراپترین شتی ناوی ئەوەیە کە بکەویت و ساڵێکی تەمەنت بەفیڕۆ بچێت، ئەی ئەو تاقیکردنەوە گەورەیەیەی کە لەدوایەوە یان نیعمەتێکی نەبڕاوە هەیە لە بەهەشتدا، یان بەدبەختێکی درێژە لە ئاگردا؟ ئەو تاقیکردنەوەی کەوتنی تێدا نییە و خولی دووەمی تێدانییە و بە نمرەیەک تێیدا دەرناچیت، تکای تکاکاران و واستەی خاوەن دەسەڵات و سەروەتەکان هیچ سوودێکی نییە؟ وەستانی لێپێچینەوەم بە چاوی خۆم بینی، هەر کەسەو بەخۆیەوە قاڵبوو، خەڵکەکان بانگ دەکران بۆ ئەوەی ئەنجامی تاقیکردنەوەکانیان وەربگرن، ئەوەی کتێبەکەی بە دەستی ڕاست وەردەگرت و بەڕێ دەکرا بۆ بەهەشت ئەوە براوەبوو، ئەوەی کتێبەکەی بەدەستی چەپ وەردەگرت و بەرەو ئاگر بەڕێکرا ئەوە خەسارەتمەندبوو، ئەوە خەسارەتمەندێکی تەواو دیارە.

کردەوەکانم پێشاندران هیچ کردەوەیەکم لە کردەوەی پیاوچاکان نەبوو، لەوانەش نەبووم کە بە ئەندازەی چاو تروکاندێک لە خودا غافڵ نابن، لەو کەسانەش نەبووم کە پەرستشکارن ئەو دەمەی خەڵکی خەووتون، شەونوێژدەکەن و موناجات دەکەن لەگەڵ پەروەردگاریاندا، لەو لە خواترسانەش نیم کە لە قەدەغەکراوەکان بەدوورن..... هیچ شتێک نییم ئیللا یەکێک نەبێت لە بێئاگا تاوانبارەکان، بەچی شتێکەوە بچمە بەردەم دیوانی خودا؟



ڕوانیم تەنها چەند ساتێک لە تەمەنم قازانجم کردبوو، ئەوساتانەی هەستم بەشیرینی ئیمان دەکرد و بەدڵسۆزییەوە ڕوومدەکردە خودا، هاوتای دەیان ساڵبوو کە لە دەریای غەفڵەتدا مەلەم دەکرد، لە نەزانینی خۆمدا وامدەزانی ڕۆژەکان درێژدەبنەوە لەبەردەممدا، نەمزانی تەمەن چەند کاتژمێرێکی دیاریکراوە و ئەوە هەموو سەرمایەکەمە، ئەگەر لە دەستی بدەم لەدوای ئەوەوە هیچ شتێکی ترم بۆ نامێنێتەوە.

ئەو فەرموودەم بەبیرهاتەوە کە لە منداڵیدا لەبەرمکردبوو: " پێنج شت پێش پێنج شت بەدەست بخە: ژیانت پێش مردنت، تەندروستیت پێش ناساغیت، بۆشاییەکانت پێش سەرقاڵیت، گەنجیەکەت پێش پیربوونت، دەوڵەمەندیت پێش هەژاریت" پەشیمان بووم لەوەی کە نەمکردۆتە گوێی مەجلیسم و نەمکردە پەیڕەویی ژیانم، لێ بەداخەوە واتا هەقیقیەکەتم نەزانی هەتا ئەوکاتەی ژیانم کۆتایی پێ نەهات.

بیرم لەو ناڕەحەتییانە کردەوە کە لە کاتی گوێڕایەڵیدا چەشتوومە، ناڕەحەتییەکە ڕۆیشتبوو، پاداشتەکەی مابوو، ڕوانییم لەو چێژانەی لە تاوان بینیوومە، بینیم چێژەکەی ڕۆیشتووە و لێپێچینەوەکەی ماوە؛ پەشیمانبووم لە هەموو ئەو ساتانەی تێیدا گوێڕایەڵ نەبووم.

تەماشام کرد لە ساتی مردندا هەموو پێوەرەکان دەگۆڕێن، هەموو ئەوانەی خۆشمدەویست و بەرگرییم لێیدەکرد بوون بە عەدەم! هیچم لەگەڵ خۆمدا نەبرد؛ خانوویەکم بونیادنا و بەردێکم لەگەڵ خۆمدا هەڵنەگرت، سەروەتم کۆکردەوە هیچی بۆ من نەبوو تەنها ئەوە نەبێت کە پێشتر گومانم وابوو لەدەستمداوە، ئەویش ئەوانەبوو کە بۆ خودام بەخشیبووم، لە ماوەی دە ساڵدا هەزارەها وتارم نووسی، ملیۆنەها بیسەر و خوێنەرم هەبوو، تەنها ئەوە سوودی پێگەیاندم کە لە پێناوی خودادا وتبووم، ئەوانە لە کوێن؟ ئەوانەی سەرسامی ئەدەب و ڕەوانبێژییەکەم بوون بەجێیانهێشتم و ئێستا بە تەنیا دەمرم، کەسیان نەهاتن دەستم بگرن کەسیان نەهاتن بە هانامەوە و مردنم لێدووربخەنەوە!

هەموو چێژەکانی دونیام تاقیکردەوە، چ لە هەموو چێژەکانی دونیا بکەم لە کاتێکدا ئێستا لەم ئاوەدا دەخنکێم؟ چ شتێک بوو کە گۆڕیمەوە بە کردەوەی چاک، کە ئێستا تەنها ئومێدم بەوەیە ڕزگارم بکات؟

شەیتان لە نوێژەکەمدا خشوعی لە بیردەبردمەوە بەبیرکردنەوە لەوەی لە کاتی سوجدەدا ئتوی پانتۆڵەکەم تێک دەچێت، دەیترسانم بەوەی تەندرووستیم تێک دەچێت ئەگەر بەیانیان خەوەکەم ببڕم بۆ نوێژی بەیانی یان لە ڕۆژی گەرمی مانگی ئابدا بە ڕۆژووبم، بەوەی



خەڵکی ستایشم ناکەن ئەگەر قسەی هەق بڵێم یان ئازاری جەستەم دەدەن یان ڕۆزییەکەم دەبڕن! بینیم ئێستا خەڵکیم لەدەستدا، کە نیعمەتێکی ئەبڕاوەم فرۆشت بەم وەهمە ڕۆشتووە؛ وەک ڕەش پێستەکانی ئەفریقا کە گەنجینە و خێرو بێری دەبەخشن هەتا نقێمی جوان وەربگرن، یان کاتژمێرێکی بە ناوبانگ، یان عەنتیکەیەک لە عەنتیکەکانی شارستانی!

یان وەک دانیشتووی ئەو دوورگەیەی کە ئەمەریکییەکان ویستیان چۆڵی بکەن و بیکەنە شوێنی تاقیکردنەوەی بۆمبی ئەتۆمی و تێیدا بیتەقێننەوە، کۆمەڵێک خەڵکیان نارد بۆ لایان هەتا هەواڵیان پێبدەن و ئاگادارییان بکەنەوە کە: ئەم دوورگەیە دەڕوخێت و هیچ شتێکی زیندووی تێدا نامێنێتەوە، دەبێتەماڵێکی وێران و ئەمەریکا شوێنێکی جێگیرە، هەر کەسێک لە ئێوە خانوو و سەروەتەکەی ڕادەست بکات ئێمە لە ئەمریکا باشتری پێدەدەن و لەبری ئەو خێمەی ئێرەی ماڵێکی لە نیویۆرک دەدەینێ، فڕۆکەکان بەدوای یەکدا دێن و بۆ ئەوەی ئیوە لەگەڵ خۆیاندا ببەن و خۆتان ئامادەبکەن، چونکە کەس لە ئێوە نازانێت چ کاتێک دەگوازرێتەوە، ئەوەش بزانن ناتوانن هیچ شتێک لەگەڵ خۆتاندا ببەن ئیللا ئەوە نەبێت پێشتان خستووە، دێتەوە ڕێتان.

کەسی ژیر ئەوەی هەیە خەرجی دەکات، دەزانێت ئەوەی ئەمڕۆ دەیبەخشێت هەر ئەوەیە سبەینێ بۆی دەمێنێتەوە ئەوەشی پارێزگاریی

لێدەکات و دەیشارێتەوە دەیدۆڕێنێت و لەدەستی دەدات، هەموو ساتێک ئامادەیە بۆ سەفەر.... کەسی گێلیش دەستی دەگرێت بەخێمە و کەلوپەلە کەمەکەیەوە و دەڵێت: " من لێرە دەمێنمەوە، ئەمە ماڵمە و ئەوەش کەلوپەلەکانمە، ڕۆژی پەسڵان لە ئەمەریکا تەنها درۆ ڕۆژنامەکان و ئەفسانەی ڕۆژنامەنووسەکانە، گێل نابم ئێستایەکی ئامادە بفرۆشم بە وەهمێکی دواخراو". هەموو ڕۆژێک دەبینێت خەڵکی دەفڕن بیرناکاتەوە و گومانی وایە تەنها خۆی باقییە، هەتا نۆرەی دێت و بە زۆر دەیبەن ناتوانێت بەرگری بکات و ڕێنگرییان لێبکات، ئەوەی لە دوورگەکەدا هەیبوو لەدەستیدەدات و لە ئەمەریکاش تووشی دۆزەخی هەژاری و پێویست بوون بە خەڵکی دەبێت.

ئازاری مردن بەسەرمدا زاڵبوو لە توانامدا نەما بیربکەمەوە، ڕوومکردە خودا و تەسەوری بەخشش و لێبووردەییەکەیم کرد، هیوا و خۆشەویستی ژیان بەسەرمدا زاڵ دەبوو دەست و قاچم دەجوڵاند و دەستی ڕاستم بەرزکردەوە و ئاماژەم پێی دەکرد، پاشان نائومێد دەبووم کارەکەم ڕادەستی خودا دەکرد. لەدوای لێخۆشبوون تەنها ئاواتم بەیەک شت دەخواست؛ ئەویش ئەوەبوو خودا گیان کێشانم بۆ پێش بخات، دەترسم ئەم ئازارە زۆر درێژە بکێشێت.

خەیاڵم وابوو چەند کاتژمێرێکە بەم شێوەیەم، لێ دواتر بۆم ڕوونبوویەوە لە دوو خولەک زیاتر نەماومەتەوە..... لە دوو خولەکدا هەستم بەم ئازارانە کردووە و ئەم ڕازانە بە زیهنمدا تێپەڕیوون! ئەمە یەکێکە لەو سەرسوڕهێنەریانەی خودا کردوویە دەروونی مرۆڤەکانەوە، تۆ خەوێک دەبینیت بەپێی ڕووداوەکانی بیست ساڵ دەژیت، پێنج خولەک زیاتریش نەخەوتویت.

پاشان کە هێزم نەما و خەریکبوو نقووم ببم بۆ هەمیشەیی لە خەیاڵی خۆمدا کەسێک بانگی دەکردم، هەستم کرد دەستم بەر شتێکی ڕەق دەکەوێت زانیم سوچێکی گەمیەیە، دڵخۆشبوونێک دڵخۆش بوو کە هەتا ئێستا بەوشێوەیە دڵخۆش نەبوومە، هەستم کرد بەرزدەکرێمەوە بۆ ناوی، پاشان ئاوابووم لە دەروونم ئەوانیش قاچیان گرتبووم بۆ ئەوەی ئەو ئاوەی لە گەرووومدایە بێتە دەرەوە.

بە دەروونێکی نوێوە هاتمە دەرەوە، ئامۆژگارییەکم وەرگرت ئومێدم وایە بەردەوام بێت بۆم، نرخی ژیان و هەقیقەتی مردنم زانی. ئێمە تەنها ڕووکەشی مردن دەزانین نەک هەقیقەتەکەی، وەک عەدەم دەیبینین وای دادەنێن کەسانی نزیک و خۆشەویستانمان لە چاڵێکدا ساردا داناوە و بە تەنیا بەجێمان هێشتووە و کرم دەیخوات! ئەوە ئازیزەکەت نییە بەجێت هێشتووە لە چاڵەکەدا بەڵکوو جەستەکەیەتی، جەستە پۆشاکێکە بە مردن دادەکەنرێت وەک چۆن

مار کاژەکەی فڕێدەدات، ئایا هیچ کەسێک لەسەر پۆشاکێکی داکەندراو دەگری؟

مردن گواستنەوەیە بۆ ژیانێکی گەورەتر و فراوانتر، بەرەو نیعمەتێکی نەبڕاوە یان بەدبەختیەکی دوورودرێژ، ئەگەر مردن فەنابوون بوایە نیعمەتبوو.

ئەگەر مردن سەفەرێکە و هەردەبێت بیکەین، کەسی ژیر ئەو کەسەیە خۆی بۆ ئامادە دەکات و سواری و توێشووی بۆ ئامادەدەکات و بەردەوام لە یادییەتی بۆ ئەوەی لە بیری نەکات، تەماشای هەموو شتێک دەکات، ئەگەر لەوشتانە بێت لە توانایدا بێت هەڵیبگرێت سووردەبێت لەسەری، ئەگەر ناچاربێت پشتگوێی بخات بێ پێویست دەبێت لێی و پشتی تێدەکات.

لەدوای هەموو ئەمانەوە، کەس پیرۆزبایی نەکات بەوەی سەلامەت بووم، بەڵکوو دوعا بۆخۆی و من بکات بە عاقیبەت خێری، سوێند بە خودا من دەترسم لە کاتێکدا بمرم کە دڵم لەلای خودا نەبێت، هەست بە تەوبە نەکەم، وێنای ڕۆژی پەسڵان نەکەم، وەک ئەمجارەی بەسەرمدا هات.

***



# سکاڵا

له ساڵی ١٩٥٩دا پەخشکراوە

ئەمە سکاڵایە. بەڵام لە کێ؟ بۆ کێ؟ خۆشم نازانم؟

ئێستا گوێ بیستی بانگی بەیانیم و لە جێگاکەی خۆمدام، دەنووسم و پێڵوەکانم تەپک بووە لە خەوە نوتکەدا، دەستم خۆی دەڕوات و خۆشم هیچ نابینم، دێرەکەش شێواوە و تەنها خۆم دەیخوێنمەوە.

هەتا ئێستاش لە جێگاکەدا ئەمدیوو دیوو دەکەم؛ ساتێک بێئاگا دەبم و پاشان هەڵدەستم. ئەمەش لە نەخۆشییەوە نییە، سوپاس بۆ خودا بەهێز و چالاکم و وەرزش دەکەم هەست بە لەشساغی دەکەم لە ماسولکەکانمدا وەک ئەوەی لاوێکی سی ساڵان بم. بەهۆی خەمی بژێوێ و بیرکردنەوە لە پارەش نییە، سوپاس بۆ خودا هێندەم هەیە بەسمە و لێشم زیادە. بەهۆی ناکۆکی ماڵەوە و کێشە نییە لەگەڵ خەڵکیدا، لە ماڵی خۆمدا ئارامم و وازم لە خەڵکی هێناوە و مامەڵەیان لەگەڵ ناکەم و نزیکیان نابمەوە و کڕین و فرۆشتیان

لەگەڵ ناکەم، سەرقاڵی سیاسەت و سەرۆکایەتی نابم، حەوامەتەوە لە دەست خەڵکی.

ئەی کەواتە چیمە بۆ خەوم لێناکەوێت؟ خەمێکە گەورەترە لە هەموو ئەو خەمانەیە؛ خەمی ئەدەبە! ئەوەی تێیدام قورسترە لە کاری ئەو کرێکارەکەی ڕێگاکان هەڵدەکەنێت و بەیانی تائێوارە چاڵ هەڵدەکەنێت، سوێند بەخودا دژوارترە، چونکە کرێکار ماندوو دەبێت هەتا ئارەق دەڕێژێت بەڵام ئەگەر نانێکی باش بخوات و ڕابکشێت خەو دەیباتەوە، من برسیم دەبێت بەڵام حەزم لە خواردن نییە، ئەگەر بیخۆم دواتر بیردەکەمەوە ئەوە هەرس ناکەم کە خواردوومە، خەوەنووتکە دەمکوژێت و ناتوانم بخەوم، ئایا ئەو کەسە خەوی لێدەکەوێت کە بەبەرد دەدەن بەسەریدا؟ تەقەی سەرم دێت لێ لە ناوەوە، بیرکردنەوەکانم دەدەن بەیەکدا تەقەی دێت، چۆن خەوم لێدەکەوێت و ئەم بیرکردنەوانە وەک بەرد دەدەن بەسەرمدا؟

بیرۆکەی وتار و قسە و چیرۆکەکان.

پێویستە لەسەرم هەموو هەینیەک ئەم وتانە ئامادەبکەم، پێویستیشە لەسەرم وتاری هەینی ئامادەبکەم یان بگەڕێم بە شوێنی کەسێکدا لەبری من بچێت، دووشەمانیش وتارێک بنووسم بۆ((ئەیام))، بۆ سێ گۆڤار بابەت دەنووسم و گۆڤارەکانی تریش جار جار بابەتیان بۆ دەنووسم، هەندێ کتێبم لەلایە ئامادەیان دەکەم بۆ چاپ، بەڵێنم

بە دوو پەخشانگە داوە بۆ یەکیان زنجیرەیەک چیرۆکی منداڵان بنووسم بۆ ئەوەی تریان زنجیرەیەک لە ناساندنی پیاوەکاندا بنووسم، لەسەرووی هەموو ئەمانەوە کاری دادگام هەیە. ئاواتەخوازم یەک مانگ بۆ خۆم بژیم وەک چۆن خەڵکی دەژی، من لە کوێی ئەوەدام کە ئاواتی پێدەخوازم؟ خەڵکی کە بیسەری هەواڵێک دەبن یان چیرۆکێک دەبینن لەمەدا بیر لە خۆیان دەکەنەوە، بەڵام ئەگەر ببیستم یان بخوێنمەوە بیردەکەمەوە چۆن ئەمە بکەم بە وتارێک یان بیکەم بە نووسینێک، ئەگەر خەڵکی دیمەنێک لە دیمەنەکانی سرووشت ببینن یان تەماشای فیلمێکی سینەمایی بکەن چێژی لێوەردەگرن بۆ دەروونی خۆیان، ئەگەر دڵخۆشبن یان خەمباربن دڵخۆشی و خەمبارییان بۆ خۆیانە، دڵخۆشی و خەمباری من بۆ خەڵکییە، لە پێناو ئەمەدا وەک شێتەکان کاردەکەم.

لە ڕێگادا دەوەستم بۆ ئەوەی ئەو بیرۆکەیە بنووسم کە بە مێشکمدا هاتووە بۆ قسە یان وتار دەشێت، لە قەرەباڵخی ڕۆسەردا دەنووسم ئەگەر شتێکم بیربکەوێتەوە بۆ قسە یان وتار بە کەڵک بێت، لە پەنای پێخەفەکەمدا کاغەز و پێنووس هەیە پێنوسەکەش پەیوەستە بە گڵۆپەکەوە، هەرکات بیرۆکەیەک بە مێشکمدا بێت گڵۆپەکە ڕۆشن دەکەم و دەنووسم. مامۆستاکانی ئەدەب دەڵێن بیرۆکەکان لە دیمەنی جواندا دێن، لە باخچەدا کە دەنگی بولبول دێت و ئاو ڕێدەکات و مرۆڤیش چوست و چالاکە، لێ من تەنها کاتێک

بیرۆکەم بۆ دێت کە لە جێدام و وەنەوز تێکی شکاندووم، شەوان بیست جار ڕووناکیە ڕۆشن دەکەم و خامۆشی دەکەمەوە، هەربۆیە خێزانەکەم لێم ڕادەکەن و کەس لەو ژوورەدا ناخەوێت کە تێیدا دەخەوم.

سەبارەت بە خەڵکیش ڕامکردووە لێیان یان ڕایانکردووە لێم، ماوەی چەند ساڵێکە تەنهام و سەردانی کەس ناکەم و کەسیش سەردانم ناکات ئیللا بەکەمی نەبێت. ئەگەر هاوڕێیەکم بەتامەزرۆییەوە سەردانم بکات ناتوانم پێشوازی لێبکەم، ئایا خوێندکار لە شەوی تاقیکردنەوەدا پێشوازی لە کەس دەکات؟

چۆن لەگەڵ میواندا دابنیشم و قسەی هیچی لەگەڵدا بکەم ئەو مێشک بەتاڵە هاتووە ئەو کاتژمێرانە بەسەربەرێت کە بێکارە تێیدا، منیش دەڵێی لەسەر پشکۆ دانیشتووم و بیر لە پەخشانگە دەکەمەوە کە چاوەڕێم دەکەن و وەک دۆزەخ دەمی کردۆتەوە و چاوەڕێی وتارییەتی؟

ئەم قسە و وتارانە غەریبیان کردم و لە شارەکەی خۆشمدام، بێبەشی کردم لە قسەی دانیشتنەکان و دیداری براکانم. ئێستا خەو لە چاوەکانم فڕی و هەستام بۆ لای کتێبخانەکە... خێزانەکەم بەدەم

خەوەوە لێمی پرسی: هیچ بووە؟ وەڵامم نەدایەوە..... وەڵامەکەی لەم قسانەدا دەبینێت.

ئەمەش لە بەڵاکانی ئەدەبە. خەڵکی لە نێوان خۆیان و خێزانەکانیاندا نهێنیان هەیە و نهێنی تریش باڵەکانیان دەدەن بەسەریدا، ئەدیبی داماویش هیچ نهێنییەکی نییە، پێویستە خوێنەرەکانی بەشداربن لە هەموو نهێنیەکانیدا، تەنانەت لە هەواڵی ماڵەوەشیدا، تەنانەت لە وردترین هەست و قوڵترین ڕازیدا، پێویستە لەسەری پەسنی بکات بۆ خەڵکی و لەبارەیەوە بدوێ، پەنهانیەکانی ئەدیب ئاشکرایە و نهێنیەکانی بڵاوە، ئای ئەدیبەکان چەندێ بەدبەختن!

گوێگرە بەڕێزەکان ئەمە دۆخی منە، چوارەمین شەوە کە نەخەوتووم.

ئەمە دۆخی منە و سی و یەک ساڵە لەم بەڵایەدام. بەڵێ بەڕێزەکانم، ماوەی سی و یەک ساڵە بیردەکەمەوە بۆ خوێنەران، هەست دەکەم و دەژیم بۆ ئەوان؛ تاکە خەمم ئەوەیە ڕۆژانە قسەیان پێشکەش بکەم، لە ڕووح و دەروونمی دەکەمەوە بۆ ئەوەی ببێتە خۆشی بۆ ئەوان و دڵنەوایی بێت بۆیان لە کاتە فەراغەکانیاندا، ماوەی حەڤدە ساڵیشە لە قسەکردن بۆ گوێگرەکانم دانەبڕاوم ئیللا چەند ماوەیەکی کەم نەبێت.

حەڤدە ساڵە قسەتان بۆ دەکەم! ئەرێ بابەتەکان کۆتاییان پێ نایەت؟ ئەرێ بێزارنابم یان لێم بێزارنابن؟ مۆڵەتم بدەن کەمێک پشوو بدەم و ئیسراحەت بکەن لە دەستم!

سوێندتان بۆ دەخۆم هەرکات دەبینم بەرنامەکانی ڕادیۆ ڕێگری لە قسەکردنم دەکات، جا ئاهەنگێک بێت یان یارییەک بێت یان هەرشتێکی تر، دڵخۆش دەبم وەک چۆن خوێندکارێک دڵخۆش دەبێت بە داخستنی قوتابخانە بەهۆی ڕۆژی جەژنەوە! سێ یەکی سەدەیەکە من دەنووسم، بەردەوام دەنووسم، هەتا زیاتر لە پانزە هەزار لاپەڕە لە نووسینەکانم چاپکراوە ئەمە جگە لە وتارەکانم کە پێشکەشم کردوون و نەم نووسیوون و لەدەستم چوون(لە هەزار وتار زیاترە)، لەگەڵ ئەمەشدا هەست دەکەم شتێکم لەلایە و نەموتوە، کاتی پێویستم نییە کە بیلێم..ئەویش کاری ئەدەبی نەمرە کە گرنگی پێدەدەم وەلێ ئەم قسە و وتارە سەرقاڵم دەکەن لێی.
هەموو مرۆڤێک توانایەکی هەیە، ئێستا وام لێهاتووە بەرگە ناگرم. ئەگەر بینیتان لەناکاو دابڕام لەم قسانە و لە نووسین لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا پێتان سەیر نەبێت، چونکە بڕیاری ڕاکردنم داوە.

من داوای مۆڵەت دەکەم، وای دابنێن فەرمانبەر یان کرێکارم، ئایا فەرمانبەر یان کرێکار مافی ئەوەی نییە چەند ڕۆژێک مۆڵەت وەربگرێت بۆ ئەوەی پشوو بدات؟

دەمنووسی و گەنج بووم و دەروونم پڕبوو لە حەماسەت و حەزم لە ناوبانگ بوو، شکۆمەندی ئەدەبیش هانیدەدام بۆ کارکردن، دەمنووسی و نوسینەکەم پێشان پەخشانگە دەدا هیچ بڕە پارەیەکم نەدەویست تەنها ئەوە نەبێت بۆم بڵاوبکەنەوە، کە دەمبینی بڵاوکراوەتەوە گەورەیی و خۆشی دڵیان پڕدەکردم یەکسەری پاداشتەکەم دەستدەکەوت، ئێستا پەخشانگە ڕووم تێدەکات و داوام لێدەکات، پارەیەکی باشیشم بۆ پێشنیار دەکات، بەڵام حەماسەتم لەدەستداوە و حەزی ناوبانگ لە دەروونمدا مردووە، کاتێکیش پێی گەیشتم سەرابێک بوو.

سوێند بەخودا سەرابێکە! دەزانن سەراب چییە؟ ئەو کەسەی لە بیاباندا ڕێ دەکات لە دوورەوە وەک ئاوێکی هەڵقوڵاوی دەبینێت، کە دەگات پێی هیچی دەستناکەوێت.

ناوبانگیش وایە! بە ئەزمونەوە لەبارەیەوە دەنووسم. ملیۆنان کەس ناومیان بیست، زۆربەی نوسینەکانم بۆ فارسی و ئەوردی وەرگێڕدرا و هەندێکیشی وەرگێڕدراوە بۆ ئینگلیزی، نووسراوم لەلایەن خوێنەران و بیسەرانەوە بۆ دێت لە ئەندەنوسیا لەوپەڕی ڕۆژهەڵات و لە مەراکیش لە ڕۆژئاواوە. چیم دەسکەوتووە لە هەموو ئەمانەدا و سوودی چیم لێی بینیووە؟ چ سودێک وەردەگرم ئەگەر لەماڵەوە بە تەنها بم و ملیۆنان خەڵک ستایشم بکەن و پێم بڵێن

ئەدیبی عەرەبە، چ زیانێک دەکەم ئەگەر پێم بڵێن نەزانترینی نەزانەکانە؟ یان ناوی من نەیەتە سەر زارییان و نەمناسن؟

شکۆمەندی ئەدەبی چییە؟ ئەوەیە نووسینی ئەو کەسانەت پێ بگات کە پێت سەرسامن، یان ئاهەنگی ڕێزلێنانت بۆ سازبکرێت و ڕۆژنامەکان لەبارەتەوە بنووسن؟ ماوەی بیست ساڵ زیاترە هەموو ئەمانەم بینیووە، بەڕاستم بزانن کە دەڵێم سەرابە.

تاکە هەقیقەت لە بەروبوومی ئەدەب پاداشتی وتارەکان و ئەو پاداشتەیە لەلایەن خوداوە چاوەڕێی دەکەین! لەسەر نووسینەکانم گەورەترین پاداشتم وەرگرتووە کە نووسەرێکی عەرەبی وەریگرتبێت، چەندین جار سێ سەد لیرەم لەسەریەک نووسین وەرگرتووە، هەزار لیرەم بۆ یەک سیمینار وەرگرتووە، پارە هەقیقەتە و سەراب نییە، لێ چی بکەم لە پارە؟

مووچەکەم بەشم دەکات، ئاواتە خوازبووم ماڵێکم هەبێت سوپاس بۆ خودا بوومە خاوەنی ماڵ، پارە خەزن ناکەم و نامەوێت ببمە گەورەی زەنگینەکان، بۆچی سووربم لەسەر بە دەستهێنانی پارە؟ ئایا پارە یەکسانە بەو ئارامییەی لەدەستی دەدەم و لەو خەوەی حەزم پێیەتی و دەستم ناکەوێت؟



Sara

سەبارەت بە پاداشتی خوداش ئومێدەوارم هێندە دڵسۆزییم هەبێت کە شایەنی پاداشت بم، ئومێدەوارم خودا لە پاداشت بێ بەشم نەکات، ئەگەر ماوەیەک پشوومدا بۆ ئەوەی دەروونم و کارەکانم تازە بکەمەوە.

* * *

پاداشتی خودا تاکە هەقیقەتە کە دەمێنێتەوە و ئەوی تری خۆشییەکی هەڵخەڵەتێنەرە، فیلێکە لە خۆمانی دەکەین و وەهمە، مشتێ بایە! مشتێ با بگرە دەبینیت دەستت هیچی تێدا نییە، دونیاش ئاوایە. چی لەگەڵ خۆماندا دەبەین جگە لە کردەوەی باش نەبێت؟ هەمووی سەرابە ئیللا ئەوەنەبێت کە پێشی دەخەین بۆ دوارۆژمان.

لە دوای هەموو ئەمانەوە، ئێوە- بەڕێزان- بیسەری قسەی قسەکار دەبن یان نووسینی نووسەرێک دەخوێنیتەوە وێنای ئەو کۆشش و ماندووییە ناکەن کە خەرجی کردووە هەتا گەیشتووە بەدەستتان. وەک ئەو کولێرەیە وایە کە دەیخۆن بەبێ ئەوەی بیری لێبکەنەوە یان پرسیاری لێوەبکەن، ئەگەر بیرتان بکردایەتەوە دەتانزانی چەند دەست کاری تێدا کردووە و چەندێ کۆششی تێدا کراوە، لەو ڕۆژەوەی جووتیارەکە چاندوویەتی هەتا ئەوکاتەی نانەواکە شێلاویێتی و کردوویەتی بەنان.



بەڵکوو کاری ئەدیب لە نووسیندا گرانترە و بەڵای ئەدیب بە ئەدەبەوە گرانترە، بمبوورن ئەمڕۆ هەناسەمدا بە دەروونم بەم وتانە، سکاڵایە......

* * *

هەست دەکەم بەم سکاڵاکردنە بارێکم لەسەرشانم لابردووە، ئێستا هەستاوم نوێژی بەیانی دەکەم و هەوڵدەدەم بخەوم، بمبوورن ئەگەر ماندووم کردبن بە قسەکردن لەبارەی خۆمەوە و بەیانی بکەنەوە بەخێر و خۆشی.

***



# لە دوای پەنجا

لە ساڵی ١٩٥٩دا بڵاوکراوەتەوە

تەماشای ڕۆژژمێرم کرد بینم ئەمڕۆ(٢٣ی جەمادی ئولای ١٣٧٩ی کۆچی) پەنجا و دوو ساڵی قەمەرییم تەواوکردوو، ساتێک وەستام و ڕوانیمە ئەمڕۆ و دوێنێم، تەماشای پێشی خۆم کرد هەتا بزانم کۆتایی ڕێگاکە کامەیە، تەماشای دواوەم کرد هەتا ببینم چ سوودێکم بینیووە لەم ڕێگایە.

وەستام وەک چۆن بازرگان لە کۆتایی ساڵدا دەوەستێت بۆ ئەوەی جەردی دەفتەرەکەی بکات و حسابی خۆی بزانێت، بزانێت چی قازانج کردووە و چی زەرەرکردووە. وەستام وەک چۆن ئەو کاروانیە دەوەستێت کە تاریکی هاتووە بەسەریاندا و برسییەتی پەرێشانی کردوون، ئینجا ڕادەکەن نازانن لە کوێوە هاتوون و بەرەو کوێ دەڕۆن، ئارام نابنەوە هەتا ماندووی دەیانڕوخێنێت و بە خەوتووی دەکەون وەک کوژراوەکان!

ئێمەش بەو شێوەیەن کە بەڕێگای ژیاندا ڕێ دەکەین؛ وەک شێتەکان پێشبڕکێ دەکەین وەلێ نازانین لەسەر چی پێشبڕکێ دەکەین، هەر بەیانی چاومان گردەوە بەردەوام کار دەکەین هەتا ئەوکاتەی شەو خەو دەمانباتەوە، هەموو شتێک دەکەین ئیللا بیرکردنەوە لە خۆمان نەبێت یان بڕوانین لە کوێوە هاتوین و بۆ کوێ دەڕۆین!

لە دەفتەرەکەمم ڕوانی، هەتا ببینم چیم داواکرد و چیم وەرگرتووە.



داوای شکۆمەندی ئەدەبیم کرد و هەوڵی خۆییم بۆدا، لە خوێندنەوەدا تیژی چاوەکانم ڕۆیشت و کاتژمێرەکانی تەمەنم تێیدا خەرج کرد، شەوە دوور و درێژەکان دەمخوێندەوە، لەوکاتەی خوێندکاربووم کتێبی وام خوێندەوە کە ئەدیبەکانی ئەمڕۆ بۆجارێکیش نەیانکردۆتەوە و تەماشای بکەن! مامۆستایەکم نەبوو ڕێگاکەم نیشان بدات و دەستم بگرێت، لە مامۆستاکانمدا نەبوو خاوەنی شێوازی خۆی هەبێت لە نووسیندا هەتا شوێنی شێوازەکەی بکەوم، تیایاندا نەبوو دەستی باڵای هەبێت لە وتاردان و پێشکەش کردندا هەتا بە شێواز و مەزهەبی خۆیدا بمبات. ئەوەی خوێنەرەکانم پێی دەڵێن شێوازی نووسینم و گوێگرەکان پێی دەڵێن ڕێگای پێشکەش کردنم شتێکە خودای گەورە منەتی کردووە بەسەرمدا پێی و هی خۆم نییە، لەوکاتەوەی دەنووسم و قسە دەکەم لەسەر شێواز و



تەبیعەتی خۆم بووم، لە نووسیندا وشەیەک جێگیر ناکەم لەبری وشەیەکی تر و شێوازی ڕێگایەک دیاریی ناکەم لەڕێگاکاندا، لەکاتی قسەکردندا زۆر لە خۆم ناکەم لە تۆنی دەنگمدا و نمایش ناکەم لە دەرخستنی پیتەکاندا.

...... ئاواتەخوازبووم ببمە وتاربێژێک مینبەرەکان بهەژێنم و ببمە نوسەرێک پەیامبەرەکان بە شوێنەواریدا بڕۆن، وامدەزانی ئەمە ئەوپەڕی ئاوات و دوورترین داوامە، کە بەدەستم هێنا پشتم تێی کرد و شیرینەکەی نەما، وام لێهات چێژم لێی نەدەبرد و ئاواتم پێی نەدەخواست.

شکۆمەندی ئەدەبی چییە؟ ئەوەیە خەڵکی لە هەموو شوێنێک باست بکەن و پێشبڕکێ بکەن بۆ خوێندنەوەی نووسینەکانت و بیستنی پەخشکراوەکانت، نووسینی سەرسامی بەدوای یەکدا بۆت بێت و ئاهەنگی ڕێزلێنانت بۆ سازبکرێت؟ هەموو ئەمانەم بینی؟ دەتانەوێت پێتان بڵێم چیم بینیووە تیایدا؟ سەرابم بینی.....سەرابێکی هەڵخەڵەتێنەر، تۆزی بەربا!

ئەمانە ناڵێم وەک وتەی ئەدیبێک کە دەیەوێت نامۆ بێت و سەرسامی بە چنگ بخات، نا سوێند بەخودای گەورە(بۆیە سوێند دەخۆم بۆئەوەی باوەڕبکەن) تەنها ئەوە دەڵێم کە هەستی پێدەکەم. ئەوا سی ساڵە سەر مینبەرەکانم گرتووە و پێشی گۆڤار و

ڕۆژنامەکانم داگیرکردووە، ماوەی حەفدە ساڵە حەفتانە لە ڕادیۆوە قسە دەکەم هەتا ئەمڕۆ، لە شام و میسر و عێراق و حیجاز و هیند و ئەندەنوسیا وتارانێکم داوە کە دڵەکانی دەهەژاند، نووسینێکم دەنووسی کە دەبووە جێ باسی خەڵکی، ڕۆژەکان تێدەپەڕین و ناوەکەم لەسەر زاری هەموو خەڵکی شارەکەم بوو لە هەموو ئەو شارانەشی تێیدا ژیاوم یان نوسینەکانم گەیشتووە پێی، گوێ بیستی چەپڵەی سەرسامی بووم و بیسەری وتاری ستایش کردن بووم لە ئاهەنگی ڕێزلێناندا، لەبارەی خۆمەوە نووسین و پەیامەکانم خوێندەوە، ڕەخنەگرە گەورەکان توێژینەوەیان لە ئەدەبەکەم کرد و لە قوتابخانەکاندا خوێنران، زۆربەی نووسینەکانم وەرگێڕدرا بۆ دوو بڵاوترین زمان لە جیهاندا: ئینگلیزی و ئەوردەی؛ بۆ فارسی و فەرەنسی..... لە هەموو ئەمانەدا چەندێکی ماوەتەوە بۆم؟ هیچ. ئەگەر خودا لەسەر هەندێکی پاداشتی بۆ نەنوسیبێتم ئەوا بەدەست بەتاڵی لێوەی دەرچووم!

ماوەی چەندین ساڵە پەرگیر و تەنهام، چەندین هەفتە بەسەرمدا تێدەپەڕێت و سەردانی کەسم نەکردووە و کەسیش سەردانی نەکردووم، لەگەڵ کەسدا نەدەدواوم ئیللا قسەی کارکردن نەبێت لە دادگا یان قسەی خێزانی لە ماڵدا. چ سودێکم پێدەگەیەنێت ئەگەر من لێرە تەنها ببم و لە مەراکیش و هیند و نێوانیاندا باس بکرێم و ستایش بکرێم، چ زیانێک دەکەم ئەگەر تێیدا سەرزەنشت بکرێم یان کەسی تێدا نەبێت گوێی لەناوەکەم بووبێت؟



هێندە گوێبیستی ستایشی خۆم بووم کە بەرزی کردومەتەوە بۆ پلەی نەمران، لەسەرزەنشتیش کە بردوومیەتی بۆ خوارەوە بۆلای شەیتانەکان، ڕێزلێنانێک ڕێژم لێنراوە کە شایەنم نەبووە و فەرامۆش کراوم هەتا کەسانی سەرەتایی لە ئەدەبدا بانگهێشت دەکران بۆ کۆنگرە و کۆڕە ئەدەبییەکان و منیش بۆ هیچیان بانگهێشت نەکرام، لەگەڵ هەردوو دۆخەکەدا ڕاهاتم، وام لێهات ستایش کردن لووتبەرزی نەدەکردم و، جوێن دانیش موویەکی جەستەی نەدەجولاندم.

شکۆمەندی ئەدەبی لە حیسابدا کەوتە خوارەوە کە بینیم وەهم و سەرابە.



داوای پلەم کرد، دواتر تەماشم کرد پلەوپایە تەکلیفە نەک ڕێزلێنان، ماندووی و ناڕەحەتییە نەک خۆشی و شادی، فەرمانبەریش ئەسیرێکە و کۆتکراوە بە کۆتی ئاڵتونی، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا لە تەمەنمدا حەزم لەیەک ئەرکبوو، هەوڵم بۆیدا و لە ئامەزرۆیدا بۆی سووتام......ئەویش ئەوەبوو ببمە مامۆستای سەرەتایی لە قوتابخانەی حەرستا ئەمەش پێش سی ساڵ بوو، بەدەستم نەهێنا و لەدوای ئەوەوە حەزم لە هیچی تر نەکرد.

داوای پارەم کرد و هەوڵم بۆ دەوڵەمەندیدا، پاشان تەماشام کرد بینیم خەڵکی دەوڵەمەند تیایاندایە بەدبەختە، هەژارەکانیش هەندێکیان بەختەوەرن.

ئەوکاتەی لە ناوەندی بووم باوکم کۆچی دوایی کرد، خێزان و قەرزێکی زۆری بەجێهێشت، خودا قەرزەکانی بۆ داینەوە و منداڵەکانی پێگەیاند و پێویستیان بە کەس نەبوو، ژیانمان وەسەت بوو هیچ ڕۆژێک سکاڵامان لە نەبوونی نەکرد و دەستەوسان نەبووین لە گەیشتن بەوەی پێویستمانە، هیچ ڕۆژێکیش هێندە پارە لەبەردەستماندا نەبووە کە نەزانین چی لێبکەین، ڕۆزیمان سوپاس بۆ خودا وەک ڕۆزی باڵندە وابوو:

کە بە سکی بەتاڵ دەردەچێت و بە تێری دەگەڕێتەوە.

ئیتر داوای سەروەت و سامانم نەدەکرد ئیللا ئەونە نەبێت پێی بژیم و ڕووم لە زەلیلی پێویستی بپارێزێت.

داوای چێژی جەستەم کرد و شەوانی لاویم تیایدا خەرج کرد بە بیرکردنەوە لێی و ڕۆژەکانم تیایدا لەدەستدا لە گەڕان بەدوای شوێنەکەیدا، لە مەستی ئەمەدا بووم و تەنها بیرم لەمە دەکردەوە و تامەزرۆیی بووم، ئەو چیرۆکانەم دەخوێندەوە کە باسیان دەکرد و ئەو هۆنراوانەی ئاماژەی پێدەدەن. پاشان گەورەبووم و زانستم زیادبوو، مەستیەکە ڕۆیشت و بیرکردنەوەکە ڕاست بوویەوە، بینیم خاوەنی



ئارەزوو کە هەموو ڕێگایەکی بۆ دەگرێتە بەر وەک ئەو کەسە تونییە وایە کە ئاوی دەریا دەخواتەوە هەتا زیاتر بخواتەوە تونیەتەکەی زیاتر دەبێت، بۆم دەرکەوت ئەو کەسەی حەڵاڵ تێری ناکات و قەناعەتی پێ ناکات حەرامیش تێری ناکات ئەگەر بگات بە هەموو ئافرەتەکانی جیهانیش.

پاشان لاوێتیم بە خەون و وەهمەکانیەوە ڕۆیشت، حەزەکە نەما و داواکارییەکە مرد، پشوم دا و حەوامەوە.

***

دانیشتم و تەماشای خەڵکیم دەکرد، دەمپرسی: بۆ چ شتێک ڕادەکەن؟ بۆ چ شتێک هەوڵدەدەن؟ هیچ شتێک نییە سەراب نەبێت!

دەزانن سەراب چییە؟
ئەو کەسەی لەبیاباندا ڕێ دەکات لە دوورەوە وادەزانێت کانییەکی ئاوی زوڵاڵە، سواریەکانی ماندوو دەکات و هاوەڵەکانی هاندەدات بۆ ئەوەی پێی بگەن، کە دەگەن تەنها دەگەن بە خۆڵ.

ئەمە چێژەکانی ژیانە؛ بەچێژ نییە لەدوورەوە نەبێت.

کەسی هەژار ئاواتەخوازی سەروەت و سامانە، وادەزانێت ئەگەر دە هەزار لیرەی دەست بکەوێت هەموو دونیای بۆ بووە، ئەگەر پێی بەخشرێت ئەو چێژەی نایێت کە چاوەڕوانی دەکرد و ئینجا تەماحی لە سەد هەزاردایە، هەست دەکات پێویستی پێیەیەتی لەکاتێکدا لەدەستیدایە وەک چۆن هەستی دەکرد پێویستی پێیەتی لەوکاتەی لەدەستیدا نەبوو، ئەگەر سەد هەزاریشی دەستبکەوێت داوای ملیۆنێک دەکات، ئەگەر بەنی ئادەم شیوێک ئاڵتونی هەبێت داوای دووەم دەکات، چاوی پڕناکات خۆڵ نەبێت.

شاعیرێکی عاشق، دونیا پڕ دەکات لە هۆنراوەی ناسک و پڕ لە هەست، ئاشکرای دەکات کە هیچی ناوێت لە خۆشەویستەکەی تەنها چێژی تەماشاکردن و قسەکردن نەبێت، کە گەیشت پێی هیچیانی دەستناکەوێ و داوای دوای ئەوە دەکات، پاشان دەیەوێت هاوسەرگیری بکات کە ئەنجامیدا ئەو نیعمەتەی دەسنەکەوت کە لە خەیاڵیدا بووە، وێنەی خەیاڵی لەژێر تیشکی خۆری واقعیدا دەتوێتەوە وەک چۆن بەفری زستان لەژێر چرپەی بەهاردا دەتوێتەوە، مەجنونیش لە لەیلادا ئەو ئافرەتە دەبینێت کە خودا لە خۆڵ درووستی کردووە و ئەوە نەبوو کە لەخەیاڵی خۆیدا لە پەنیر درووستی کردووە، پاشان لێی بێزاردەبێت و دەچێت بۆ ئافرەتێکی تر شێت دەبێت!

فەرمانبەرێکی بچووک وەزیر یان ئەمیر دەبینێت لە ئۆتۆمبێلەکەی دێتە خوارەوە، ئەفسەرەکان بۆی دەوەستن و خەڵکی بۆی دەچەمێننەوە، گومانی وایە لە سەرۆکایەتی یان وەزیرییەتی ئەو چێژ و خۆشیە بەدەست دێنێت کە خەیاڵی دەکات بەهۆی بێبەشبوون لێوەی، نازانێت وەزیر بەجۆرێک لەگەڵ وەزارەتەکەیدا ڕادێت هەتا لەچاویدا وەک کاری نووسەرێکی بچووکی لێدێت. وەهمە....وەلێ ئێمە دایم پەیوەست دەبین بە وەهمەکانەوە!



بیرمکردەوە چیم لە چێژەکانی دونیا بەدەستهێناوە و چەندێ بەرگەی ناڕەحەتیم گرتووە لە ئارامگرتنی دەروونم بە ئەنجامدانی تاعەت و دوورکەوتنەوە لە تاوان، بینیم قەدەغەکراوەکان جوان و ڕازێنراوەن دەروونم لێی دوورخستەوە هەرچەندە حەزی پێیبوو، بینیم واجبەکان قورسە دەروونم ناچار کرد لەسەری هەرچەندە لێی ڕادەکرد، هەرکاتیش دەروونم بەسەرمدا زاڵ دەبوو قەدەغەکراوەکانم ئەنجام دەدا و وازم لە واجبەکان دەهێنا، ئازار و خۆشیم دەچەشت، چی ماوەتەوە لەو چێژ و ئازارە؟ هیچ. چێژەکە ڕۆیشت و سزاکەی ماوە، ئازارەکە ڕۆیشت و پاداشتەکەی ماوە.

کەس لەو کەسە گومڕاتر و غەشاشتر نییە کە پێت دەڵێت:
تەنها تەماشای ئەو ساتە بکە کە تێیدایت.



نەخێر سوێند بەخودا، ئەوەی گوزەشتووە نەفەوتاوە بەڵکوو بۆت نووسراوە یان لەسەرت نووسراوە، خودا بژاردیەتی و ئێوە بیرتانچۆتەوە. ئەوەی دێت پەنهانە وەلێ پەنهان وەک ئێستایە. وێنەی ئەوکەسەی ئەم قسە دەکات وەک ئەو کەسە وایە کە سواری کەشتی بووە و هێندەی نەماوە نقووم ببێت و تەنها چەند کاتژمێرێکی ماوە، بەخێرایی پڕ نادەتە گەمییە بچووکەکانی ڕزگاربوون وەک کەسە ژیرەکان و داوای پشتوێنی ڕزگاربوون ناکات وەک ئەو کەسەی گەمییەکەی لەدەستداوە، بەڵکوو لە ژوورەکەی دەمێنێتەوە و دیوارەکانی بە وێنە دەڕازێنێتەوە و زەوییەکەی پاکدەکاتەوە، بە خۆی دەڵێت:

خۆ هەرچۆنێک بێت گەمیەکە نقووم دەبێت جا بۆچی چێژ لەم ساتەم وەرنەگرم کە تێیدام؟ هەموو تەمەنی خراپ دەکات لە چاککردنی ئەم کاتژمێرەدا، ئەگەریش ئاوەز کارەکەی بەگێلێتی زانی با بەکوپێکی مەی بدات بەڕووی ئاوەزدا کە چاوی کوێر دەکات وای لێدەکات نەبینێت و ڕێنوێنی وەرنەگرێت، مەی هەیە مەی سەروەت و سامانە مەی دەسەڵاتە!

ئەمە نموونەی ئەو کەسەیە دونیا فانی دەکاتە گرنگترین خەمی و پشت دەکات لە دوارۆژی، ئەگەر ژیربوایە پشتی لە دونیا دەکرد. گەمییە و گۆچانەکەی هەڵنەدەگرت و بەتەنیا ڕێی نەدەگرتە بەر،

لە سوچێکدا نەدەوەستا و دەست لە چاکەکاران پان بکاتەوە؛ ئەم جۆرە زوهدە زوهدی نەزانەکانە. ئەمەش سەرپێچی کردنە لە ئاییندا. زوهدی ڕاستی زوهدی هاوەڵان و شوێنکەوتووانە، ئەوانەی کارییان بۆ دونیا کرد و سەروەتیان کۆکردەوە و چێژییان لە پاکە حەڵاڵەکە وەرگرت و نیعمەتی خودایان پێوە دیاربوو، لێ دونیا لە دەستیاندا بوو نەک دڵیان، بەردەوام یادی خودا لە دڵ و لەسەر زارییان بوو، شەریعەت چرا و پێشەوایان بوو، دەستیان کراوە بوو بۆ خێرکردن، شانازییان نەدەکرد بە دەوڵەمەندییەوە هەتا لوتبەرزین و هەژاریش خەمباری نەدەکردن هەتا بێئومێد بن، بەڵکوو لە نێوان دەوڵەمەندێکی سوپاسگوزار و هەژارێکی خۆڕاگرداببوون. ئەو کەسەی پارەی دەست دەکەوێت و لەشتی باشدا دەیبەخشێت باشترە لەوکەسەی بەدەستیناهێنێت و نایبەخشێت بەڵکوو داوادەکات و وەریدەگرێت، ئەوکەسەی زانست فێردەبێت و کاری پێدەکات باشترە لەوکەسەی لە خەڵکی دووردەکەوێتەوە و لە سوچێک یان ئەشکەوتێکدا خەریکی پەرستش دەبێت، ئەوکەسەی خاوەن پلە و دەسەڵاتە و دادپەروەر دەبێت و ستەم دووردەخاتەوە باشترە لەوکەسەی دەسەڵاتی نییە و دادپەروەریش نییە....عیبادەت تەنها ئەوە نییە پێیەکانت لە میحرابەکاندا بێت، بەڵکوو هەرچاکەیەک ئەنجامی دەدەیت ئەگەر چاوەڕێی پاداشتەکەی بکەیت لە خودا عیبادەتە؛ هەر حەلاڵێک لەبەر خودا ئەنجامی بدەیت عیبادەتە؛ ئەگەر لە خواردندا نیەتت ئەوە بێت توانای ئەنجامدانی کاری چاکەت هەبێت و

بەچوونە لای خێزانت نیەتت داوێن پاکی بێت و لە کۆکردنەوە پارە و سەروەتدا نیەتت توانای خێرکردن بێت، هەموو ئەمانە دەبێتە عیبادەت بۆت، شوکرانە کردن لەسەر هەر نیعمەتێک و خۆڕاگریت لەسەر هەر بەلایەک عیبادەتە بۆت.

سروشتی مرۆڤ وایە بەتەماحە، وەک خوێندکاری قوتابخانە وایە؛ هەرکات گەیشت بەقۆناغێک هەمی ئەوەیە بگاتە قۆناغی دواتری. بەڵام خوێندکار ئامانجێکی دیاریکراوی هەیە ئەگەر پێی گەیی دەوەستێت، بەڵام مرۆڤ لە دونیادا بەدوای شتێکدا دەڕوات کە هەرگیز پێی ناگات، چونکە هەوڵی بۆ نادات بۆ ئەوەی لەسەر بوەستێت و قەناعەتی پێ بکات بەڵکوو بۆ ئەوەی بەخێرایی تێی پەڕێنێت ئەو ئامانجێکی دەوێت لە هزری خۆیدا کە لە زەویدا بوونی نییە!

پارەی باش و پلەی بەرز و تەندرووستی و خێزان و وەچەی پێدەبەخشرێت، پاشان دەبینی سکالای فەراغێکی گەورە دەکات لە دەروونیدا و خەمێکیش لە دڵدا کە نازانێت هۆکارەکەی چییە، وا هەست دەکات لەشتێکی کەمە و نازانێت ئەو شتەش چییە، چ شتێکی کەمە هەتا بیەوێت کاملی بکات؟

تەنها یەک پیاو وەڵامی ئەمەی داوەتەوە؛ پیاوێک کە لە دونیادا گەیشتووە بەبەرزترین پلە کە پیاوەکان تەماحیان تێیدایە: پلەی حاکمی ڕەهای چواریەکی زەوی لە نێوان فەرەنسا و چیندا، لەگەڵ ئەم دەسەڵاتەشدا تەندروستی و زانست و ڕێزی هەبوو، ئەویش عومەری کوڕی عەبدولعەزیزە دەفەرموێت: " لە دەروونمدا عەودالّییەک هەیە، هەرشتێکم بدرێتی عەودالّی لەو گەورەتر دەبێت: ئاواتم پێشەوایی بوو، کە پێم بەخشرا عەودالّی جێنشینی بوو، کە پێی گەیشتم عەودالّی بەهەشت بوو"

ئەمە ئەوەیە هەموو دەروونێک داوای دەکات؛ داوای گەڕانەوە بۆ یەکەم شوێنی دەکات، ئەمە ئەو هەستە شاراوەیە کە بەردەوام هەستی پێدەکەیت و بیری دەکەیت. ئەو بۆشاییە سامناکەیە ئەگەر دەستی نەکەوێت.

ئایا لەم ئامانجە نزیک بوومەتەوە دوای ئەوەی لەسەر ڕێگای تەمەن پەنجا و دووساڵ ڕێمکردووە؟
داخی گرانم! زۆربەی تەمەنم ڕۆیی و کاری باشم هەڵنەگرتووە، وا سەفەر نزیک بۆتەوە و توێشووم نییە و ئامادەکارییم نەکردووە، دوورینەوە نزیک بۆتەوە و نە کێڵاومە و نە تۆووم کردووە، بیسەری ئامۆژگاری بووم و بینەری پەندەکان بووم نە ئامۆژگاریم وەرگرت

نە پەند فێربووم، کاتی تەوبە هات دوامخست و ئەمڕۆ و سبەینێم پێی کرد.

پەروەردگارا لەوشتانەم خۆشبیت ئاشکرام کردووە و لەوەشی پەنهانم کردووە، کێ لە گوناه خۆشدەبێت جگە لە تۆ.

پەروەردگارا داپۆشەرم بە لەوەی تێپەڕیووە و لەوەشی کە دێت، لە ڕۆژی پەسڵاندا ئابڕووم مەبە.
ڕەحمەتی خودا لەو خوێنەرەش بێت کە دەڵێت: آمـین.





# پێرست

